

خاوەنی ئیمتیاز



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم



گرافیك دیزاینر ئارام عەلی

سەرنووسەر هیوا قادر

سالّی دووەم

ژمارە

5

adabiserdam@yahoo.se

# 100 ساڵ ئەلبێر کامو

ئەگەر ئەلبێرت کامۆ ئەمڕۆ بژیایە ئەوا **100** ساڵی پڕ ئەکردەوە، بەڵام ئەو لە ڕوداوێکی ئۆتۆمبیلدا لە ساڵی **1960** لە تەمەنی **46** ساڵیدا تیاچووە. سێ ساڵ پێش مردنی خەڵاتی نۆبڵی بەدەست هێنا، ئەو خەڵاتە لەو کاتەدا ئەوی کرد بە گەنجترین نووسەرێك کە ئەو خەڵاتەی پێ بەخشرابێت.

پرسیارەکە ئەوەیە ئایە ئەلبێرت کامۆ لەئەمڕۆدا هێندە ئەهێنێت کاتی خۆتی بدەیتێ و بیخوێنیتەوە؟ ئایە ئەلبێرت کامۆ یەکێکە لەو نووسەرانەی کە ئەبێت فەرامۆشنەکرێت و بخوێنرێتەوە؟

بۆ ئەوەی زیاتر کامۆ بناسین، ئەو وەك هەر ڕۆشنبیرێکی سەردەمی خۆی نووسیویەتی، سەرقاڵی شانۆ بووە، وەك خاوەنی دەزگای بڵاوکردنەوە کاری کردووە، ڕۆژنامەنووس و ڕیخنەگر بووە و زۆر سەفەری کردووە. لە سەردەمی لاوێتیدا توشی نەخۆشی سیل بووە و بەو هۆیەوە وازی لە یاریکردنی فۆتبۆڵێن هێناوە، هەروەها سەرقاڵی سیاسەتیش بووە.

ساڵی **1942** بۆ کامۆ ساڵی ناساندنی بوو، تەمەنی نزیکەی سی ساڵ بوو کە ڕۆمانی "نامۆ"ی بڵاوکردەوە لەگەڵ ئەو پەخشانە فەلسەفییەی "ئەفسانەی سیزیڤ". یەکەم دێڕی ڕۆمانەکەی وا دەست پێ ئەکات: "دایکم ئەمڕۆ مرد، ڕەنگە دوێنێش مردبێت، نازانم". ئەم دیڕە یەکێکە لەو دێڕە ناسراوانەی ناو ئەدەبی هەزار و نۆسەدەکان.

ئەم مەلەفەی ئەدەبی سەردەم بەشێکە لە کۆی ئەو ئاوڕدانەوە گرنگەی کە لە یادی سەد ساڵەیدا لە هەموو جیهاندا لەم نووسەرە درایەوە.



# وتەی
# ئەلبێر کامو
# لە کاتی
# وەرگرتنی
# خەڵاتی نۆبڵدا

**و. لە فەرەنسییەوە: بەیان سەلمان**

ئەم گوتارە بە پێی نەریتی وەرگرتنی خەڵاتی نۆبل، ئەلبێر کامو لە هۆڵی شارەوانی شاری ستۆکهۆڵم لە 10 کانونی یەکەمی 1957 پێشکەشی کرد. لە نامیلکەیەکدا ئەم گوتارە و گوتارێکی تر لە ژێر ناونیشانی گوتاری سوێد لەلایەن خانەی چاپەمەنی گالیمار چاپکراوە.

دەقی گوتارەکە:

بە وەرگرتنی ئەم خەڵاتە کە ئاکادیمیە ئازادەکەتان ویستی ڕێزم لێ بگرێت، پێزانینم لەوە قوڵتر بوو کاتێ لێکمدایەوە کە تاچ ڕادەیەك ئەم ڕێزلێنانە لە سەروی چاوەڕوانی تایبەتی من بوو. هەموو مرۆڤێك، هەموو هونەرمەندێك تەواو لەسەر هەقە کە خواستی پێناسینەوەی هەبێت. منیش ئەو خواستەم هەیە؛ بەڵام بۆم نەدەکرا ئەو بڕیارەی ئێوە بزانم و نەکەومە بەراوردکردنی ئەنجامەکەی لەگەڵ بوونی راستیم. چۆن پیاوێك، بڕێك گەنجە، تەنها بە گومانەکانی و بە کارێك دەوڵەمەندە کە هێشتا لە ئارادایە، لەگەڵ تەنهایی کارکردن و خانەنیشینی هاوڕێیەتیدا ڕاهاتوە، ترسێکی وەها داینەگرێت کە لە پڕا بە تەنیا دەوەستێ، خۆی و خۆیەتی، لە ژێر ڕووناکییەکی زەقدا؟ بە چ دڵێکەوە ئەو ڕێزلێنانە وەرگرێ لە کاتێکدا لە ئەوروپا نووسەری هەرە گەورە هەن دەنگیان خەفەکراوە، لە هەمانکاتدا خاکیشیان بەردەوام بەرەوڕووی بەدبەختی دەبێتەوە.

ناسەقامگیریی و دڵەڕاوکەی ناوەوەم چێژتوە. بۆ دۆزینەوەی ئاشتیش، دەبوو بە گشتی خۆم لەگەڵ چارەنووسێکی وەها سەخیدا بگونجێنم. لەبەر ئەوەی کە نەشمتوانی تەنها بە پشت بەستن بە شایستەیی خۆم بیگەمێ، لە ژیانیشمدا هیچی تریشم نەدۆزیەوە کە لە بارو دۆخی هەرە دژواردا یارمەتیم بدات جگە لە: بیرۆکەی ئەوەی خۆم لە هونەرەکەم دروستکەم و ڕۆڵی نووسەر ببینم. بوارم بدەن، هەروەها لە ڕوانگەی هەستی پێزانینم و هاوڕێیەتیم، تەنها بە سادەیی پێتان بڵێم کە ئەو بیرۆکەیە چییە. وەك خۆم ناتوانم بێ هونەرەکەم بژیم، بەڵام هیچ کاتێك ئەو هونەرەم لە پێش هەموو شتێکەوە دانەناوە، بە پێچەوانەوە، ئەگەر پێویست بکات لەکەسی جودا ناکەمەوە و بوارمبدات بەو شێوەیەی خۆم دەمەوێ لە هەمان پلەدا بژیم. هونەر لە ڕوانگەی من بریتی نییە لە خۆشییەکی تەنیایی، بەڵکو ئامرازێکی بزوێنەری گەورەترین ژمارەی مرۆڤە کە بە نێوەندیەوە وێنەیەکی تایبەتی ئازار و خۆشی هاوبەشیان پێشکەش بکەی. واتە، هونەرمەند ناچار دەکات کە خۆی دوور نەگرێ؛ وابەستەی هەقیقەتێکی زۆر سادە و جیهانیی دەکات. ئەوەشی کە چارەنووسی خۆی وەك هونەرمەندێك هەڵبژارد لەبەر ئەوەی هەستیکرد جیاوازە، زوو تێدەگات کە ناتوانێ بژێوی هونەرەکەی دابینکات و بەوە جیاوازی بکات بەبێ ئەوەی ددان بەوەدا نەنێت کە تەواو بەوان دەچێت. هونەرمەند لەو



هاتووچۆ بەردەوامەدا لە خۆیەوە بۆ ئەوانی دی خۆی دروستدەکات، لە نێوەندی ڕێی جوانیدایە کە ناتوانێ دەستی لێ هەڵگرێت و لە نێو کۆمەڵێکدایە کە ناتوانێت ڕیشەی خۆی لێ هەڵکێشێت. بۆیە هونەرمەندی ڕەسەن قێز لە هیچ ناکاتەوە، خۆی ناچار دەکات تێبگات لەبری ئەوەی حوکم بدات. ئەگەر بەشیان لەم جیهانەدا هەبێ ئەوە تەنها کۆمەڵێکە کە بە پێی وتەیەکی گەورەی نیتشە، چیدی حاکم سەروەر نابێ، بەڵکو داهێنەر، ئیدی چ کاربکات یاخود ڕووناکبیر بێت. هەمان شت ڕۆڵی نووسەر لە ئەرکە قورسەکان جودا ناکرێتەوە. بەو پێیەش ناتوانێ لە خزمەت ئەوانەدا بێت کە مێژوو دروست دەکەن، بەڵکو لە خزمەت ئەوانەیە کە ئازاری مێژوو دەچێژن. یاخود ئەوەتا تەنیایە و لە هونەرەکەی بێ بەش دەکرێ. هەموو سوپای ستەمکار، بە ملێۆنەها پیاوەوە ناتوانن لە تەنیایی دەریکەن، ئەگەر بە تایبەتی بە شوێن پێی ئەواندا بڕوات. بەڵام بێدەنگی زیندانێکی شاراوە کە لە جێیەکی تری دونیا جێهێڵدراوە بۆ ڕەفتاری پڕ شوورەیی بەسە بۆ ئەوەی نووسەر لە تاراوگەوە دەرهێنێ. هەر جارە، بەلانی کەمەوە، لە گەرمەی دەسکەوتەکانی ئەو ئازادییە ئەو بێدەنگییەی لەبیر نەچێت و بە نێوەندی هونەرەوە دەنگداتەوە.



هیچ کام لە ئێمە بایی بانگهیشەیەکی وەها ئەوەندە گەورە نییە، بەڵام لە هەموو دۆخێکی ژیانیدا، چ نەناسراو بێت و چ بە شێوەیەکی کاتیی ناودار بێت، فڕێدرابێتە نێو ئاگری ستەمکاران، یاخود بۆ ماوەیەك ئازاد بێت لە دەربڕینیدا، گرنگ ئەوەیە کە نووسەر دەتوانێ هەستی بۆ کۆمەڵێکی زیندو بدۆزێتەوە کە مایەی بوونیەتی، بە مەرجێك کە چەندە دەتوانێ بە هەردوو ئەو دۆخە ڕازی بێت کە گەورەیی کارەکەی دەسەلمێنێ: خزمەتی هەردوو ڕاستی و ئازادیی بکات. چونکو بانگهێشەی ئەو بریتیە لە کۆکردنەوەی گەورەترین ژمارەی مرۆڤ، هەرگیز ناشتوانێ پشت بە درۆ و وابەستەیی ببەستێت کە هەرچ کاتێ بەرپا بوون ئەوە تەنیاییش بەرپا دەبێت. وێڕای خاڵی لاوازیی لە کەسایەتیمان، گەورەیی پیشەکەمان هەمیشە لە دوو کردەوەی قورسدا

ڕەگی خۆی دادەکوتێ: درۆ نەکەین سەبارەت بە هەرچ شتێکی ڕاست کە دەیزانین و بەرەنگاری داپڵۆسین ببینەوە.
زیاد لە بیست ساڵی مێژوویەکی پڕ شێتی، بێ یارمەتی ون ببووم، وەك هەموو ئەو پیاوانەی لە تەمەنی مندا بوون، لە توندو تیژیی کاتێکدا نوقم بووین، تێدا هەستێکی نارەوان بەسەرمدا زاڵ بوو کە نووسین شەرەفێکە، چونکو ناچارت دەکات، ناچاری ئەوەی کە تەنها سەرقاڵی نووسین نەبیت. بەتایبەتی ناچاری کردم کە خۆم چۆنم و بە پێی توانام هەرچی نەهامەتی و هیوای هاوبەشە لەگەڵ هەموو ئەوانەی هەمان مێژوو بەیەکەوە دەیبەستینەوە بگرمە ئەستۆم. ئەو پیاوانە لە سەرەتای شەڕی جیهانی یەکەم لەدایك بوون، تەمەنیان بیست ساڵان بوو، لە هەمان کاتی دەسەڵاتی نازییەکان و یەکەم دادگاییەکانی شوڕش بوو، هەر ئەوانەش بوون کە بەرەنگاری ئەوە دەبوونەوە خوێندنیان تەواو بکەن، ئەوانە بوون لە کاتی شەڕی ئیسپانیا، لە شەڕی جیهانی دووهەم، لە ئۆردوگا زۆرە ملێیەکان، لە ئەورووپای ئەشکەنجەدەر و زیندان، ئەمڕۆ دەبێ کوڕەکانیان و بەرهەمەکانیان لە جیهانێکدا گەورە بکەن کە هەڕەشەی ئەتۆمیی بەسەرەوەیە. پێم وابێ کەس ناتوانێ داوایان لێ بکات گەشبین بن.
من تەنانەت لەگەڵ ئەوەشدام کە دەبێ لەوە تێبگەین بەردەوام بەرەنگاریی هەڵەکانیان ببینەوە، هەڵەی ئەوەی ڕێژەی بێهیواییان زیادکرد، بانگهێشەی مافی بێشەرەفییان دەکرد و بەرەوپیریی نیهلیزمی ئەو سەردەمە دەچوون. بەڵام ئەوەی دەمێنێتەوە کە زۆربەمان لە




وڵاتەکەم و لە ئەورووپا ڕەتی ئەو نیهلیزمەیان کردەوە و خۆشیان تەرخان کرد تا بە دوای هەقدا بگەڕێن. وایانکرد هونەری چۆنێتی ژیان بۆخۆیان دابهێنن لە سەردەمی کارەساتدا، بۆ ئەوەی جارێکی دی لەدایك ببنەوە و ئەوجا بە ئاشکرا دژ بە غەریزەی مردن لە کاریی مێژووماندا تێبکوشن. بێگومان هەموو نەوەیەك بڕوای وایە کە بەوە مەحکومە دیسان دونیا دروست بکاتەوە. نەوەکەی من دەزانێ کە دروستی ناکاتەوە، بەڵام لەوانەیە ئەرکیشی گەورەتر بێت. ئەو ئەرکەی بریتیە لەوەی نەهێڵێ جیهان لەیەك بترازێت. ئەو نەوەیە میراتگری مێژوویەکی گەندەڵە کە تێکەڵەیەکە لە شۆڕشی سەرنەکەوتوو، تەکنەلۆجیایەك بەرەو شێتی دەچێت، خوای مردوو و ئایدیۆلۆژیای بەسەرچوو کە دەسەڵاتە بێ



نموودەکان دەتوانن ئەمڕۆ هەموو شتێك وێران بکەن، وەلێ چیتر ناتوانن قەناعەتت پێ بکەن، زیرەکیش دابەزیوەتە ئەو ئاستەی لە خزمەتی ڕق و داپڵۆسیندا بێت، ئەو نەوەیە دەبوو تەنها لە ڕوانگەی ڕەتکردنەوەکانیدا لە خودی خۆیدا و بە دەوری خۆیدا کەمێك لە شکۆیی بۆ واتای ژیان و مردن بگەڕێنێتەوە. لەبەردەم جیهانێکە هەڕەشەی ناگونجانی لەسەرە، کە تێدا دادوەرە هەرە گەورەکان مەترسی ئەوەیان هەیە کە بۆ هەمیشە مەملەکەتی مردن سەقامگیرکەن. ئەو نەوەیە دەزانێ کە بە پێچەوانەی ڕەوتی سەعات دەبێ لە پێشبڕکێیەکی کوشندەدا ئاشتی لە نێوان میللەتاندا بگەڕێنێتەوە، ئاشتییەك کە لەسەر بنەمای بەندایەتی دانەمەزرابێ، ڕێککەوتنێك بێت لە نێوان کار و کلتووردا و لەگەڵ هەموو مرۆڤدا کۆڵەگەیەکی پتەو لە هاوپەیمانی دروستبکەنەوە. هیچ کات دڵنیا نییە کە ئەو ئەرکە گەورەیە جێبەجێ دەکات، بەڵام پێش وەخت مایەی دڵنیاییە کە لە هەموو شوێنێکی دونیا جڵەوی هەردوو گرەوی ڕاستی و ئازادی لە دەستیدایە، بەو بۆنەیەشەوە دەزانێ بێ قین لە پێناو ئەوەدا بمرێ. ئەوە کە لە هەموو جێیەکدا شایەن بە ستایش و پشتگیرییە، بە تایبەتی لەوێدا کە خۆی دەکاتە قوربانیی. لە هەموو حاڵێکیشدا ئەم ستایشە بۆ ئەوە کە پاش رازیبونتان، دەخوازم بە گەرمیی ئاماژە بەو ڕێزلێنانە بکەم کە لەمنتان گرتوە. لە هەمان کاتدا، پاش ئەوەی باسی شکۆی پیشەی نووسینم کرد، دەبێ نوسەر بگەڕێنمەوە جێی ڕاستی خۆی، هیچ ناونیشانێکی تری نەبێ جگەلەوەی کە لەگەڵ هاوڕێیانیدا هاوبەشی ڕێگای خەبات دەکات، بێدەسەڵاتە وەلێ کەللە ڕەقە، ناعادلە بەڵام خولیای دادپەروەریی هەیە، بەرهەمەکەی بێ شەرم و بێ خۆبەزلزانین بەبەرچاوی هەمووانەوە دروست دەکات، هەمیشە لە نێوان ئازار و جوانیدا دابەش بووە، دواجار بەڵینی داوە کە لە دوو فاقەی بوونیدا داهێنانەکانی هەڵچنێ کە بێ وچان هەوڵیداوە لە ناو جووڵەی ڕوخێنەری مێژوودا دروستیان بکات. کێ لە پاش ئەمە چاوەڕوانە چارەسەری زۆر تەواوی لەلا بێت و ڕەوشتی جوان بنوێنێ؟ هەقیقەت پڕە لە پەنهانی، لە نێو دەستدا نییە، هەمیشەش دەبێ بەدوای بکەویت. ئازادیش ترسناکە، ژیان تێدا زیاتر سەختە لەوەی سەرسامکەربێت. دەبێ بەرەو ئەو دوو ئامانجە بڕۆین، ئەگەرچی ئازاردەرە، وەلێ سەقامگیرە، لە ڕێگایەکی دوور و درێژدا پێش وەخت شکستیەکانمانی دەستنیشان کردوە. چ نووسەرێك



ئەدەبی بەردەم

لەمەودوا بە ویژدانێکی زیندو بە دەنگی بەرز بانگهێشەی پاکی و بێگەردی دەکات؟ هەرچی پابەندیشە بە منەوە، دەبێ جارێکی تریش بڵێم کە لە ناو هەموو ئەوەدا من هیچ نیم. من هەرگیز نەمتوانیوە دەستبەرداری ڕووناکیی و شادیی بوون ببم، نە دەستبەرداری ژیانێکی ئازاد ببم کە تێدا پەروەردە بووم. ئەگەرچی ئەو حەنینە بەشێکی زۆر لە هەڵەکانم و خراپەکانم دەستنیشان دەکات، بەڵام یارمەتیشیدام چاکتر لە پیشەکەم تێبگەم، هێشتاش یارمەتیم دەدات کە کوێرانە خۆ ڕاگربم، لە پاڵ هەموو ئەو مرۆڤە بێدەنگانەی دونیا کە بەرگەی ژیانێك ناگرن کە تەنها بە یادەوەریی سەپێندراوەتە سەریان یاخود بگەڕێنەوە بۆ شادییەکی کەم و کورت.

دواجار دێمەوە ئاست خۆم، بۆ ڕاستی بوونم، کە سنووردارم، قەرزاربارم، لە چەشنی زەحمەتی ئیمانم، بۆ ئەوەی کۆتاییشی پێ بهێنم هەست دەکەم ئازادترم کە پێتان بڵێم چەندە ئەو بڕیاری دەستنیشان کردنەم لەلایەن ئێوە پڕە لە کرانەوە و سەخێتی، ئازادتریشم کە هەروەها پێتان بڵێم دەمەوێ وەریبگرم وەك ڕێزلێنانێك بۆ هەموو ئەوانەی هاوەبەشی هەمان تێکۆشانن و هیچ دەستکەوتێکیان وەدەست نەهێناوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە تەنها ناخۆشیی و داپڵۆسینیان تووش بووە.

دەمێنێتەوە ئەوەی لە کانگای دڵمەوە سوپاستان بکەم، ببمە شایەدێکی شەخسی ئاشکرا بۆ پێزانینم، لێرەشدا ئەمە هەمان بەڵێنی دێرینی هەر هونەرمەندێکی ڕاستەقینەی دڵسۆزە کە هەموو ڕۆژێك لەگەڵ خۆیدا بە نهێنی بەڵین بە خۆی دەدات.



سەرچاوە:

« Discours de Suède » Albert Camus

# چی لە ئەلبێر کامۆ بکەین؟

مەریوانوریا قانع



**سەرەتا**

بۆ ئەو نەوەیەی لە ساڵانی شەستی سەدەی بیستەمدا لە کوردستانی باشوردا لەدایکبوون و لە هەفتاکاندا خوێندنەوەی کتێب بوو بەیەکێك لەخولیا سەرەکییەکانیان، کۆمەڵێك ناوو ڕێبازی فیکریی هەبوون کە هیچ خوێنەرێکی ڕاستەقینە نەیدەتوانی بازیان بەسەردا بدات. گەنجانی ئەو ڕۆژگارە، کە لە قۆناغی ناوەندییەوە دەستیان بەخوێندنەوە دەکرد، ڕاستەوخۆ دەکەوتنە ناو باوەشی مارکسیزمەوە، ناو لقە جیاوازەکانی مارکسیزمەوە، لە لینین و ماو تسی تونگ و هۆشی منەوە بیگرە، بۆ مارکسییە عەرەب و فارسەکان، بە تێپەڕین بەناو مارکسیزمی هێربەرت مارکۆزەو فرانز فانۆن و ڕۆجێ گارودی و ڕۆجێس دۆبرێ

دا. سەرەڕای جیاوازیی گەورەی نێوان ئەم نووسەرانە، مارکسیزم نەک تەنها قوتابخانەی باڵادەستبوو، بەڵکو هەموو شتێکی دەرەوەی مارکسیزم، وەک فیکری هەڵەو ڕوانینی هەڵە دەنرخێنران و بەشایستەی خوێندنەوە نەدەزانران. بەڵام خۆشحاڵانە کایەی فیکر و ڕۆشنبیریی ساڵانی شەست و هەفتاکان تەنها کایەی ئامادەگی مارکسیزم نەبوو، لەدەرەوەی مارکسیزمدا دوو ڕێبازی تریش هەبوون کە خوێنەر دەیتوانی شتگەلێکیان لێوە فێرببێت جیاواز لەوەی مارکسیزم فێریدەکردن. ئەو دوو ڕێبازەش بریتیبوون لە فرۆیدیەت و بوونگەرایی. نەوەی ئێمە لە ڕێگای وەرگێڕانەکانی جۆرج تەرابیشییەوە بە فرۆیدیەت ئاشنابوو، بوونگەرایی، وجودیەت، کە پاڵەوانە سەرەکییەکانی لەناو ڕۆشنبیریی عەرەبیدا جان پۆل سارتەر و ئەلبێر کامۆ و کۆڵنوڵسن بوون، زیاد لە نووسەر و خوێندەوارێکی عەرەبی ئەو ڕۆژگارەی سەرقاڵکردبوو. بەم جۆرە وێنە ڕۆشنبیریی و کولتورییەکەی ساڵانی شەست و هەفتاکان، بۆ ئێمە کە زمانی عەرەبی زمانی سەرەکی خوێندنەوەمان بوو، بریتی بوو لە باڵادەستی مارکسیزم، ئینجا دوای ئەوان ئامادەگی فرۆیدیەت و بوونگەرایی. ئەلبێر کامۆ یەکێك بوو لەو نووسەرانەی کە سەر بە ڕێبازی بونگەرایی بوو.




یەکەمین کتێبێکی ئەلبێر کامۆ کە من خوێندبێتەمەوە ڕۆمانی “غەریب” یان “نامۆ” بوو، دوای ئەویش ڕۆمانی “تاعون”و ئینجا شانۆگەریی “کالیگۆلا”و دوای ئەویش “ئەفسانەی سیزێف”و لەکۆتایشدا کتێبی “مرۆڤی یاخیی”. ئەمانە هەموو کتێبەکانی ئەلبێر کامۆ نەبوون کە بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕدرابوون، بەڵام کتێبە سەرەکیی و بەناوبانگەکانی بوون. بۆ من مەسافەیەکی درێژ لەنێوان خوێندنەوەی ڕۆمانی “غەریب” و خوێندنەوەی کتێبەکانی تری کامۆدا هەبوو. یەکەمجار کە ڕۆمانی “غەریب”م خوێندەوە حەزم بۆ ئەدەبیاتی ئەم پیاوە نەما، ڕۆمانەکە جگە لەوەی کەم ڕووداوو سست و وەڕسکەربوو، پاڵەوانەکەشی لەو جۆرە کەسانە نەبوو کە من حەز بە ناسینیان بکەم و نموونەشی لەو ژینگە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەدا نەبوو کە من وەك گەنجێك تیایدا دەژیام و بیرم لە کێشە و گرفت و تەحەداکانی دەکردەوە. سەرەتای هەشتاکان، کە ساڵانی گەنجێتی نەوەی منە، گەرمەی



شۆڕشی چەکداریی کوردستان و ڕۆژەکانی دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێرانی ساڵی ١٩٧٩و سەرەتای سەرکەوتنەکانی شۆڕشی نیکاراگوا و گەرمەی شۆڕشی فەلەستین و ساتەوەختی کوشتنی سەرۆکی میسری ئەنوەر سادات و شەڕی دژ بەسۆڤیەت بوو لەئەفگانستاندا، هتد.... لەم "ژینگە شۆڕشگێڕ"ەدا زەحمەتبوو نووسەرێکی وەك ئەلبێر کامۆ، تەنانەت کەسێکی وەك سارتەریش، شوێنی شیاوی خۆیان لای گەنجانی وەك ئێمە بکەنەوە. هەر لەو سەردەمەدا هەندێك لە کتێبەکانی سارتەریشم خوێندەوە، بەڵام جگە لە فەرامۆشکردنی بیروبۆچوونەکانی و لەزۆر سەریشەوە لێتێنەگەیشتنیان، چارەنووسێکی تریان نەبوو. مارکسیزم، یان وردتر بدوێم لێنینیزم، یان تێکەڵکردنی مارکسیزم و فرۆیدیەت وەك لای هێربێرت مارکۆزە، ئەو ڕێبازە فیکرییە بوو کە هەم لەگەڵ ئەو ژینگە شۆڕشگێڕە باڵادەستە و هەم لەگەڵ تەمەنی ئێمەدا، وەك گەنجانێك کە خەونی گەورەیان هەبوو بۆ گۆڕینی دونیاو سەرلەنوێ داڕشتنەوەی، دەگونجا.

بەڵام ئەم شوێننەکردنەوە و فەرامۆشکردنەی ئەلبێر کامۆو سارتەر زۆری نەخایاندو لە پڕێکدا ژینگە شۆڕشگێڕییەکەی ناوچەکە بەشێوەیەکی ڕیشەیی گۆڕاو دۆخێك دروستبوو تیایدا ئەلبێر کامۆو سارتەر زیاتر وەك "فریادڕەسێك"ی فیکریی و تیوریی دەرکەوتن تا نووسەرێکی ئاسایی. وێرانبوونی شۆڕشی ئێرانی لەڕێگای زاڵبوونی خومەینیزم بەسەر سەرجەم هێز و دەرکەوتە جیاوازەکانی شۆڕشەکەدا، ساڵە درێژ و خوێناوییەکانی جەنگی ئێران و عێراق، گۆڕانی سیستمە سیاسییەکەی سەدام حوسەین بۆ سیستمێکی تۆتالیتاری هاروهاج، تێکشکانی شۆڕشی فەلەستینی و ڕاونانی چەکدارەکانیان لە بەیروتەوە بۆ تونس، کێشە گەورەکانی خەباتی چەکداریی لە کوردستاندا و گەیشتن بە کارەساتی ئەنفال، دروستبوونی موجاهیدە ڕیشدارەکانی ئەفگانستان و درێژکراوە ترسناکەکانیان لەناوچەکەدا، ڕوخانی دیواری بەرلین و کەوتنی کۆمۆنیزم، هەموو ئەمانە دۆخێکیان دروستکرد تەواو دژ بە ژینگە شۆڕشگێڕییەکەی ساڵانی پێشتر. خوێندنەوەی کامۆ لەم ژینگە نوێیەدا مانایەکی نوێی هەبوو، تێگەیشتنێکی نوێی بە ئێمە ئەداو ڕۆڵی پەناگایەکی دەرونی و فیکریی گەورەی دەبینی بۆ بەخشینی مانا بەو دونیایەی لەپڕێکدا لەبەر چاوماندا وێرانبوو. کامۆ بەشێك بوو لەو ڕوانینە ڕەخنەییەی لەو ڕۆژگارەدا لای ئێمە بۆ شۆڕش دروستبوو.

## لە نێوان لینین و کامۆدا

ئەگەر لینینیزم ئایدیۆلۆژیای شۆڕش و درووستبوونی مرۆڤی شۆڕشگێڕ بێت، پرۆژەی دەستنیشانکردنی نەخشە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی ئەو دونیایەبێت کە دەبێت لەگەڵیدا بجەنگین، فیکرێك بێت "باش" لە "خراپ"و "شۆڕشگێڕ" لە "ناشۆڕشگێڕ"و "شۆڕش" لە "دژەشۆڕش" جیابکاتەوە، ئەوا نووسینەکانی ئەلبێر کامۆ دەنگ و سەدای مرۆڤی دوای شۆڕشەکان و دوای خەبات و دوای قۆناغی ناسینی "دوژمنە چینایەتی"یەکان بوو. کامۆ باسی مرۆڤی بێزار و تێکشکاوی ناو ئەو دونیایەی دەکرد کە دوای شۆڕشەکان دروستدەبێت، باسی ناشیرینییەکانی دونیای دوای خەونە شۆڕشگێڕییەکان و دوای مەبەستە گەورەکان و دوای خواستە مەزنەکان دەکرد. لینین بە ئێمەی دەگوت چۆن دونیا لەڕێگای کردەی شۆڕشگێڕییەوە بگۆڕین؟ کێن دوژمنەکان و دۆستەکانمان کامانەن؟ بەڵام کامۆ ئەو ئازارە ناوکیی و دڵەڕاوکێ ئەخلاقیی و نائومێدییە وجودییانەی نیشانئەداین کە دوای یان پێش یان لە کاتی سەرکەوتنی شۆڕشەکاندا لەناو مرۆڤدا دروستدەبن. لینین باسی "مرۆڤی شۆڕشگێڕ"و کامۆ باسی "مرۆڤی ناماقوڵ"و "هیچگەرا"ی دەکرد، لینین ئایدیۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕانەی بۆ بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە دادەهێنا، لێرەوە قسە بەناوبانگەکەی "هیچ بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕیی بەبێ ئایدیۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕ بوونی نییە"، لەکاتێکدا کامۆ باسی ئەو بەها ئەخلاقییانە دەکرد کە مرۆڤ پێویستە خاوەنیانبێت بۆئەوەی بتوانێت وەك مرۆڤ بژی. لای لینین تیورەی سیاسی باڵادەستە، لای کامۆ ڕوانینی ئەخلاقیی بۆ دونیا. لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ڕەخنەکردنی کامۆ بوو بۆ "شۆڕش" بەگشتی و بۆ ڕۆڵی توندوتیژیی لەژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بەتایبەتی. ئەگەر مارکس توندوتیژیی وەك "مامانی مێژوو" ناسیبێت و پێیوابووبێت هیچ گۆڕانێکی گرنگ و ڕاستەقینە لە مێژوودا بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژیی ڕوونادات، ئەوا کامۆ ئەوەی نیشانئەداین کە هیچ تاوانێکی گەورەی ناو مێژووی مرۆڤایەتی و هیچ شێوەیەك لە شێوە هەرە ترسناکەکانی بەربەریەت، بەبێ توندوتیژیی و بەبێ فیکرێك کە توندوتیژیی بەرز بنرخێنێت دروستنابێت. ڕەخنەی کامۆ لە دونیا زیاتر





ڕەخنەیەکی ئەخلاقیی و کەمتر ڕەخنەیەکی سیاسیی و کۆمەڵایەتییە، بەڵام ڕەخنەیەکی گرنگە چونکە تواناکانی سیاسەت لە ڕووتبوونەوە لە ئەخلاق و دروستبوونی شێوازێك لە دەسەڵاتداری کە لەهەوڵی دیسپلینکردنی تەواوەتی ژیانی مرۆڤ و پرۆگرامکردنی ناوەکی تاکەکەسەکاندایە، پێویستی بە دروستبوونی چەندەها خاڵی بەگریی و چاودێریکردن و سنووردارکردنی تەکنیکەکانی دەسەڵات هەیە. ئەخلاق یەکێکە لەو ڕووبەرە ئینسانی و کۆمەڵایەتییانەی دەکرێت ئەم کردەی ڕەخنەکردن و بەرگرییەی تێدا ئەنجامبدرێت. لەمەش بترازێت فیکریی کامۆ هەنگاوێکی گرنگ بوو بەڕووی ئاگاداربوونەوە لە مەترسییە گەورەکانی ناو دونیای مۆدێرن و تواناکانی شارستانیەت و فیکری مۆدێرن لەوێرانکردنی مرۆڤدا.

ئەوەی بۆ من لە نووسینەکانی کامۆدا گرنگ بوو، ڕوانینە فەلسەفییە گشتییەکەی نەبوو، تێزەکانی سەبارەت بە هیچگەرایی و ناماقوڵ نەبوو، بەڵکو ئەوەبوو کە ڕەخنەکردنی ئەو بۆ شۆڕش و بۆ نموونە باڵاکان هاوشان نەبوو بە لەدەستدانی ڕۆحی یاخیبوون و باوەڕنەمان بەتوانای مرۆڤ لەسەر کارکردن لەسەر دونیا و هەوڵدانی بەردەوام بۆ گۆڕین و دەسکاریکردنی ئەو دونیایە. ئەمە جگە لە دەستبەردارنەبوون لەوەی کە مرۆڤ کەسایەتی خۆی وەك تاکەکەس لە فۆرمی مرۆڤێکی یاخیبوودا دروستبکات و دابڕێژێت. لەزۆر ڕووەوە ڕەخنەی کامۆ لە شۆڕش و لە توندوتیژیی وەك ئامرازی سەرەکی بۆ گۆڕان، نیشاندانی ئاسۆیەکی نوێ بوو بۆ ڕوانین و نرخاندنی دیکە، لانیکەم بۆ ڕوانینی خود بۆ خۆی و بۆ نرخاندنی خود بۆ دونیا ئەخلاقیی و ڕەمزیی ناوەکییەکانی خۆی و ئەوەشی لە کۆمەڵگادا دروستدەکرێت. ئەگەر لینین چاوی ئێمەی لەسەر ئەو ڕاهێنابێت کە سەیری دونیا دەکەین ناشیرینییەکانی ببینین و دەستنیشانبکەین بە نیازی دەسکاریکردن و گۆڕینیان، ئەوا کامۆ ناچاریکردین سەیری خۆمان بکەین و بۆشاییە ناوەکییەکان و وەسوەسە ئەخلاقییەکان و بەدحاڵیبوونە تاکەکەسییەکانی خۆمان ببینین، ئەو بەهایانە بپشکنین کە باوڕمان پێیانە بۆ ئەوەی بەو شێوەیە دایانبڕێژینەوە کەوامان لێبکەن نە ببین بە مرۆڤێکی تەسلیم بووو بێئیرادە، نە بە مرۆڤێکی تاوانبار و خوێناوی. یاخیبوون بەبێ شۆڕش و شۆڕشگێڕبوون بەبێ توندوتیژیی و توندوتیژبوون بەبێ خوێن، ئەمە ئەو وانەیە بوو کە لە کۆتاییەکانی ساڵانی هەشتادا دەمانتوانی لە کامۆوە فێرببین.

کامۆ باسی کۆمەڵگا و دەوڵەت و ژیانی پێکەوەیی و پرۆژە دەستەجەمعییەکانی بۆ ئێمە نەدەکرد، کامۆ باسی تاکەکەس و پەیوەندیی تاکەکەسی بە بوون و بە مردن و بە خود و بە ئەوانیترەوە بۆ دەکردین، هەموویان لەدەرەوەی پرۆژەیەکی کۆیی و دەستەجەمعیدا، بەڵام لەهەمانکاتدا لەدەرەوەی بەرهەمهێنانی ڕۆحێکی سازشکار و تەسلیمبوو و پەسیڤدا.

بەم مانایە ئەلبێر کامۆ و ێستگەیەکی گرنگ بوو لە تیمارکردنی برینە گەورەکانی ساڵانی هەشتای مێژووی ئێمە و مێژووی ناوچەکەدا، مەبەستم ساڵانی مردنی شۆڕشەکان و بەرپابوونی جەنگە گەورەکان و زەبەلاحبوونی هێزە ئیسلامییە توندڕەوەکانە. کامۆ ئەم نووسەرە بوو کە نکوڵی لە نائومێدبوونی مرۆڤ و ناماقوڵییەکانی ژیان نەدەکرد، تەفاسیلە وردەکانی نیشانئەداین و قوڵاییە ڕۆحییەکانی بەرجەستەدەکرد، بەڵام هاوکات حەزێکی گەورەشی بۆ ژیان و تێگەیشتنێکی قووڵیشی بۆ مرۆڤبوون لەناوماندا دەچاند.

ئەگەر علی شەریعەتی فارس کامۆی خوێندبێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت بەردەوام شۆڕشگێڕبێت، بۆئەوەی بتوانێت "شیعیزم" لە ئایدیۆلۆژیای تەسلیمبوونەوە بگۆڕێت بۆ "شیعیزمێکی سوور" و شۆڕشگێڕ، ئەوا جیاوازی ئێمە لەگەڵ شەریعەتیدا لەوەدابوو



کە ئێمە لەناو کەلاوەکانی شۆڕش و یاخیبوونەکانی ناوچەکەدا دەژیاین، نەك لە قۆناغی بەر لە شۆڕشدا. عەلی شەریعەتی کامۆی دەخوێندەوە بۆئەوەی بتوانێت شۆڕش مەیسەربکات، ئێمە کامۆمان دەخوێندەوە بۆئەوەی لە ناشیرینییەکانی شۆڕش تێبگەین. لە تێگەیشتنی ئەو ڕۆژگارەی مندا، ئەلبێر کامۆ نووسەرێك بوو گەرچی بەتوندی پێی لەسەرنائومێدیی و ناماقوڵییەکانی ژیان دادەگرت، بەڵام ئەم پێداگرت نەوزەی یاخیبوونی نەك لەناودا نەدەسڕینەوە، بەڵکو گەورەتر و قووڵتری دەکردەوە. "سیزێف"ی کامۆ ئەو پاڵەوانە بوو کە لەزۆر ڕووەوە لە ئێمە دەچوو، لە هەندێك لە پاڵەوانی ناو چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن دەچوو، هەروەها شتێکیشی لەگەڵ سوفیزمی مەحویدا هەبوو کە ئێمە لەو ساڵانەدا وردەوردە پێیئاشنا دەبووین و قووڵاییە ڕۆحییەکانیمان دەبینی. پێموایە دۆزینەوەی ئەلبێر کامۆ و مەحوی لەیەککاتدا لە هەشتاکاندا لە دۆزینەوە گرنگەکانی ناو ژیانی ڕۆشنبیریی ئێمە بوو.




لە ساڵانی هەشتادا ئێمەش وەك سیزێف بەردی مێژوویەکی سەخت و بریندارمان تل ئەدا، بەبێ ئەوەی بتوانین چ لە خودی بەردەکە یان لەو مێژووە ڕزگارمانبێێت کە بە تلدانی ئەو بەردە مەحکومی کردبووین. وەك سیزێف ژیانێکی بێمانا و ناماقوڵمان لەناو دونیای دوای وێرانەکانی ئەنفالدا بەسەردەبرد. ساڵانی نەوەد و دونیای سەردەمی ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕینیش کامۆی جارێکی تر خستە پەراوێزەوە، بەڵام ئەمڕۆ، زیاد لە بیست ساڵ دوای ڕاپەڕین، جارێکی تر کۆمەڵێك پرسیار دروستبوونەتەوە کە خوێندنەوەی کامۆ دەشێت هاریکارمانبێت بۆ وەڵامدانەوەیان. پرسیاری لەم جۆرانە: چۆن بەبێ باوەڕبوون بە یۆتۆپیایەکی فریادڕەس، بەبێ پلانی گەورە بۆ گۆڕینی دونیا، بەبێ ئەوەی تەسلیمی نائومێدیی و ڕەشبینییەکی خنکێنەربین، چۆن تەنانەت لە دۆخی تەنیاکەوتنی ڕادیکاڵیشدا، بتوانین یاخیگەربین؟ چۆن لە غیابی ئەو شتانەدا بتوانین بەو دونیایە بڵێین "نا" کە دروستکراوە؟ چۆن مرۆڤبوونی خۆمان وەك مرۆڤ بپارێزین و نەکەوینە ناو ئەو تۆڕە گەورانەی تاوانی فرە جۆرەوە لە دونیای ئێمەدا؟
ئەگەرچی من باوەڕم بەوە نییە کامۆ بتوانێت وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە بداتەوە، باوەڕیشم بە زۆرێك لەوەڵامەکانیشی نییە، بەڵام پێموایە دەتوانێت هاریکارمانبێت بۆ بینینێکی وردتر و تیژتری دونیا، دەتوانێت ساتێك بێت لە ساتە زۆر و درێژەکانی گەڕان بەدوای وەڵامدا، دەشێت هێمایەك بێت لەنێو هێما زۆرەکانی گەڕان بەدوای فیکریی دەرچوون لەم دۆخەدا. لانیکەم لەڕێگای ئەو بەرگیرییە سەرسەختەوە کە کامۆ لە ئەخلاقی بەرپرسیارێتی و لە ئینتیما بۆ مرۆڤبوونێکی یاخیی دەیکات.

## ئەلبێر کامۆو گرنگیی بینینی دونیاوەکو خۆی

ئەگەر بکرێت خاڵی هەرە سەرەکی لە فیکری کامۆدا بۆ یەك ڕستە کورتبکەمەوە دەکرێت بڵێم ئەو ڕستەیە ئەمەیە: "مرۆڤ پێویستە دونیا بە ڕوونی و بە ئاشکرایی، وەك خۆی و بەو شێوەیە ببینێت کە هەیە، نەك ئەوەی بە بڕێکی زۆر لە تەمتومانی وەهم و چاوەڕوانیی ناڕاست دابپۆشێت." بەڵام بینینی دونیا وەکو خۆی، بەو شێوەیەی کە هەیە و بە دابڕاوی

لەو وەهمانەی کە مرۆڤ وەك سەرپۆشێك بەسەریدا ئەدات، کارێکی ئاسان و بێدەرەنجام نییە، کارێك نییە کاریگەریی گەورە لەسەر ژیانی مرۆڤ بەجێنەهێڵێت. بینینی دونیا لە ڕووتێتی خۆیدا و دانەپۆشینی بە تۆڕێك لەوەهمی ئایدیۆلۆژیی و دینیی و پرنسیپی ئەخلاقیی، دۆخێکی ڕۆحیی بۆ مرۆڤ دروستدەکات، تەواو جیاواز لەو دۆخەی تیایدا دونیا لە ڕێگای وەهمی جۆربەجۆرەوە دەربکەوێت. بەباوڕی کامۆ بینینی دونیا وەك خۆی، بێمیکیاژی دین و ئایدیۆلۆژیا و ئەخلاقی باڵادەست، مرۆڤ تووشی نائومێدییەکی گەورەدەکات، هەستکردن بە ناماقوڵیی دونیا بەهێزتر و قووڵتردەکاتەوە، مرۆڤیش ڕووبەڕوی پوچگەراییەکی قووڵ و فراوان دەکاتەوە. هەمووو ئەمانەش شتگەلێکن مرۆڤ نایەوێت ڕووبەڕوویان ببێتەوە، نایەوێت بیانبینێت و ببن بە بەشێك لە ژیانی. بۆیە بەرهەمهێنانی وەهم پیشەسازییەکی بەبرەوە و جۆرێکیشە لە ناچاریی دەرونیی و ڕۆحیی، میکانیزمێکە بۆ هەڵاتن لە ڕووبەڕووبوونەوەی ژیان لە ڕوتێتی خۆیدا، ژیان بەهەمووو ماقوڵ و ناماقوڵەکانییە و بەهەمووو برین و نابرینەکانییەوە. بۆ خوێنەرە ئایدیۆلۆژییەکانی کارەکانی کامۆ ئەم دۆخی نائومێدیی و ناماقوڵیی و هیچگەراییە دۆخی ئیفلیجبوونی تەواوەتی مرۆڤە، ئەو شوێنەیە تیایدا مرۆڤ دەبێتە



تەماشاکەرێکی هێجگار سلبی ژیان و ڕێبوارێك بەناو هەمووو ساتەکان و سەردەمەکاندا دەڕوات بەبێئەوەی ئەم یان ئەو ئازار، ئەم یان ئەو مەسەلە، ئەم یان ئەو جوانیی یان ناشیرینیی ڕایبگرێت. ئەم جۆرە خوێندنەوەیە بۆ فیکرەی نائومێدی و ناماقوڵ و هیچگەرایی لای کامۆ خوێندنەوەیەکی ناڕاستە، لە هەمووو دۆخێکدا خوێندنەوەیەکی نووقسان و ناتەواوە. نائومێدیی لای کامۆ نائومێدییەك نییە مرۆڤ بەرەو ئیفلیجبوون ببات، نائومێدیی دەروازەی گەیشتن بە ئیفلیجبوونی ڕۆحیی و دەرونیی مرۆڤ نییە، هەنگاوێك نییە بەرەو پوچگەراییەکی ڕەهاو بێجوڵە و بێ‌هەڵوێست و بێ پێگە لەناو دونیادا. بەڵکو نائومێدیی و ناماقوڵییەکە بارگاویی بە ڕوانین و بە ڕەخنە، ڕوانین و ڕەخنەیەك پڕ لە ئینتیما و بەرپرسیاریەت، پڕ لە مشورخورادنی ژیان و مرۆڤ و دەوروبەر، بەڵام لەپاڵوازهێنان لەو نەخشە ئەخلاقییە سەختگیر و گەردونیانەدا کە مرۆڤ ناچاردەکەن چاکە و خراپە، جوانی و ناشیرینی، دەشێ و ناشێت لەڕێگای




نەخشە ئەخلاقییە تەسکەکانەوە لەیەکتر جیادەکاتەوە.(١)
لای کامۆ مرۆڤ بۆئەوەی ببێت بە مرۆڤ، بۆ ئەوەی بتوانێت مرۆڤانە لەگەڵ خۆی و لەگەڵ ئەوانیتر و لەگەڵ ژیاندا بژی، دەبێت واز لە زۆر شت بهێنێت و خۆی لە زۆر شت ڕووتبکاتەوە، زۆر بەرگ و پێستو قاوغ فڕێبدات و ببێت بە مرۆڤێك بەو شێوەیە ببێت و بژی کە هەیە. پرسیارەکە ئەوەیە ئەو شتانە چین کە مرۆڤ پێویستە وازیان لێبهێنێت؟ مرۆڤ لە چ شتێك ڕووتببێتەوە؟ کامانەن ئەو دەمامکانەی پێویستە مرۆڤ لەسەریان نەکات؟ وەڵامی کامۆ بەم پرسیارە وەڵامێکی ئاڵۆزە و شتێك نییە بە ئاسانی بیدۆزینەوە. ئەوەی من لەم نووسینەدا هەوڵئەدەم باسیبکەم پێداگرتنە لەسەر بوونی دوو وەڵام لە فیکری کامۆدا بەم پرسیارانە، دوو وەڵام کە هێما بۆ دوو قۆناغی جیاواز لە بیرکردنەوەی ئەم نووسەردا دەکات. قۆناغی یەکەمیان قۆناغی ڕۆمانی "غەریب"و "ئەفسانەی سیزێف"و شانۆگەری "کالیگۆلایە" کە تیایدا ئاکاری ڕاستەقینەی مرۆڤ پەیوەستە بە قبووڵکردنی ناماقووڵیی دونیا و هیچگەراییەوە. قۆناغی دووهەمیان قۆناعی کتێبی ڕۆمانی "تاعون" و "مرۆڤی یاخی"یە کە ئاکاری ڕاستەقینەی مرۆڤ تیایدا پەیوەستبوونێکی ئەخلاقییە بە یاخیبوون و ئازارەکانی مرۆڤەوە. فیکریی کامۆ سەفەرێکی درێژە لە "مرۆڤی ناماقوڵ"ەوە بەرەو "مرۆڤی یاخی"، لە سیزێفەوە بۆ پرۆمیسۆس(٢)، لە "مێرسۆ"ی ڕۆمانی "غەریب"ەوە بۆ "ڕامبۆ"ی شاعیر و "ئەندرێ بریتۆن"ی سوریالیست، لە کالیگۆلاوە بۆ "نیتشە"، بەتێپەڕین بەناو کەسایەتی دیستۆیفسکی و دی ساد و زۆرانێکی دیکەدا. بەڵام ئەم دوو شێوازە لە مرۆڤ چین و کامەن کە هێما بۆ دوو قۆناغی فیکریی ئەم نووسەرە دەکەن؟ ئاکارەکانیان کامەیە؟ چ پەیوەندییەکیان بە دونیایەوە هەیە و ڕوانینێکیان بۆ خۆیان و بۆ ژیان و بۆ ئەوانیتر چۆنە؟

## مرۆڤی ناماقوڵ

لەو پەرەگرافانەی سەرەوەدا زیاد لە جارێك دەستەواژەی "ناماقوڵ"م بەکارهێنا و بە یەکێك لە دەستەواژە سەرەکییەکانی ناو فیکری کامۆم ناساند. لە دونیای نووسینی ئەم پیاوەدا چەمکی ناماقوڵ چەمکێکی سەرەکییە بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ و تێگەیشتن لە ژیان. خوێنەر دەتوانێت

تەنانەت باس لە جۆرێك لە مرۆڤ بكات لە فیكری كامۆدا كە بشێت بە "مرۆڤی ناموقوڵ" ناوزەدبكرێت. بەڵام "ناماقوڵ" یانی چی؟

بەباوەڕی كامۆ ناماقوڵ ئەو چوارچێوە گشتییەی ژیان و بوونە كە مرۆڤ خۆی لەناویدا دەبینێتەوە، ئەو ژینگە وجودییەیە كە مرۆڤ تیایدا دەژی، ئەو دونیایەیە كە دەكەوێتە ناوییەوە. لەم چوراچێوە گشتییەدا هەم بوونی مرۆڤ خۆی بوونێكی ناماقوڵە و هەم مردن و نەمانیشی. لەپشتی لەدایكبوون و ژیان و بوون و مردنی مرۆڤەوە هیچ مانایەكی تایبەت بوونی نییە، هەر هەموویان دیاردەی تەواو ناماقوڵی بێمبەستن. دروستبوونی بوون خۆشی وەك چوارچێوەی ژیان دیسانەوە كردەیەكی ناماقوڵە، مەبەستێك لەپشتییەوە نییە و ئامانجێك لە دروسبوونیدا نییە. ئەو ڕێكەوتەی وادەكات مرۆڤ لە ساتێكی دیاریكراو و لەشوێنێكی دیاریكراودا لەدایكبێت و دواتریش لەساتێكی ترو شوێنێكی تردا بمرێت و ئاسەواری نەمێنێت، مەسەلەیەكی تەواو ناماقوڵ و بێمانایە. هەم لەدایكبوونی مرۆڤ و هاتنی بۆ دونیا ڕووداوێكی بێمانا و ناماقوڵە و هەم مردن و نەمانیشی. هەم دروستبوونی گەردون و هەم ئەگەری وێنرانبوونیشی دیسانەوە ڕووداوی بێمانا و بێمبەستن. لەپشتی هەموو ئەمانەوە مەبەستێك یان خواستێك یان مانایەك بوونی نییە مرۆڤ




بتوانێت بیدۆزێتەوە و لێیتێبگات. ئەمانە هەموویان بەشی جیاواز و دەركەوتی جیاوازیی ئەو شتەن كە كامۆ ناوی ناماقوڵی لێدەنێت.

جگە لەم مانا ئەنتۆلۆژییە، ناماقوڵ مانایەكی ئەبستمۆلۆژی گرنگیشی هەیە كە پەیوەستە بە زانین یان نەزاینینی "هەقیقەت"ی دونیاوە. ڕوانینی كامۆ بۆ دونیا وەك پێدراوێكی ناماقوڵ، یان سەریكردنی دونیا وەك دونیایەكی ناماقوڵ، هێما بۆئەوە دەكات كە عەقڵی مرۆڤ توانای دۆزینەوە و گەیشتنی بەمانا شاراوەكانی ژیانی نییە، لەڕاستیدا كامۆ باوەڕیوایە كە شتێك بەناوی مانای شاراوە و ناوەكیی ژیانەوە بوونی نییە. ژیان ئەوەیە كە هەیە، ئەوەی هەیە كۆمەڵێك "هەقیقەت"ە كە دروستكراون، بەرهەمی ئەم یان ئەو چالاكی كاتیی و تایبەتی ناو دونیان، شتێك نییە هێما بۆ جەوهەریی ژیان یان بوون بكەن، چونكە ژیان و بوون و ئەم جەوهەرەیان نییە، بەڵكو كۆمەڵێك باس و خواست و حیكایەتن




مرۆڤ دەربارەی چییەتی ژیان و بوون بەرهەمیان دەهێنێت. هەم ماناکان و هەم ماعقولیەتەکان مانا و مەعقولیەتی دروستکراون و بەسەر دونیادا دراون. لە دیدی کامۆدا ناماقوڵیی و بێمەبەستیی دونیا دۆخێکی هێجگار جەوهەریی بوونی مرۆڤە، مرۆڤ نە دەتوانێت دەستکاری کات و ساتی لەدایکبوون و مردنی خۆی بکات، نەدەتوانێت لێیان دەربازببێت. هەردووکیان دوو پێدراوی سەختی ناو ژیانی مرۆڤن کە بەتاڵن لە ماناو مەعقولیەت و مەبەست. بەباوەڕی کامۆ باشترین شتێك مرۆڤ بتوانێت لەبەردەم ئەم ناماقوڵییە گەورە و جەوهەرییەدا ئەنجامیبدات، ئەوەیە فێرببێت لەگەڵیدا بژی. فێرببێت لەگەڵ ئەو ڕاستییەدا بژی کە مرۆڤ بێ هۆ لەدایکدەبێت و بێهۆ گەورەدەبێت و بێهۆش دەمرێت. لەم ڕوانگەیەوە فیکری کامۆ هەوڵدانێکی ئیستاتیکی و فیکریی و ئەخلاقییە بۆ ئاشتکردنەوەی مرۆڤ لەگەڵ ناماقوڵبوونی ژیاندا. بۆیە یەکەم شت کە مرۆڤ پێوستە وازی لێبهێنێت گەڕانە بەدوای دۆزینەوەی ماناو مەعقولیەتی ژیاندا.
ناماقوڵ پەیوەندیشی بە مرۆڤەوە هەیە وەك بوونەوەرێك کە ناتوانێت بەبێ مانا بژی. ئارەزوی گەورەی مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی مانا لە دونیادا، ئارەزویەکی هێجگار گەورە و بنەڕەتییە مرۆڤ ناتوانێت بەئاسانی دەستبەرداری بێت. ناماقوڵ بریتییە لە بەریەکەوتنی توندی نەبوونی مانا لە دونیادا، لەگەڵ حەز و ئارەزووی بێوێنەی مرۆڤدا بۆ دۆزینەوەی مانا لەو دونیایەدا. بەم مانایە ناماقوڵ شتێك نییە لەناو دونیا یان لەناو مرۆڤدا بوونی هەبێت، بەڵکو لەو پەیوەندییەدا دروستدەبێت کە مرۆڤ بە دونیاوە گرێئەدات. مرۆڤ بوونوەرێکی ماناگەڕە لە شوێنێکدا کە ناتوانێت مانا بە مرۆڤ ببەخشێت، ئەمە وادەکات هەم پەیوەندییەکە و هەم گەڕانەکە پەیوەندی و گەڕانێکی ناماقوڵ بێت. بەم مانایە ناماقوڵ لەسەر سێ کۆڵەکە وەستاوە، یەکێکیان دونیایە، ئەویتریان مرۆڤە وەك تاکەکەس، سێهەمیان ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان دونیا و مرۆڤدا دروستدەبێت. خاڵی هەرە سەرکییش لەم پەیوەندیەدا مرۆڤەوەك بوونەوەرێکی مانادۆز، وەك کەسێك بەدوای ڕوونی و دڵنیایی لەناو دونیادا دەگەڕێت، لەکاتێکدا دونیا ناتوانێت ئەو ڕوونی و دڵنیاییە بە مرۆڤ ببەخشێت.
بەڵام قبووڵکردنی ناماقوڵبوونی ژیان مانای ئەوە نییە مرۆڤ تەسلیم بەبێهیوایی و نائومێدیی و ڕەشبینییەکی ئیفلیجکەر ببێت، مانای ئەوە نییەوەك بوونەوەرێکی بێحەز و

بێئیرادە و بێبەرپرسیاریێتی بەناو ژیان و مێژوودا تێبپەڕێت و لە دۆخی بێتوانایی و بێئیرادەییەوە لەخۆی و لە شتەکانی دەوربەری ڕابمێنێت. مانای ئەوەش نییە ژیان لەژێر ڕەحمەتی قەدەرێکی دینیی یان نادینییدا ببینێت و مرۆڤ وەك گەمەی دەستی ئەو قەدەرانە وێنابکات. بەباوەڕی کامۆ مرۆڤ دەتوانێت لەناو ئەم ناماقوڵییە جەوهەرییەی ژیاندا بکەرێکی چالاك بێت، بوونەوەرێکی یاخی و ناڕازی بێت، تەنانەت پاڵەوانیش بێت، بەڵام "پاڵەوانێکی ناماقوڵ". مرۆڤ دەتوانێت ببێت بە بوونەوەرێك، گەرچی دەزانێت هیچ مەعقولیەتێك لەژیاندا بوونی نییە، بەڵام ژیان وەك ژیان و وەك پێدراوێکی گرنگ ببینێت و مامەڵەبکات. ژیان وەك هەلێك بۆ ژیان، وەك هەلێك بۆ ئەزموونکردنی دونیا و پەیوەندییەکان و ێنابکات. ژیان وەك شتێك ببینێت قابیلی ئەوەیە مرۆڤ بەقووڵی و بەچڕی هەموو ساتەکانی بژی و یەك بە یەکی کەوتن و هەستانەوەکانی بەچڕی ئەزموونبکات و لە ئامێزبگرێت. مرۆڤی کامۆیی بوونەوەری "دوای هەستکردنە بەناماقوڵی شتەکان"، ئەو کەسەیە گەرچی دەرکی تەواوی بە ناماقوڵییەکانی ژیان کردوە، گەرچی مەبەستێك لەپشتی ژیان و مردنەوە نابینێت، بەڵام تا دواهەناسە دەژی و دەجەنگێ و دەدوێ، بەردەوامدەبێت لەوەدا کە مرۆڤە و دەتوانێت بژی. مرۆڤ لێرەدا بۆئەوەی ببێت بە مرۆڤ پێویستە یان ببێت بەسیزێف، یان لەناو دۆخە سیزێفییەکەی بوونەوە باوەش بەژیاندا بکات. دروشمە سەرەکیەکە ئەمەیە: لەگەڵ سیزێفەکەی ناوتا بژی، ژیانێك بەبێ بوونی ئومێدی گەورە، بەڵام پڕ لەیاخیبوون




و چێژ و بەرپرسیارێتی.
لەناو چەمکی ناماقوڵدا وێناکردنێکی تایبەتی مرۆڤ ئامادەیە وەك بوونەوەرێك کە بەردەوام بەدوای مانادا دەگەڕێت، مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی ماناگەڕ، مانادروستکەر، مانابەرهەمهێنەر. ناماقوڵ لێرەدا دەبێتە چوارچێوەی ئەو ناکۆکییەی کە لەنێوان دونیایەیکی بێمانا و بێمەبەستدا و لەنێوان مرۆڤێکی ماناگەڕ و مەبەستداردا دروستدەبێت. فیکرەی پێکدادانی دونیایەکی بێمانا و مرۆڤێکی گەڕۆك بەدوای مانادا بەشێکی گرنگە لە بیرۆکەی ناماقوڵ. لای کامۆ دونیا بەجەوهەر دونیایەکی ناموقەڵە، هیچ مانایەکی نییە، شتێك نییە ناوی مانا بێت و لەناو دونیادا دانرابێت، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە مرۆڤ



بوونەوەرێکیماناگەڕە، بەوە ڕازینابێت شتەکان تەنها بۆشایی و چوارچێوەی بەتاڵ و بێمانابن. لای کامۆ کێشەی مرۆڤ و ناماقوڵی مرۆڤ لەوەدایە کە بەردەوام بەدوای مانای ژیاندا دەگەڕێت، مانایەك لەناو دونیادا و لەناو بوون و لەناو ژیاندا. ئەوەی لەم دۆخە وجودییەدا ناماقوڵە ئەمەیە: دونیا شوێنێکە بەتاڵ لە مانا، بەڵام مرۆڤ بوونەوەرێکی گەڕۆکە بەدوای مانادا لەو دونیایەدا، ئەمە وادەکات هەم ژیان و هەم مرۆڤ خۆشیان دوو پێدراوی ناماقوڵ بن.

بەبۆچوونی کامۆ مرۆڤ دەتوانێت لەڕێگای ئەزموونکردنی ژیانی ڕۆژانەیەوە ئەم ناماقوڵییەی دونیای بۆ دەربکەوێت، لەڕێگای ئەو دیاردانەوە کە بەرەوڕوویان دەبێتەوە، لە دیاردەی لەدایکبوونەوە بیگرە بۆ دیاردەی مردن. هەستکردن بە ناماقوڵی دونیا لەڕێگای بیرکردنەوە و فەلسەفەوە دروستنابێت، بەڵکو لەڕێگای ئەزموونکردنەوە و لەڕێگای ئەو ڕووداوانەوە کە ڕوودەدان و مرۆڤ شایەتە بەسەر ڕوودانیانەوە. بۆ نموونە ڕووداوی شەوقدانەوە چەقۆی دەستی پیاوە عەرەبەکە لەسەر چاوی مێرسۆ و کاردانەوەی مێرسۆش بە کوشتنی عەرەبەکە لە ڕۆمانی "غەریب"دا. لەم ڕۆمانەدا کامۆ دۆخێك دروستدەکات کە کەس لێیبەرپرسیار نییە و هیچ مانایەکیشی نییە، ڕۆژێکە گەرم و ناخۆش، مێرسۆ لەکەناری دەریایە، عەرەبێك لێی نزیکدەکەوێتەوە و چەقۆیەکی پێیە، شەوقی تیشکی خۆر لەسەر چەقۆکە بەرچاوی مێرسۆ دەکەوێت، میرسۆ دەمانچەکەی هەڵدەگرێت و بە چوار فیشەك عەرەبەکە دەکوژێت. هەموو ئەم ڕووداوانە لای کامۆ ڕووداوی ناماقوڵن، بەڵام دواجار دەبنە هۆی کوشتنی کەسێك و گیرانی کەسێکی تر. لەم ڕووداوانە ناماقوڵتر، یان ناماقوڵی هەرە گەورە، خودی مردن خۆیەتی، زانینی ئەو ڕاستییەیە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی فانییە، چۆن بژی و چۆن نەژی هەر دەمرێت و لەناودەچێت. مرۆڤ بۆ دەمرێت؟ یان هەر لەسەرەتاوە بۆ لەدایکدەبێت؟وەڵامێکی ماقوڵ بەم پرسیارە گەورانەی مرۆڤ لەئارادانییە.

پرسیاری کامۆ ئەوەیە مرۆڤ چی لەم هەموو ناماقوڵییە بکات؟ ئەگەر مردن ڕووداوێکی ناماقوڵ بێت مرۆڤ چۆن لەبەردەم مردندا ڕابوەستێت؟ ئایا دەستەوسان بوەستێت و چاوڕێکەری مردن بێت، یان باوەش بە ژیاندا بکات و لەناو ساتەوەختە جیاوازەکانیدا دواهەمین قوڵاییەکانی ئەزموونبکات؟ وەڵامی کامۆ بەم پرسیارانە وەڵامی دووهەمیانە. وەڵامی مرۆڤ بە ناماقوڵییە

گەورەکان نابێت پشتکردنە ژیان بێت، نابێت گریانبێت بەدیار مردنەوە، یان چەقبەستن بێت لەم یان لەو ژێرکەوتن و سەرکەوتندا، بەڵکو پێویستە ئامێزکردنەوەیەکی تەواو بێت بە ئێستاو ئێرەدا، ژیان بێت بە چڕیی و بە قووڵیی لەناو ئەو زەمەنە کورتەدا کە مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیە دەیباتەسەر، باوەشکردنەوە بێت بۆ هەموو ئەو ساتانەی کە دێنەپێشەوە. بو کورتی ژیان بێت لەناو ئەو زەمەنە کورت و دیاریکراوەدا وەك ژیان لەناو ئەبەدیەت خۆیدا. هەموو ئەمانەش بەچێژێکی گەورە و ڕۆحێکی کراوەوە و مەیلێکی خۆبەخۆوە. ئاشکرایە ناماقوڵ لێرەدا دەستەوسانبوون نییە لەبەردەم ژیاندا، تەسلیمبوون نییە بە نائومێدیی و خەمۆکیی، وەستان نییە لەدەرەوەی کۆمەڵگا و دەرەوەی تەحەداکاندا، بەڵکو ته ر جه مه کر د نی ژیانە بۆ ملیۆنەها سا ته و ه ختی بچووك و زیندوو، نیشته جێبو و نی مرۆڤە بەڕۆحێکی زیندووەوە لەناو دونیایەکی زیندوودا، بەڵام بەبێ ئومێد و چاوەڕوانی گەورە، بەبێ هیوایەك بۆ دۆزینەوەی ماناو مەبەستی گەورە لەپشتی ژیان خۆیەوە. مرۆڤ لەم دونیا ناماقوڵەدا، کە هەم مردن و هەم هۆشیاریی بە مردنی تێدایە، دەبێت هەوڵبدات بەختەوەربێت، بەختەوەرییەکانی سات بە سات بژی، ڕاستەوخۆ ئەزموونیان بکات نەك هەڵیانگرێت بۆ ساتێکی نادیار، بۆ ئاییندە، یان بۆ دواترێك کە مرۆڤ نەزانێت دێت یاخو نایەت، یان بیەوێت قوربانیان پێبدات لەپێناو شتێکی دیکەدا. ئەو ئەخلاقەی کامۆ لەلای مرۆڤی ناماقوڵ بەرگری لێدەکات ئەخلاقی لانی هەرە زۆری ژیان و لانی هەرکەمەی نەژیانە، هەوڵدانی بەختەوەربوون و بەرپرسیاربوونە لەناو دونیایەکی ناماقوڵ و بێمانادا.




## دونیای دوای مردنی خوداوەند

لە ئاستی ئەنتۆلۆژیدا، دونیای ڕۆشنبیریی فەرەنسی دوای جەنگی جیهانی دووهەم، ئەو دونیایەی ئەلبێر کامۆ تیایدا دەنووسێت، دونیای مردنی خوداوەندە بە مانا نیتشەییەکەی، دونیای لەدەستدانی هەموو دڵنیاییەکی ئۆنتۆلۆژی و هەموو شتێکی جێگیرە لەژێر پێیەکانی مرۆڤدا. لەئاستی فیکری و تیوریشدا ئەو دونیایە دونیای باڵادەستی بونگەرایی و مارکسیزمە. وەك نیتشە



ئەلبێر کامۆ باوەڕی وابوو  مرۆڤی مۆدێرن لە دونیایەکی بێخودادا دەژی، دونیایەك پڕ لە تاوانی گەورە و داماڵراو لە دڵنیایی و بێبەش هەقیقەتی ئەبەدی، بەڵام هاوکات پڕ لەو شێوازانە لە بیرکردنەوە و ڕوانین کە ناهێڵن مرۆڤ دونیا بە ڕوونی و بەڕووتی ببینێت، دونیاوەك ئەوەی هەیە و وەك ئەوەی لەئارادایە ببینێت، واتە ناهێڵن مرۆڤ ببینێت و تێبگات کە دونیا شتێکی بێمەبەست و ناماقوڵە. خودایەك نییە لەپشتی دروستبوونی دونیاوە، یان لەناو دونیا خۆیدا، مەبەستێکی دیاریکراو بە ژیان و بە دونیا بدات، ئەوەشی کە هەیە و ئامادەیە مەعقولەیەتێکی دیاریکراو لەپشتییەوە نییە. لەم ڕووەوە مەرگی خودا بۆ کامۆ هەم مەرگێکی ئەنتۆلۆژی و هەم مەرگێکی ئەبستمۆلۆژییە، واتە چەندە مرۆڤ ڕووبەڕووی تەنایيەکی وجودیی دەکاتەوە، ئاواش لە دۆخی نەبوونی دڵنیاییەکی مەعریفیدا نیشتەجێی دەکات. بەشێکی گرنگی کارەکانی کامۆ نیشاندانی ئەم دۆخی نادڵنیابوونەیە بە مرۆڤ خۆی. بێگومان ئەو دونیا بێخودایەی کامۆ باسیدەکات چیدی دونیاکەی نیتشە نییە، دونیای سەدەی نۆزدەهەم نییە، بەڵکو دونیای سەردەمی هۆڵۆکۆست و دوای هۆڵۆکۆستە، دونیای دوای وێرانکردنی ژیان و وێرانکردنی مرۆڤە بەشێوەیەکی بیرلێکراوەو پلان بۆدانراو لە جەنگی جیهانی دووهەم و لە کەمپەکانی کوشتنی دەتسەجەمعی هیتلەر و ستالیندا. فیکری ئەلبێر کامۆ و فیکری بەشێکی زۆری بوونگەراکانی ئەو سەردەمەش، فیکریی دوای لەدایکبوونی "زانستی کوشتنی مرۆڤ" و "زانستی کارگێڕیی لەناوبردنە"، ئەگەر هۆڵۆکۆست هێمابێت بۆ کوشتنێکی ڕێکخراو و پلان بۆدانراو، بۆ کوشتنێکی بەمەبەست و بیرلێکراوە، بۆ لەناوبردنێکی ئایدیۆلۆژی، ئەوا فیکری ئەو نەوەیە لە ڕۆشنبیران فیکری هەوڵدانە، نەك تەنها بۆ ئیدانەکردنی ئەو دونیایە، بەڵکو بۆ تێگەیشتن لێشی. تێگەیشتن لەهەموو ئەو شتانەی کە کوشتن دەکات بە بەشێك لە بیرکردنەوە و وێناکردنی دونیایەك گوایە باشتر و پاکتر و ئینسانیترە لە دونیای باڵادەست. وەك وتم کامۆ مردنی خوداوەند و نەبوونی مەبەستێك لەپشتی دروستبوونی دونیاوە وەك دۆخێکی ئەنتۆلۆژی دەبینێت، بەڵام ئەمە وایلێناکات لە ئاستە مێژووییەکەدا نرخی گەورە بۆ ژیان و بۆ مرۆڤبوون دانەنێت، بەپێچەوانەوە ئەوەی کامۆ لە دونایەکی لەو بابەتەدا دەخوازێت بە مرۆڤی بڵێت ئەمەیە: تەنانەت گەر مەبەستێکیش لەئاردانەبێت و خوداوەندێکیش بوونی



ئەدەبی بەردەم

نەبێت، مرۆڤ هێشتا ناچارە مرۆڤ بێت و پێویستە ژیان بە هەموو گەرمی و ساردی و کەوتن و هەستانەوەکانییەوە بژی. مرۆڤ ناچارە لەناو سیزێفیەتی دونیا و ژیاندا بژی، بەڵام لەباتی ئەوەی وەك سیزێفی پشتی بەردەکە بژی، پێویستە وەك پرۆمیسۆسێکی ئاگربەدەست و نارازیی بە ڕۆحی یاخیبوون و تەسلیم نەبوونەوە بژی. ئەمەش ئەو گۆڕانەیە کە کامۆ لە قۆناغی یەکەمەوە بۆ قۆناغی دووەم دەگوازێتەوە.

**\لە ڕۆمانی "غەریب"ەوە بۆ کتێبی "مرۆڤی یاخیی"**

وەك پێشتریش وتم، فیکری کامۆ بە ڕۆمانی "غەریب" و شانۆگەری "کالیگۆلا" و کتێبی "ئەفسانەی سیزێف" دەستپێدەکات، بەڵام دواتر لە "تاعون" و "مرۆڤی یاخی"دا مانای نوێ و ڕەهەندی نوێ وەردەگرێت. کامۆ لەغەریب و کالیگۆلا و ئەفسانەی سیزێفدا چوارچێوە و ناوەڕۆکی ئەو فیکر و ڕوانییە دادەڕێژێت کە ناوی "فیکری ناماقوڵە"، هەروەها جۆرێك لە کاراکتەر دروستدەکات کە نەك تەنها ناتوانێت بەرپرسیاربێت، بەڵکو ناشتوانێت چێژ لە ژیان بکات و گوێ بەو دونیایەش بدات کە لەناویدا دەژی. ئەم کاراکتەرە کە ئەمە ناکات لەبەر ئەوە نییە ڕقی لە ژیانە و نایەوێت بەرپرسیار بێت، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ئەو دونیایەی تیایدا دەژی ئەوەندە بە دونیایەکی ساختە و پڕ درۆ و ماسك و ناپاکی و ناشیرینی دەبینێت، نایەوێت بەهیچ جۆرێك بەشێك بێت لێی، نە بەشێك بێت لەخۆشیی و شادیی و کەیف و سەفاکانی، نە لە ناخۆشیی و دەرو کارەساتەکانی. ئەم دۆخەیە وادەکات کەسایەتی مێرسۆ لە ڕۆمانی غەریبدا کەسایەتییەکی بێدەنگ و کەمدوو بێت، پێویستی زۆری بە زمان و بە قسەکردن نەبێت. وەك کامۆ خۆی دەڵێت "ئاکاری سەرەکی مێرسۆ ئەوەیە کە درۆ ناکات"، بەتایبەتی درۆ لەگەڵ هەست و سۆزی خۆیدا ناکات و بەوشێوەیە دەجوڵێتەوە و ئەو قسانە دەکات کە هەستیان پێدەکات و دەیەوێت بیانڵێت بەبێ ئەوەی گوێ بەوە بدات ئایا کۆمەڵگا و ئەوانیتر چۆن بیر لەو قسانە دەکەنەوە و چوێنەیەکی ئەو لەپاڵ قسەکانیدا دروستدەکەن. مێرسۆ کەسێك نییە بێهەست و بێ ئیحساس بەڵکو کەسێکە، دیسانەوە وەك کامۆ خۆی دەڵێت، "هەستەکانی خۆی داناپۆشێت و بۆیاخیان ناکات، ئەمەیەوا لە کۆمەڵگا دەکات






لەبەرامبەر مێرسۆدا هەست بە هەڕەشە بکات".(٣) درۆنەکردن و ماسك لەسەر نەکردن و ڕاستگۆبوون لەگەڵ خود خۆیدا وادەکەن مێرسۆ کەسێکی غەریب بێت بەو کۆمەڵگایەی تیایدا دەژی. مەسەلەکە لای مێرسۆ مەسەلەی بوون یان نەبوونی بەرپرسیاریەت نییە، بەڵکو مەسەلەی بوون یان نەبوونە بەبەشێك لە درۆ و ماسك و فرەڕوییەکانی ناو کۆمەڵگا.

ڕووداوەکانی جەنگی جیهانی دووهەم جۆرێکی تر لە ئەدەبیات بە کامۆ دەنووسن جیاواز لە ڕۆمانی غەریب. وەك کاردانەوە بەڕووی کارەساتە گەورەکانی جەنگدا کامۆ لە ڕۆمانی "تاعون"و لە کتێبی "مرۆڤی یاخیی"دا، پەنجەرەیەکی گرنگ لەسەر بیرۆکەی بەرپرسیاریەت و ئەخلاقیبوونی مرۆڤ لەناو دونیادا دەکاتەوە و وەك دوو ڕەهەندی هێجگار گرنگی مرۆڤبوون دەیناسێنێت. بەم گۆڕانە ئیتر کامۆ لە "فەلەسەفەی پوچگەرایی" سەردەمی "مرۆڤی ناماقوڵ"ەوە دەگوازێتەوە بۆ "فەلسەفەی یاخیبوون".(٤) لە "مرۆڤی پووچگەرەوە" دەڕوات بەرەو "مرۆڤی یاخیی"، لە قسەکردن لەسەر تاکەکەسێکەوە کە سەرقاڵە بە تاکەکەسبوونی خۆیەوە بۆئەوەی نەبێت بەبەشێك لە کۆمەڵگا، دەپەڕێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر تاکەکەسێك کە باوەڕیوایە و دەخوازێت لەگەڵ ئەوانیتردا بەشێویەکی بەرپرس و هۆشیارانە بژی و وەك بکەرێکی یاخیگەر ئامادەبێت. کە ئەمە دەڵێم نامەوێت بڵێم کە مێرسۆی پاڵەوانی ڕۆمانی غەریب بوونەوەرێکی ناڕاستگۆ و نابەرپرسیارە، یان کەسێکە بەتاڵ لە یاخیبوون، بەپێچەوانەوە ڕەهەندێکی گرنگی یاخیبوون لە کەسایەتی مێرسۆدا ئامادەیە. مێرسۆ بەڕووی کۆمەڵگادا یاخییە لەڕێگای هەوڵدانییەوە بۆئەوەی نەبێت بەبەشێك لە کۆمەڵگا، بۆ ئەوەی دیوارێك لەنێوان خۆی و کۆمەڵگادا دروستبکات. ڕاستگۆبوونی مێرسۆ لەگەڵ هەستەکانی خۆیدا بەشێکە لە کردەی خۆجیاکردنەوەیەکی ڕادیکاڵ لە کۆمەڵگا، بەڵام ئەوەی کتێبی "مۆرڤی یاخیی" نیشانمان ئەدات ئەم کردەی خۆجیاکردنەوەیە نییە، یاخیبوون نییە بەمانای هەڵاتن لە کۆمەڵگا، بەڵکو دروستبوونی مرۆڤێکی یاخیگەرە لەناو کۆمەڵگادا و لەگەڵ کۆمەڵگادا، لەگەڵ ئەوانیتردا لەناو کۆمەڵگادا. یاخیگەرێك هەوڵی بەگژاچوونەوەی ناشیرینییەکان و کۆتایهێنان بە مەترسییەکان دەدات، بەتەنها نا، بەڵکو لەگەڵ یاخیگەرەکانی تردا. ئەگەر مێرسۆ دژ بە دووڕوویی و نیفاقە ناوەکییەکانی ناو کۆمەڵگا بێت و خۆی لەوە بپارێزێت ببێت بەبەشێك لەو

کۆمەڵگایە، واتە یاخیبوونەکەی یاخیبوونێکی نێگەتیڤ بێت، ئەوا کەسایەتییە سەرەکییەکانی ڕۆمانی تاعون یاخیگەریی پۆزەتیڤن و ڕووبەڕووی ئەو مەترسییانەوە وەستاوەنەتەوە کە ئەوان وەك کۆمەڵگا لەبەردەم هەڕەشەکانیدا وەستاون.
لە قۆناغی دووهەمدا یاخبوونی مرۆڤ یاخیبوونە بەڕووی بوونی تاکەکەسانەی خۆیداو یاخیبوونە بەڕووی هەموو ئەو مەترسییانەدا کە لە ناو دونیا و کۆمەڵگا و پێکەوەبوونە کۆمەڵایەتییەکاندا دروستدەبن و هەوڵی وێرانکردنی ژیان ئەدەن. بەڵام ئەم یاخیبوونە ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی، قەناعەتێکی فیکریی، یان ڕوانینێکی سیاسی نایسەپێنێت، بەڵکو کۆمەڵێك بەها و ئەخلاقیات ئەیسەپێنێت کە پابەستی مرۆڤبوونی مرۆڤە، پابەستی مرۆڤە وەك مرۆڤ. ئەمەش ئەخلاقیاتی هەڵنەهاتنە لە کێشە و مەترسییەکان و ئەخلاقیاتی هاریکاری و بەدەمەوەچوون و کاری پێکەوەییە لەگەڵ ئەوانەدا کە لە دۆخێکی هەڕەشەئامێز و پڕ مەترسیدا ژیان بەسەردەبەن. وەکو وتم ئەم گواستنەوەیە گواستنەوە نییە لە مرۆڤێکی بێئومێد و پاسیڤەوە بۆ مرۆڤی پاڵەوان، یان بۆ مرۆڤی سوپەرمان، بەڵکو گواستنەوەیە لە مرۆڤێکەوە کە دونیای دەرەوەی خۆی ئەوەندە بە جدی وەرناگرێت بۆئەوەی ببێت



بە بەشێك لێی، بۆ مرۆڤێك هەم بوونی لەناو ئەو دونیا دەرەکییەدا و هەم بوونی لەگەڵ ئەوانیتردا دەبنە خاڵی سەرەکیی ژیانی. بەم مانایە گواستنەوە لە ڕۆمانی "غەریب"ەوە بۆ ڕۆمانی "تاعون" یان لە کتێبی "سیزێف"ەوە بۆ کتێبی "مرۆڤی یاخی" گواستنەوەیە لە سکونەوە بۆ جوڵە، لە هەڵوێستێکی ئەخلاقی ڕەفزکەرەوە، بۆ بوون بە مرۆڤێکی ئەخلاقیی بەشدارکەر، لە بیرکردنەوە لە ئازادییەوە بەتەنها، بۆ بیکردنەوە لە ئازادییەکی گرێدراو بەوانیتر و بە ئەخلاقیاتی بەرپرسیاریەتەوە. لەئاستی کاراکتەرە ئەدەبییەکانیشدا ئەم گواستنەوەیە گواستنەوەیە لە "میرسۆ"ی پاڵەوانی ڕۆمانی غەریبەوە، بۆ کەسایەتی ئەو ڕۆژنامەنووسەی لە ڕۆمانی "تاعون"دا ڕازینابێت شارە گەمارۆدراوەکە بە نەخۆشی کۆلێرا جێبهێڵێت و بەتەنها بۆیدەربچێت و بەتەنها خۆی ڕزگاربکات. لە ڕۆمانی "تاعون"دا شەڕکردن لەگەڵ تاعوندا دەبێت بە ئەرکێکی ئەخلاقیی مرۆڤەکانی ناو شارەکە، لەکاتێکدا لە "غەریب"دا هیچ هەستێك بە ئەرکێکی ئەخلاقیی بەرامبەر بە کۆمەڵگا



ئامادەنییە، تەنانەت ئەرکی بەرگریکردنی مرۆڤ لە خۆشی لە بەردەم دادگای ڕەسمی کۆمەڵگایەکدا پڕ لە درۆ و دووڕوویی و ناپاکیی.

## مێرسۆ: یاخیگەرێکی نێگەتیڤ

ڕۆمانی غەریب چیرۆکی کوڕێکی گەنج دەگێڕێتەوە کە ناتوانێت و نایەوێت لەگەڵ کۆمەڵگادا تەبابێت، ناتوانێت ئەو بەها و نۆرم و ڕوانینانە قبووڵ بکات کە لە کۆمەڵگادا باڵادەستن. دەیەوێت لەباتی گوێگرتن بۆ کۆمەڵگا گوێ لە خۆی بگرێت و لەباتی ڕاستگۆیی لەگەڵ کۆمەڵگایەکی دووڕوودا لەگەڵ هەست و نەستی خۆیدا ڕاسگۆبێت. لە مێژووی ئەدەبیاتدا ڕەنگە تەنها کەسایەتی کاردیۆلیای شانۆگەریی "لیر پاشا" ی شەکسپیر بەڕادەی کەسایەتی مێرسۆ ڕاستگۆبێت، کەسێك بێت نەتوانێت و نەیەوێت درۆبکات.(٥) مێرسۆ، بۆ نموونە، کاتێك دایکی دەمرێت ناچێت بۆ پرسەکەی و ئەو ڕۆژە لەباتی چوون بۆ پرسە و لەباتی خۆنیشاندان وەك کەسێکی خەمبار، دەچێت بۆ سینەما. کە لە دادگا تاوانبار دەکرێت بە کوشتنی پیاوێکی عەرەب لە کەناری دەریایەکدا و سزای مردنی بەسەردا دەسەپێنرێت، بەرگریی لە خۆی ناکات. مێرسۆ بەحوکمی ئەوەی ڕاستگۆیە و ناپاکی بەرامبەر بەو هەستانە ناکات کە هەستیان پێدەکات، دەکەوێتە دۆخی بەگژاچوونەوەیەکی نێگەتیڤەوە بەڕووی دادگا و دەزگا و ئەخلاقیاتی باوی ناو کۆمەڵگادا، ئەم بەگژاچوونەوەیە بەمەبەستی ئەوە نییە کۆمەڵگا بگۆڕێت، مێرسۆ نایەوێت کۆمەڵگا بگۆڕێت، بەڵکو دەیەوێت لە کۆمەڵگا دابڕێت و نەبێت بە بەشێك لێی، دەیەوێت لەڕێگای دابڕانەوە بچێتە دەرەوەی بەها و نۆرم و یاسا و عورف و عادەتەکانی کۆمەڵگاوە.

سەیر لەوەدایە داگا لەبەر تاوانی کوشتنی عەرەبەکە مێرسۆ حوکم نادات، بەڵکو لەبەر ئەوە حوکمی ئەدات کە بەهۆی مردنی دایکییەوە هیچ هێمایەکی خەمباربوون و هیچ گریان و دایکەڕۆیەك نیشان نادات، واتە مێرسۆ ئەو کارادانەوانەی بەرامبەر بە مردنی دایکی نییە کە کۆمەڵگا چاوەڕوانە هەیبێت. ئەوەی وادەکات دادگا بڕیاری کوشتنی مێرسۆ بدات ئەم خاڵەیە، ڕێزنەگرتنە لەویست و چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگا، نەك ئەوەی لەسەر کەناری دەریا و لە ڕۆژێکی گەرمدا عەرەبێکی کوشتبێت. ڕێزنەگرتنی کۆمەڵگا و گوێنەدان

بە یاسا و بەها و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکانە دەبێتە هۆی دەرکردنی بڕیاری کوشتن بەسەر مێرسۆدا. مێرسۆ ئەو گەمانە قبووڵناکات کە کۆمەڵگا دەیەوێت هەمووان بیکەن و قبووڵیبکەن. بەم مانایەش مێرسۆ کەسایەتییەکی یاخیگەرە، بەڵام یەخیگەرێکی نێگەتیڤ.

### ئەفسانەی سیزیێف

لە ئەفسانەی سیزێفدا سیزێف پیاوێکی فێڵباز و ناپاك و پڕ تەماعە، لە دوو لەتی جیاواز بەیەك دروستبووە، لەتێکیان خودایە و لەتەکەی تریان دزو جەردە. خوداکان سیزێف بەوە سزائەدەن هەموو ڕۆژێك پاڵ بە بەردێکی گەورەوە بنێت بۆسەر لوتکەی شاخێك، بەڵام بەر لەوەی بەردەکە بگەیەنێتە سەر لوتکەی شاخەکە جارێکی تر بەردەکە بەرەوە خوارەوە خلدەبێتە و دەچێتەوە شوێنەکەی خۆی. سیزێف پێویستە بۆ هەتاهەتایە ئەم کارە دووبارە بکاتەوە. ئاشکرایە ئەم سزایە سزایەکی پڕوکێنەر و تۆقێنەریی بێکۆتاییە. پرسیارەکە ئەوەیە ئایا تۆقێنەریی و پڕوکێنەربوونی ئەم سزایە لە چیدایە؟ چییە وامانلێدەکات ئەم سزایە بە



تۆقێنەر بزانینن؟ ئایا تۆقێنەربوونەکەی لە گەورەیی قەبارە و قورسایی بەردەکەدایە؟ ئەگەر سیزێف بەردێکی بچووکتر و سوکتری پاڵبنایە ئایا سزاکەی کەمتر تۆقێنەر بوو؟ ئایا مەسەلەی سەرەکی لەم سزایەدا مەسەلەی ماندووبوونی سیزێفە؟ ئایا کوشندەیی سزاکە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە سیزێف بەتەنها ئەم کارە دەکات، کەسی لەگەڵدا نییەو بێدۆست و هاوڕێیەك پاڵ بە بەردەکەوە دەنێت؟ ئایا ئەگەر کەسانی تری لەگەڵدا بووایە سزاکە باشتر و ئاسانتر دەبوو؟ زیاتر قابیلی قبووڵکردن بوو؟ بەبۆچوونی من هیچ یەکێك لەمانە مەسەلەی سەرەکی دۆخەکەی سیزێف نین، مەسەلەی سەرەکیی ئەوەیە کە سزاکە بێکۆتاییە، خاڵێك نییە تیایدا بوەستێت و کۆتاییپێبێت، سزایەکە ڕووی لە هەموو ژیانە، سزاکە خۆی ژیانە و لەدەرەوەی ئەم سزایەدا شتێك بەناوی ژیانەوە نامێنێتەوە، نەك تەنها شتێك بەناوی ژیانەوە نامێنێتەوە، بەڵکو مانایەکی تریش بۆ ژیان نامێنێتەوە. کامۆ دۆخی سیزێف وەك دۆخی سەرەکی و بنەڕەتی ژیان نیشانئەدات، وەك ئەو دۆخەی مرۆڤ لە دونیادا دەکەوێتە ناوییەوە. سیزێفیەت چوارچێوە سەرەکی و گشتییەکەی ژیانە، ئەو زەمەن و ڕووبەرە ئەبەدییەیە کە



مرۆڤ هەمیشە لەناویدا دەژی. ژیان وەك سزا. ئەوەی شوێنی تێڕامانە کامۆ ئەم دۆخەوەك دۆخێکی حەتمی وێناناکات، سیزێفیەت وەك قەدەر نابینێت، سیزێفبوون جۆرێك لە چارەنوسی نەگۆڕ نییە. بەبۆچوونی کامۆ چارەنووسی سیزێف لە دەستی خۆیدایە، بەردەکە بەردی ئەوە، هەر بەشێکی ئەو بەردەش دونیایەکی تایبەتە.
هەوڵدانی بەردەوام و بێبڕانەوەی سیزێفیش بۆ سەرخستنی بەردەکە بۆسەر لوتکەی شاخەکە، خودی هەوڵدانەکە، پێداگرتن لەسەری و بەردەوامییەکەی، بەسن بۆئەوەی دڵی مرۆڤێك پڕ بکات لە بەختەوەریی، یان لانیکەم پاڵنەرێك بێت بۆئەوەی مرۆڤ باوەڕی بە خۆی و بە ژیان هەبێت، وا لە مرۆڤ بکات بژیی، بەبێئەوەی چاوەڕوانی ئەوەبێت بتوانێت خودی سزاکە یان یاساکانی بگۆڕێت. کامۆ ڕایوایە مرۆڤ پێویستە سیزێف وەك کەسێکی بەختەوەر ببینێت، با ئەم وێناکردنە وێناکردنێکی تەواو ناماقووڵیش بێت. بابەتی سەرەکیی ئەم ئەفسانەیە مەسەلەی بوون و نەبوونی مانایە لە ژیاندا، مەسەلەی بوونی ئامانج و مەبەستە لە ژیاندا یان بێئامانجیی و بێمەبەستیی ژیانە وەك پێدراوێك. بەبۆچوونی من کامۆ لەم بەسەرهاتەدا دەیەوێت بڵێت ڕاستە لەپشتی ژیانەوە مانا و ئامانج و مەبەستێك نییە، ئەوەی هەیە پاڵنان و تلبوونەوەی بەردەوامی بەردەکەیە، بەڵام لەناو ئەم چوارچێوە تایبەتەدا مرۆڤ دەتوانێت مەبەست و ئامانجی بچووك و کۆنکریت و بەرپرسیارانەی هەبێت. ئامانجێك پێویستی بەوەبێت مرۆڤ ژیانی خۆشبوێت بۆ ئەوەی بتوانێت بەردەوامبێت. بەبۆچوونی من کێشەکە لە ناماقوڵی کارەکەی سیزێف خۆیدا نییە، بەڵکو لە ناماقوڵی دونیا بەگشتی و لە ناماقوڵی ڕوداوێکی وەك ڕووداوی لەدایکبوونی سیزێف خۆیدایە. کامۆ لە ئەفسانەی سیزێفدا حوکم بەسەر دونیادا نادات، داوەریی شتەکان ناکات، هەوڵی ئەوەش نادات دونیا بۆ مرۆڤ تەفسیربکات، بەڵکو تەنها وەسفی ژیان دەکات، ئەوەی دەیبینێت دەیگێڕێتەوە و باسیدەکات، وێنەی ژیان دەکێشێت و دواتر وێنەکە بە مرۆڤ نیشانئەدات.
ئەگەرچی بوونی دونیا و بوونی مرۆڤ خۆیان ڕووداوی ناماقوڵ و بێمانان، بەڵام سەرچاوەی سەرەکیی ناماقوڵبوونی دونیا لەوەدایە کە مرۆڤ بەدوای مانای ئەم شتانەدا بگەڕێت، بەردەوام بیەوێت تەفسیری عەقڵانی هەبێت بۆ شتەکان و دیاردەکان. بەبۆچوونی کامۆ دونیا هیچ ماناو ماقوڵیەتێکی ناوەکی تیا نییە تا مرۆڤ بتوانێت بیاندۆزێتەوە و بیانناسێت.

کەس نازانێت دونیا بۆ دروستبووە؟ مرۆڤ بۆ لەدایکدەبێت؟ بۆ لە ساتێك لەساتەکاندا دەمرێت؟  شتەکان بۆ بەو شێوەیە ڕوودەدەن کە ڕوودەدەن؟ بەم مانایە ناماقوڵبوون بەرهەمی گەڕانی مرۆڤە بەدوای ماقوڵبووندا، بەدوای ماناو تێگەیشتندا لەناو ئەو برە زۆرە لە ناماقوڵیدا. دونیا کە مانایەکی ناوەکی نەبێت بیدات بە مرۆڤ، هەموو گەڕانێك بەدوای مانا بۆ بوونی دونیادا گەڕانێکی سیزێفییە، گەڕانێکە بەهیچ خاڵێکمان ناگەیەنێت و هیچ مەبەستێکیش وەدیناهێنێت. لەم گەڕانەدا مرۆڤ پڕە لە پرسیار و گومان و توانای جیاوازی بیرکردنەوە و تەعبیرکردن، لێوانلێوە لە قسەکردن و هاوار و قیژەقیژ، بەڵام دونیا بێدەنگە، کەڕە، ناتوانێت قسەبکات، نە عەقڵی هەیە بیرییپێبکاتەوە و نە زمانێکیش بتوانێت لەڕێگایەوە تەعبیربکات. کارەساتی مرۆڤ لەو ساتەوە دەستپێدەکات کە بوونەوەرێکی ماناگەڕ و مانادۆزە، لەناو دونیایەکی بەتاڵ لەمانادا. وەك چۆن گەڕانی مرۆڤ بەدوای مانادا لەناو دونیادا ناماقوڵە، بەهەمان ڕادە بێدەنگی دونیاش بەرامبەر بە مرۆڤ ناماقووڵە. کێشەکەش لەوەدایە نە مرۆڤ دەتوانێت کۆتایی بەم دۆخە ناماقوڵە بهێنێت و بیکاتە دۆخێکی ماقوڵ، نەخودایەکیش هەیە ئەم کارە بۆ مرۆڤ ئەنجامبدات، نە دونیاش دەتوانێت خۆی بکات بە دونیایەکی ماقوڵ. هیچ هێزێك نییە بتوانێت ئەم دۆخە لە کۆڵی مرۆڤ بکاتەوە و مرۆڤ بخاتە ناو دونیا و دۆخێکی وجودی نوێوە جیاواز لەوەی کە هەیە و لەئارادایە. ئەم دۆخەیە وادەکات مرۆڤی ناماقوڵ و هیچگەرا مرۆڤێکی نائومێدبێت، ئەم نائومێدییەش نائومێدییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی نییە، بەڵکو نائومێدییەکی ئەنتۆلۆژییە، لەناو ئەم یان ئەو سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و فەرهەنگییەوە نایەت، بەڵکو لە بوونی مرۆڤەوە وەك مرۆڤ و لە بوونی دونیا وەك دونیاوە دێت.




کامۆ کە دەست بە نووسینی کتێبی "ئەفسانەی سیزێف" دەکات تەمەنی ٢٥، بیست و پێنج، ساڵ دەبێت. واتە خۆی لەتەمەنێکدایە کە بەشی هەرە زۆری ژیان هێشتا لە پێشیەوەیە، نەك لە پشتیەوە. لە پەیوەندیدا بە ژیانی تاکەکەسی نووسەرەکەیەوە کتێبی ئەفسانەی سیزێف کتێبێك نییە دژ بە ژیان، لە کتێبەکەشدا کامۆ ناڵێت ژیان هیچ نییە و مرۆڤ گیری بەدەست ژیانەوە خواردوە، یان دەیەوێت لە ژیان ڕزگاریببێت. لەباتی ئەمانە کامۆ دەپرسێت:



ئێمە کە ژیانێکی سیزیفیمان پێدراوە پێویستە ئەم ژیانە چۆن بژین؟ کتێبی ئەفسانەی سیزێف باس لەوەدەکات سەرەڕای بێمانایی و ناماقوڵیی ژیان، سەرەڕای ئەوەی مەبەستێکی تایبەتی لەپشتی ژیانەوە بوونی نییە، پێویستە مرۆڤ ژیان بە کامڵیی بژی، بە کامڵیی لەناویدابێت و بەکامڵیش ساتەوەختە جیاوازەکانی ئەزموونبکات. بۆ ئەم مەبەستەش نیوە ژیان و چارەکە ژیان بەس نین، ئەم جۆرە ژیانە بێماناییەکانی ژیان گەورەتر دەکەن، تەنها ژیانی پڕ و کامڵ ژیانێکە مانادار. تاقە شتێك لە ژیاندا مانای هەبێت هەوڵدانی بەردەوامی مرۆڤە بۆ ئەوەی بژی. ناماقوڵیی و بێمانایی ژیان کۆتایی شتەکان نییە، بەڵکو سەرەتای شتەکانە، خاڵی گەیشتن نییە، بەڵکو خاڵی دەستپێکردنە. هەموو ژیان لەدوای ئەو دەرککردنەوە بە بێمانایی و نامقوڵییەوە دەستپێدەکات، ژیانی ڕاستەقینە لەدوای ئەو دەرککردنەوە دەستپێدەکات.
لای کامۆ سیزێف چیرۆکی سڕینەوەی هەموو ئەو وەهمانەیە کە دەشێت لە ژیانەوە بئاڵێن، هەوڵدانە بۆ بینینی ژیان وەك خۆی، بەبێ ماسك و ڕوتوشی ئایدیۆلۆژی و فیکریی، کۆتاییدانانە بۆ ئەو وەهمانەی بە مرۆڤ دەڵێن ژیان مەبەست و مانایەکی دیار یان نادیاریی لەپشتەوەیە، یاخود مەبەست و نیازێك لە پشتی دروستبوونی دونیا و دروستبوونی جیهان و دروستبوونی مرۆڤەوە لەئارادایە. کامۆ ڕایوایە ئەم جۆرەوە همانە لەزۆر شوێنەوە دێنە ناو ژیان، دەشێت لەناو فیکر و فەلسەفەوە بێن، دەشێت لەناو دین و ئایدیۆلۆژیاوە و تەنانەت لەناو هونەر و ئەدەبیاتیشەوە بێن. ئەوەی کامۆ لە سیزێفدا بەرگریی لێدەکات پەیوەستبوونە بە ژیانەوە بە بێ درۆ، ژیان وەك ئەوەی کە هەیە، بێڕتووش و بێماسك و بێپەردە. هەروەها هەڵنەهاتنی مرۆڤیشە لە بێمانایی، ئینکارنەکردنی نەبوونی مەبەست و نیاز و ئومێدە لەپشتی بوونی مرۆڤەوە، بینینی ژیانە لە پلەی سفردا، لەساتەوەختی دەرکەوتنیدا لەناو هەقیقەتی خۆیدا وەك پێدراوێکی بێمەبەست. سیزێف هێمایە بۆ ئەو ساتەوەختەی ژیان و هێمایە بۆ ئەو هەقیقەتە سادەیەی مرۆڤبوون کە بەتاڵکراوەتەوە لەوەهمە فیکری و دینی و هونەریی و ئایدیۆلۆژییەکان. مرۆڤی سیزێفی مرۆڤی ڕووتی ناو دونیایەکی ڕووتە، مرۆڤێ بێماسکی ناو دونیایەکی لەماسك داماڵدراوە، کەسێکە دەزانێت ژیان تەنها یەك دیوی هەیە و ئەودیوی نییە. ئەوەی هەیە هەر ئەوەیە، هەر لەدایکبوون و گەورەبوون و مردنە.



ئەدەبی بەردەم

بەم مانایە مرۆڤی سیزێفی مرۆڤێکە بەبێ حیکایەتی گەورە، بەتاڵ لە ئایدیۆلۆژیا، مرۆڤێکە بەبێ دین. هاوکات مرۆڤێکە تەنها و نائومێد، بەڵام ئامادە لەناو ژیاندا و گەڕۆك بەدوای بەختەوەریدا. ئەم مرۆڤە سیزێفییە، کە جگە لە تەنهایی خۆی و جگە لە تاکێتی خۆی لەبەردەم جیهاندا، هیچیتری نییە بە خۆی و بە دونیای بدات، هاوکات ناشیەوێت بەهیچیترەوە سەرقاڵبێت. کەسێکە چەندە تەنهایە، ئەوەندە تەنهایی خۆی بۆ ئاستی تاقە مەسەلەی سەرەکی ژیانی بەرزکردۆتەوە. ئەم دۆخەیە وادەکات مرۆڤی سیزێفی مرۆڤێك یاخی نەبێت، یان یاخیبێت بەوەی کە ناماقوڵی ژیان و سزاکانە نەتوانن تەرکی ژیانی پێبکەن، ناچاریکەن بە خۆکوشتن، یان بەتفکردنێکی قووڵ و خەست لە ژیان.

## ڕۆمانی تاعون و لەدایکبوونی ئینتیمای ئینسانی

ئەو دونیا سیزێفییە و ئەو دونیا ناماقوڵەی مێرسۆ لە ڕۆمانی غەریبدا پێوەی سەرقاڵە لە ڕۆمانی تاعوندا گۆڕانی بەسەردادێت. ڕۆمانی تاعون ڕۆمانی شارێکە گیرۆدە بەدەست نەخۆشی تاعونەوە، چیرۆکی کاردانەوە و بەرەنگاربوونەوەی مرۆڤەکانە بەرامبەر بەو پەتا کوشندەیە. زۆرێك لە شارەزایانی فیکرو ئەدەبیاتی ئەلبێر کامۆ پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە تاعون لە ڕۆمانەکەدا هێمایە بۆ فاشیزمی ئەوروپی ساڵانی جەنگی جیهانی دووهەم. کامۆ ئەم ڕۆمانە




لە ساڵای ١٩٤٧دا دەنووسێت و ڕۆمانەکە باسێکی وردی دونیای ئەو سەردەمەیە. لە ڕۆمانەکدا شاری ئۆران شارێکە ڕووبەڕووی تاعون دەبێتەوە، لەسەرەتادا خەڵکی شارەکە هەڵوێستێکی بێباکانە و دوورە پرێزانە لە نەخۆشییەکە وەردەگرن و مردنی لەسەرخۆ و هەنگا و بە هەنگاویی مرۆڤەکان سەرنجیان ڕاناکێشێت، بەڵام وردەوردە ئەم هەستە بەهێزدەبێت و لە ساتێك لە ساتەکانیشدا بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە، شارەکە لەدونیای دەرەوە دادەبڕدرێت. دوای ئەمە ئیتر هەڵوێستی مرۆڤەکان گۆڕانی تەواوەتی بەسەردادێت و پرۆسەی بەگژاچوونەوەی ڕاستەقینەی نەخۆشییەکە دەستپێدەکات. ئەوەی ڕۆمانەکە وەك خاڵێکی سەرەکی جەختی لێدەکات و نیشانئەدات چۆنیەتی گۆڕانی لەسەرخۆی هەڵوێستی شارەکەیە بەرامبەر بە نەخۆشییەکە. لەسەرەتادا گوێپێنەدان و چاونووقاندن، دواتر



ئینکارکردنی بوونی نەخۆشییەکەیە، دوای ئەوە بەرەنگاربوونەوەیەکی نائومێدانەی نەخۆشییەکەیە، لە کۆتاییشدا سەرکەوتن بەسەر نەخۆشییەکەدا. دوای ئەوەی ئەم جەنگە لەگەڵ تاعوندا لە شارەکە ساڵێك دەخایەنێت ئیتر لەدەرەوەی شارەکەوە یارمەتی و کۆمەك دێت و شارەکە لە تاعون ڕزگاردەکرێت.
کاراکتەرەکانی ناو ئەم ڕۆمانە کارادانەوەی جیاواز بەرامبەر بەچۆنیەتی مامەڵەکردنی پەتاکە نیشان ئەدەن هەندێکیان هەر لەسەرەتاوە دەکەونە بەگژاچوونەوەی نەخۆشییەکە، وەك دکتۆر روکس، **Rieux**، هەندێکیای تریان دۆخەکە بەکاردەهێنن بۆئەوەی دەوڵەمەند ببن لەڕێگای بەقاچاغ دەرکردنی خەڵکەوە بۆ دەرەوەی شارەکە بە پارە، کەسانێکی تر پەرە بە دین و دینداری دەدەن و پەتاکە وەك سزای خودا بۆ گوناهەکانی شارەکە وێنادەکەن و دەیانەوێت لەڕێگای دینەوە پێگەی خۆیان وەك کەسایەتی دینی بەهێزبکەن. لە ڕۆمانی تاعوندا کەسایەتی ڕۆژنامەنووسێك ئامادەیە بەناوی **Raymond Rambert**، کە خەڵکی شارەکە نییە و بۆ نووسینی ڕاپۆرتێك لەسەر هەلومەرجی ژیانی عەرەبەکان لەو شارەدا چووە بۆ ئەوێ. گۆڕانی هەڵوێستی ئەم کەسایەتییە لەناو ڕۆمانەکەدا یەکێکە لە خاڵە هەرە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ڕۆمانەکە. ئەم ڕۆژنامەنووسە کاتێك بۆی دەردەکەوێت تاعون لە شارەکەدا بڵاوبۆتەوە، هەموو هەوڵەکانی لەوەدا کورتدەکاتەوە خۆی ڕزگاربکات و بەسەلامەتی شارەکە بەجێبهێڵێت. بۆیە پلانی دانانی هەڵاتنێکی قاچاغ لەشارەکە دادەڕێژێت، لە ساتێك لە ساتەکایشندا هەلی ڕاکردن و خۆڕزگارکردنی بۆ دروستدەبێت. کەچی کاتێك پێویستە ڕابکات بڕیارەکەی دەگۆڕێت و بڕیارئەدات لە شارەکەدا بمێنێتەوە و لەگەڵ دکتۆر روکسدا بەگژ تاعونەکەدا بچێتەوە. گۆڕانی کەسایەتی ڕۆژنامەنووسەکە و گۆڕانی کاردانەوەکەی بەرامبەر بە پەتای ناو شارەکە پەیامی سەرەکی ڕۆماناکەیە. کامۆ لەڕێگای کەسایەتی ئەم ڕۆژنامەنووسەوە بەرگریی لە پابەستبوون و ئیلتیزامی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەکات بەرامبەر بەو ژینگەیەی لەناویدا دەژین، بەرامبەر بەو دونیا هاوبەشەی کەسەکان لەگەڵ یەکتردا بەشیدەکەن. کامۆ بڕیاری بەجێنەهێشتنی شارەکە و بەرەنگاربوونەوەی تاعونەکە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەکەوە، وەك هەڵوێستێکی ئەخلاقی نموونەیی نیشان ئەدات کە قابیلی بەرگریلێکردنە. بۆ تەفسیرکردنی ئەم گۆڕانە لە هەڵوێستی خۆیدا، ڕۆژنامەنووسەکە باس

لەوەدەکات پێی شەرەمە ئەو خۆی وەك تاکەکەسێك دەربازبکات و وەك تاکە کەسێك بەتەنها بەختەوەرببێت لەکاتێکدا ئەوانیتر لەناو تاعونەکەدا نووقمن. پێیوایە مایەی شەرمەزارییە ئەو وەك تاقە کەسێك بتوانێت بەختەوەر بژی لەکاتێکدا دونیای دەوروبەری ئەو لەناو مردن و گرفت و نابەختەوەریدا نووقمە. لەڕێگای کاراکتەری ئەم ڕۆژنامەنووسەوە کامۆ دەیەوێت بە خوێنەران بڵێت، بەختەوریی شتێك نییە مرۆڤەکان لەتەنهای خۆیاندا پێیبگەن و ئەزموونی بکەن، بەختەوەری پرۆژەیەکی پێکەوەیی و دەستەجەمعییە، بەشێکە لەژیان لەگەڵ ئەواینتردا. ڕۆمانی تاعون کتێبێکی ئەخلاقییە، یان کتێبێکە دەربارەی ئەخلاق، دەربارەی ئەوەی ئەو شتە چییە کە مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ؟ چییە ئەو شتانەی نەگۆڕن و بەشێکن لە مرۆڤبوونی مرۆڤ لەهەموو شوێنێکدا؟ پێموایە وەڵامی کامۆ بەم پرسیارانە لەو ڕۆمانەدا تەواو ئاشکرایە: ئەوەی مرۆڤەکان دەکات بە مرۆڤ، بوونی تاکەکەسی و خەباتی تاکەکەسی خۆیان نییە، وەك لە سیزێفدا بینیمان، بەڵکو ئینتیمایەکی ئینسانی قووڵە بۆئەو پرۆژە دەستەجەمعییەی ناوی مرۆڤایەتییە، ناوی شارە، ناوی کۆمەڵگایە. ئینتیما بۆ مەسەلە گشتییەکان، بۆ ئەو شتەی کە دەشێت، لە شوێنی جیاوازدا ناوی جیاوازی لێبنێین، ئەو شتەیە کە دەمانکات بە مرۆڤ. وەك لەسەرەتادا وتم تاعون لەم ڕۆمانەدا ڕەمزی نازیزم و فاشیزمە. کاردانەوەی یەکەمی کۆمەڵگا بەرامبەر بە فاشیزم بریتییە لە نکوڵیکردن لەوەی



که مەترسییەکە و بەرێوەیە، ئەم نکوڵیکردنە خۆدزینەوەیە لەو ڕاستییەی کە دونیایەکی ترسناك و نەخۆش دروستبووە کە دونیایەی نازیەت و فاشیەتە. یەکەمین کاردانەوەکان بریتییە لە هەڵاتن لە فاشیزم لەڕێگای نەبینین و نکوڵیلێکردنەوە. بەرەنگاربوونەوەی ئەم تاعونە لەسەرەتادا چەند کەسێکی کەم پێیهەڵدەستن، هەندێك لە مرۆڤەکان دەتوانن خۆیان بدزنەوە و لە تاعونەکە دەربازبن و ڕابکەن، بەڵام ناتوانن لە بەرپرسیارێتی خۆیان وەك مرۆڤێك ڕابکەن. مرۆڤەکان لەم ڕۆمانەدا مرۆڤبوونی خۆیان لەناو شەڕکردن لەگەڵ تاعون و لەپاڵ بەگژاچوونەوەی ئەو تاعونەکەدا دەدۆزنەوە و پیادەدەکەن. هەڵاتن لە تاعون مرۆڤبوونی ئەوان دەگۆڕێت بە تاعون، لەوەیان دەخات مرۆڤبن و دەیناکات بە تاعونێك وەك تاعونەکە ترسناك. لەم ڕۆمانەدا مرۆڤبوون مانای



پەڕینەوە لە خودێکی تاکەکەسییەوە بۆ پەیوەستبوون بەو مەسەلانەوە کە بەهای گشتی و پێکەوەیی گرنگیان هەیە. ئەو بەها سەرەکییانەش کە ڕۆمانی تاعون بەرگریان لێدەکات بەهای هاریکاریی، پێکەوەبوونی دەستەجەمعی، بەرگریی، کۆڵنەدان و هەڵنەهاتن و خۆنەدزینەوەیە. هەموو ئەمانەش مەسەلەی ئیلتیزام و ئینتیما دەکەن بە مەسەلەی سەرەکی ناو ژیانی مرۆڤەکان.

بەڵام ڕۆمانی تاعون، وەك کارەکانی تری بەر لەو ڕۆمانە، درێژە کۆتایی بە ڕوانینی کامۆ بۆ ژیان وەك ناماقوڵێکی گەورە ناهێنێت، بەڵکو درێژە بەو ڕوانینە ئەدات. لەدیدی کامۆدا ئەو تاعونەی لەشارەکەدا بڵاودەبێتەوە و دەتوانێت لەهەر ساتێکدا هەر کەسێکی بوویت بکوژێت، بڵاوبوونەوەی ئەو هەموو مردنە و کۆتایی ئەو هەموو ژیانە ڕووداوێکی تەواو ناماقوڵە، ماناو مەبەستێکی دیاریکراویان لەپشتەوە نییە. تاعونەکە ڕووداوێکە دێت و ڕوودەدات و دەسکارییەکی قوڵی ژیانی مرۆڤەکان دەکات بەبێ ئەوەی ماناو مەبەستێك لەپشتی دروستبوون و بڵاوبوونەوەی ئەو تاعونەوە هەبێت.

## مرۆڤی یاخیگەر

لە کتێبی "مرۆڤی یاخیی"دا کامۆ درێژە بە تێزی یاخیبوون و ئینتیما و بەرپرسیارێتی ئەدات و ئەمجارەیان لەباتی "مرۆڤی ناماقوڵ" مۆدێلی "مرۆڤی یاخیی" پێشنیاردەکات. کامۆ ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٥١ دەنووسێت و بڵاودەکاتەوە. یاخیبوون لەم کتێبەدا کەمتر یاخیبوونی کۆمەڵایەتی و زیاتر یاخیبوونی تاکەکەسییە، کەمتر سیاسی و زیاتر ئەخلاقییە، کەمتر لەدەوری پرۆژەیەك بۆ ئێستا و بۆ ئایندە کۆدەبێتەوە، زیاتر "نا" گوتنێکی تاکەکەسییە دژ بەوەی بەناوی ئایندەیەکی ئایدیالیستییەوە قسەدەکات بۆئەوەی ڕەوایەتی بە کۆمەڵێك کردەی نەشیاو لە ئێستادا ببەخشێت. بەڵام پێداگرتن لەسەر یاخیبوونی مرۆڤ لێرەشدا مانای کۆتایی بیرۆکەی "ناماقوڵ" لە فیکری کامۆدا ناگەیەنێت، یاخیبوون لێرەشدا یاخیبوونی مرۆڤە لە دونیا کە دونیایەکی ناماقوڵی خاڵی لە مەبەست و مانایە. لێرەشدا یاخیبوون یاخیبوونی مرۆڤە وەك گەڕۆکێك بەدوای مانادا، وەك کەسێك ناتوانێت بەبێ مانا بژی، بەڵام لە دونیایەکدا کە نە خۆی مانادارەو نە مانایەکیش بەبوونی مرۆڤەکان دەبەخشێت. لە دیدی

کامۆدا دونیا لەڕێگای بێمانایی خۆیەوە غەدرێکی گەورە لە مرۆڤ دەکات، یاخیبوون بریتییە لە کردەی ڕووبوونەوەی ئەو غەدرە.
لای کامۆ مرۆڤی یاخیگەر ئەو مرۆڤەیە کە دەڵێت "نا"، هەڵگری کردەی بەرگرییە بەرامبەر بە دونیا، بەڵام هەم "نا"وتنەکەی و هەم بەرگرییەکەی دوو کردەی ڕووتن لە ئایدیۆلۆژیا، لە هەستکردنێکی ئەخلاقییەوە دێن کە مرۆڤ لەناوەوە بەرەو کردەی یاخیبوون ئاراستەدەکەن، نەك لە ئیشکردن بۆ پیادەکردنی ئایدیالێکی سیاسیی یان کۆمەڵایەتیی گەورە. یاخیبوون لێرەدا یاخیبوونە بەبێ ئایدیۆلۆژیا، بەبێ حیکایەتێکی گەورە کە بەناوی هەقیقەت یان بەناوی زانست و شۆڕش و ڕزگاریی و ئایندەیەکەی زێڕینەوە قسەبکات. ئەم یاخیبوونە هاوکات یاخیبوونێکە بەبێ کردەی توندتیژیی، بەبێ مافی کوشتنی ئەوانیتر، بەبێ بیرۆکەی "توندوتیژیی شۆڕشگێڕانە"، تەنانەت بەبێ بیرۆکەی شۆڕش خۆشی. ڕەخنەکردنی توندوتیژیی لە کتێبی "مرۆڤی یاخیی"دا بەشێکە لە کردەی بەگژاچوونەوەی سەرجەمی ئەو ئایدیال و نموونە باڵانەی کە بەناوی پیادەکردنی ئەو ئادیالانەوە ڕەوایەتی بە کوشتنی مرۆڤەکانی تر دەبەخشن. ئەم کتێبە بەرگری لەو بۆچوونە دەکات کە هیچ مەسەلە و ئایدیال و شۆڕشێك لە ژیانی مرۆڤ خۆی بەهادارتر نییە، کەس مافی کوشتنی مرۆڤی تری نییە، کوشتنی مرۆڤەکان لەپێناوی مەبەستە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا هیچ ڕەوایەتییەکی ئەخلاقییان نییە.
ئەم ڕوانینە تایبەتانە بۆ مرۆڤ و شۆڕش و ئایدیالی سیاسی و مێژوو، ڕوانینی دوای ئاشکرابوونی تاوانە گەورەکانی جەنگی جیهانی دووهەم بەگشتیی و تاوانی کۆشتنی بە کۆمەڵی جولەکەکانە لە هۆڵۆکۆستدا، بەتایبەتی. هەروەها ڕوانینی دونیای دوای ئاشکرابوونی ئۆردوگا زۆرملێ و تۆقێنەرەکانی ستالینە لە سیبریا. هاوکات کتێبی "مرۆڤی یاخیی" کتێبی دونیای دوای ڕزگاربوونە لە نازییەت، دونیای ئامادەگی بیرۆکە و پراکتیکی تۆڵەسەندەوە لەوانەی دەستیان لەگەڵ نازییەتدا تێکەڵکردبوو. ئەم کتێبە ئەوەندەی کتێبێکە دژ بە "کوشتن"و "تاوانی سیاسی" ئەوەندە کتێبێك نییە دژ بە هەوڵدانی مرۆڤ بۆ گۆڕینی دونیا. ئەوەی ورد ئەم کتێبە بخوێنێتەوە لەوە تێدەگات کامۆ وەڵامێکی بنبڕو قەتعی بە مەسەلەی ڕەوایەتی بەکارهێنان یان نەهێنانی توندوتیژی ناداتەوە. پرسیارەکە ئەوەیە



ئایا دەکرێت دونیا بگۆڕدرێت بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژیی؟ ئەوەی لەم کتێبەی کامۆدا ئامادەیە ئایدیۆلۆژیای دژەتوندوتیژیی یان ناتوندوتیژیی "گاندی"یانە نییە، کامۆ وەك گاندی بە ئاشکرا دژایەتی توندوتیژیی و پەنابردن بۆ ناتوندوتیژیی ناکات، وردتر بدوێین، لای کامۆ بەپێچەوانەی گاندییەوە دژایەتیکردنی توندوتیژیی نەبووە بە ئایدیۆلۆژیا، ئەوەی هەیە ڕەخنەکردنێکی ئەخلاقییانەی ئەو شێوازانەی توندوتیژییە کە لە مێژووی شۆڕش و جەنگە هاوچەرخەکاندا بەکارهاتووە. کە ئەمە دەڵێم هاوکات دەبێت جەغت لەو خاڵەش بکەمەوە کە ڕوانینی کامۆ بۆ توندوتیژیی ئەو ڕوانینە مارکسییە نییە کە توندوتیژی وەك "مامانی مێژوو" وێنادەکات و پێیوایە هیچ گۆڕانکارییەکی گرنگ لە مێژوودا بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی ڕوونادات. ڕوانینی کامۆ بۆ توندوتیژیی لەم کتێبەدا لەشوێنێکدایە لە نێوان گاندی و مارکسدا، بەبێئەوەی خوێنەر تێبگات داخۆ بە قەتعی کامۆ لەکامیان نزیکە و چ ڕوانینێکی بۆ گۆڕانکاریی



و ڕۆڵی توندوتیژیی لە پیادەکردنی گۆڕانکارییە مێژووییەکاندا هەیە. لە "مرۆڤی یاخیی"دا کامۆ تەنها کێشەی لەگەڵ کوشتنی مرۆڤدا نییە، بەڵکو لەگەڵ سڕینەوەی یادەوەری ئەو کوشتنەیشدا هەیە، لەگەڵ ئەوەدا چۆن مرۆڤ لەگەڵ بیروەرییەکانی کوشتندا بژی. کوشتنی مرۆڤ بۆشاییەکی وا دروستدەکات کە مرۆڤ ناتوانێت بەهیچ شێوەیەك پڕیبکاتەوە. کتێبی "مرۆڤی یاخیی" کتێبێکە دژ بە مێژووی هاوچەرخی خۆرئاوا لەسەردەمی شۆڕشی فەرەنسییەوە تا دونیای دوای ڕووداوەکانی هۆڵۆکۆست و جەنگی جیهانی دووهەم و تاوانەکانی ستالین. کتێبکە کتێبی گومانە لە شۆڕشەکان و لە بەهاکانیان. بەباوەڕی کامۆ ئەگەرچی شۆڕشەکان بە ئامێزکردنەوە و بەرگریکردن لە فیکرەی ئازادیی و دادپەروەریی دەستپێدەکەن، شۆڕشگێڕەکان ئازادیی و دادپەروەریی وەك دوانەیەکی لێکجیانەکراوە وێنادەکەن، بەڵام هەمیشە ساتێك دروستدەبێت کە بۆ پیادەکردنی دادپەروەریی شۆڕشگێڕان ناچاربن هەندێك شت بکەن کە ڕێگرن لەبەردەم ئازادیدا و هۆکارێکبن بۆ دواخستنی ڕزگاریی مرۆڤ. کامۆ پێیوایە ئەو جۆرە ساتە بەردەوام ساتەوەختی هاتنەکایەی تێرۆر و توندوتیژییە،

کەسانێك پەیدادەبن بەناوی دادپەروەریی و ئازادییەوە کوشتنی کەسانیتر بە کردەیەکی پێویست و دادپەروەر دادەنێنن. لەم دیدەوە ئەلبێر کامۆ بەدرێژیی باس لە ڕووداوەکانی شۆڕشی فەرەنسی و ڕۆڵی ڕۆبسپێر و سان جۆست لەو ڕووداوانەدا دەکات، ڕۆڵێك تیایدا بەکارهێنانی توندوتیژی و کوشتن و تێرۆر لەپێناوی ئازادیداوەك کارێکی پێویست و شەرعی وێنادەکرێت و ڕەوایەتی سیاسی و ئەخلاقی پێدەبەخشرێت. ئیدی لێرەبەدوا کوشتن بەناوی پرنسیپێکی گەورەوە، کوشتن بەناوی فیکرەیەك یان ئایدیالێکەوە، کوشتن بەناوی لۆژیکی مێژووەوە، کوشتن بەناوی بەرپاکردنی گۆڕانکارییەوە، دەبێت بە کردەیەکی ڕەواو دەشبێت بە بەشێکی گرنگ لە مێژووی سەدەی بیستەم.

## کامۆو فەلسەفەی کوشتن

لەسەرەتای کتێبی مرڤی یاخییدا کامۆ باس لە شێوازە جیاوازەکانی کوشتن لە مێژووی مرۆڤدا دەکات، ئەو خاڵەی بەلای ئەوەوە شوێنی لەسەرڕاوەستانە ئەو ڕاستییەیە کە لە دونیای ئەمڕۆدا فەلسەفەیەك بۆ کوشتن دروستبووە کە پێشتر لە مێژووی مرۆڤدا بوونی نەبووە. کوشتن لەدونیای ئەمڕۆدا کردەیەك نییە تەنها پیاوکوژەکان پێیهەستن، بەڵکو بەشێکە لە شێوازێکی تایبەتی بیرکردنەوەش لە دونیا، بەشێکە لە فیکر، بووە بەجۆرێك لە فەلسەفە. لەم فیکرو فەلسەفەی کوشتندا، وەك کامۆ دەڵێت، پیاوکوژەکان لە پیاوکوژەوە دەبن بە داوەر.(٦) لە تاوانبارەوە دەبن بە کەسانێك بەناوی ڕوانینێکی تایبەتەوە بۆ مێژووو لێکدانەوەو تەفسیرێکی تایبەتی دونیاوە دەدوێن. ئەوەی کامۆ بە پلەی یەکەم دژایەتی دەکات ئەم بە فەلسەفەکردنەی کوشتنە، دۆزینەوەی ڕەوایەتی فیکرییە بۆ مرۆڤ کوشتن بەناوی دروستکردنی دونیایەکی نوێوە. کاری ئەم شێوازە لە فیکر ئەوەیە مەعقولیەت بە کوشتن بدات، بیکات بە کارێکی عەقڵانی، لەوە دەرییبکات تاوانێك بێت بەرامبەر بە مرۆڤ و بەس، یان دەرەنجامی هەڵچوونێکی دەرونی، یان ڕق، یان حەزێکی نەخۆشانەبێت لە کوشتن. بەپێچەوانەوە ئەم شێوازە لە فیکر کوشتن دەکات بەبەشێك لە پرۆژەیەکی ئایدیالیی و نموونەیی گەورە، پرۆژەیەکی "ڕاقی" و "پێشکەوتوتر" بۆ بەرهەمهێنانی مرۆڤی باڵاتر و مرۆڤایەتیی مرۆڤانەتر. کوشتن لێرەدا دەبێت بە بەشێك لە تیورەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە مژدەی دروستکردنی دونیایەکی باشتر و جوانتر و مرۆڤی



باشتر و پێشکەوتوتر ئەدات.
ئەم گرێدانەی کوشتنی مرۆڤ بە فیکر و تیورە و پرۆژەی سیاسی و کۆمەڵایەتی گەورەوە، وادەکات کوشتن چیتر تەنها ڕوداوێکی ناوازە و لاوەکی نەبێت، تەنها هێما بۆ تێکچوونێکی دەرونی و ئەخلاقیی کاتی و دیاردەیەکی پەراوێزیی نەکات، بەڵکو دەیکات بە بەشێك لە چالاکییە سەرەکییەکانی مرۆڤ بۆ دروستکردنی دونیایەکی نوێ بەپێی کۆمەڵێك نەخشەی فیکریی و تیوریی و ئایدیۆلۆژیی تایبەت. ئەم دۆخەیە وادەکات کوشتن لەسەدەی بیستەمدا جیاوازبێت لە کوشتن لە سەدەکانی تردا، هەر ئەمەشە وادەکات لە ماوەی پەنجا ساڵی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هەفتا ملیۆن مرۆڤ بکوژرێت. بەکورتی ئەوەی لە سەدەی بیستەمدا دەگیرێت بوونی کوشتنە بە بەشێك لە پرۆگرامی دروستکردنی کۆمەڵگا و دونیایەکی نوێ، ئەمەش جیاوزە لە کردەی کوشتن لە سەدەکانی بەر لەسەدەی بیستەمدا. لە دونیای



کۆندا تاوانی دەسەڵاتداران وەك تاوان دەبینرا، ویژدانی مرۆڤەکان کوشتن و بڕینەکانی وەك کوشتن و بڕین و تاوانی ڕووت سەیردەکرد، بەڵام لە دونیای تازەدا کوشتن چیتر وەك تاوان نابینرێت، بەڵکو وەکو ڕێگایەك بۆ گەیشتن بە ئازادیی و دادپەروەریی وێنادەکرێت،وەك ئامرازێك بۆ وەدیهێنانی مرۆڤایەتییەکی بەرزتر و باڵاتر لەو مرۆڤایەتییەی لە ئێستادا لەئارادایە. بەم شێوەیە تاوانەکان چیدی وەك تاوان وێناناکرێن، بەڵکو بەرگی "بێتاوانی" و "بەرائەت" لەبەردەکەن و وەك بەشێك لە پرۆگرامی گۆڕانکارییەکی بەنرخ و باڵاتر دەبینرێن.(٧)

## ناماقوڵ و کوشتن

بیرۆکەی ناماقوڵ لە فیکری کامۆدا، بیرۆکەی ئەوەی دونیا دونیایەکی بێمەبەست و بێمانایە، هەڵگری ڕەهەندێکی گرنگە دژ بە کوشتنی مرۆڤ. لەپشتی فیکرەی ناماقوڵەوە جۆرێك لە دژایەتیکردنی کوشتنی مرۆڤ هەیە لەپێنای ئەم یان ئەو دید و ئایدیا و دین و نادیندا. نەبوونی هیچ مانایەك لە پشتی دونیاوە ئەو پێوەرە لە مرۆڤ دەسێنێتەوە کە بکرێت بەهۆیەوە مانایەك بە کوشتن ببەخشرێت. ئەگەر دونیا دونیایەکی بێلۆژیك و بێمەبهست بێت، ئەگەر مانایەك لەپشتی بوون و ئامادەگی ئێمەوە

لە دونیادا بوونی نەبێت، ئەو دەم مانایەك بۆ كوشتن نامێنێتەوە مرۆڤ بتوانێت بەرگری لێبكات، یان لۆژیكێك بۆ كوشتن مرۆڤ پەنای بۆببات بۆ بەخشینی ڕەوایەتی بە كوشتنی مرۆڤەكان. ئەگەر دونیا دونیایەكی ناقوڵبێت هەموو هەوڵدانێك بۆ كوشتنی مرۆڤ لەپێناوی پیادەركدنی ئەم یان ئەو دید و ڕوانینی دیاریكراودا تاوانێكە بەرامبەر بە مرۆڤ. ئەگەر دونیا ناماقوڵبێت چ ماقوڵیەتێك لە كوشتنی مرۆڤەكاندا هەیە؟ بەمجۆرە دەبینین لەناو بیرۆكەی ناماقوڵ خۆیدا بیرۆكەی دژە كوشتنی مرۆڤ ئامادەیە. ئەگەر ماناو لۆژیك لە بنەڕەتەوە لەناو دونیادا بوونیان نەبێت، بێگومان ئەودەم كوشتنیش مانای نابێت. بێگومان مرۆڤ دەشێت و دەتوانێت مرۆڤی تر بكوژێت، بەڵام ناتوانێت مەبەست و مانا و لۆژیكێكی ماقوڵی پێببەخشێت. گرنگی فەلسەفەی ناماقوڵ لای كامۆ لەوەدایە كە ناهێڵێت پێوەرێك یان تیورەیەكی لۆژیكی بۆ كوشتن دروستببێت. مادام دونیا لەبەردەم پرسیار و گومانەكانی مرۆڤدا بێدەنگە، مادام شتێك نییە پێمانبڵێت ڕاستی ڕەها كامەیە و ماناكانی بوون و ژیان چین، بۆیە ناكرێت هیچ مانایەك بۆ كوشتنی مرۆڤ لەئارادابێت و هیچ ئەرگومێنتێكیش بتوانێت ڕەوایەتی پێببەخشێت. بەم جۆرە باوەڕهێنان بە عەبەس و ناماقوڵ دەتوانێت هەنگاوێكی گرنگبێت لە كۆتایهێنان بە كردەی كوشتنی بەمەبەست و كوشتنی ئایدیۆلۆژیی، كوشتنێك بەهانەی تیوریی و لۆژیكی بۆ هێنرابێتەوە و لەم ڕێگەیەوە ڕەوایەتی پێبەخشرابێت.

یەكێك لە ڕەهەندە گرنگەكانی ناماقوڵ لە فیكری كامۆ و لای زۆرێك لە بوونگەراكانی تریش ئەوەیە كە مرۆڤ بەرەو یەقین و باوەڕی نەگۆڕ و هەمیشەیی نابات، بەڵكو بەرەو پرسیار و گومانی هەمیشەیی دەبات، بەرەو گومانێك كامۆ وەك "گومانی میتۆدی" لای دیكارت وێنایدەكات. گومانی میتۆدی مانای دۆخی گومانكردنی بەردەوام لەهەموو شتێك تا ئەو كاتەی بوونی ڕاستەقینەی ئەو شتانە دەسەلمێنردێت. ئەمە وادەكات ناماقوڵ دۆخێكی عەقڵی و دەرونیی بێت كە هەمیشە مرۆڤ لەسەرەتادا دابنێت، هەمیشە لە شێوەی پرسیاردا دەربكەوێت، هەوڵێكبێت بۆ پشكنینی مرۆڤ بۆ خودی خۆی، بۆ پیاچووبەوە بە ڕاستی و دروستی بڕیار و ویست و خواست و هەڵبژاردنەكانیدا. ناماقوڵ لەم ئاسەتدا پشكنینی بەردەوامی خودە بۆ خود خۆی لەپێناوی بەردەوامیداندا بە پرسیار و گومانەكاندا. ئەمە وادەكات بیرۆكەی ناماقوڵ لای كامۆ بە قووڵی بە بیرۆكەی یاخیبوونەوە ببەسترێتەوە، وەك پێشتریش وتم كتێبی "مرۆڤی



یاخیی" کتێبێك نییە لە ناماقوڵ دابڕابێت، بەڵکو کتێبی قووڵکردنەوەی ڕوانینی کامۆیە بۆ ناماقوڵ و گەیاندنیەتی بەدۆخی پشکنینی بەردەوای مرۆڤ بۆ بیر و بۆچوون و هەڵوێست و خەون و خولیاو ئاکارەکانی و داڕشتنەوەیان بەوجۆرەی مرۆڤ بتوانێت هەم "نا" بڵێت بەرامبەر بەو دونیایەی تیایدا دەژی، هەم خاوەنی کۆمەڵێك بەهابێت کە دەیباتەوە ناو ئازارو بەرپرسیاریەتییەکانی مرۆڤ وەك مرۆڤ. یاخیبوون لێرەدا تەنها کردەیەکی سیاسی و ئینسانی نییە، بەڵکو کردەیەکی خودیی ناوەکییە، یاخیبوونە بەڕووی هەموو ئەو شتانەدا کە خود ئەزموونی نەکردوون و ماناکانیان نەژیاوە و پرسیاریی لێنەکردوون. بەشێکە خۆدۆزین و گەڕان بەدوای دونیا ناوەکییەی مرۆڤ خۆیدا. قبووڵنەکردنی وەڵامە حازر و ئامادەکان و قبووڵنەکردنی لۆژیکی باڵادەست و ئەو خواستانەیە کە دونیا دەیەوێت بەزۆر تاکەکەسیدا بسەپێنێت. وەك کامۆ دەڵێت لەپشتی یاخیبوونەوە هەمیشە هەستێك بە دادپەروەریی و بە هەق هەیە. هەقێك کە مرۆڤ پێیوایە نابێت و هەقنییە پێشێلبکرێت و بێڕێزانە مامەڵەبکرێیت، نابێت پێ بەسەردا بنرێت و نرخی بۆ دانەنرێت. ئەمەش مانای ئەوەی کردەی یاخیبوون تەنها کردەیەك نییە پەیوەست بە جەستەوە و بە تێپەڕاندنی سنووره قبووڵکراوەکانی ئازاردانی جەستەوە. یاخیبوون تەنها دەرەنجامی گەیشتنی ئازار و فشار و زۆر بۆهێنانی فیزیایی بە خاڵێك نییە کە مرۆڤ چیتر نەتوانێت لەڕووی جەستەیی و دەروونییەوە ئەو ئازارو فشارە قبووڵبکات، بەڵکو پابەستی هەستێك و وێناکردنێکی دیاریکراویشە دەربارەی ئەوەی چی هەقە و چی ناهەقە. لەپشتی یاخیبوونە هەم ئازار و هەم هەستکردن بەناهەقی ئامادەیە. یاخیبوون دەرەنجامی گەیشتن ئەو خاڵەیە کە تیایدا چیتر ناهەقی قابیلی قبووڵکردن نییە. بێگومان ئەوەی پێماندەڵێت چی هەقە و چی ناهەق هۆشیاریی و ویژدانی مرۆڤە، ئەوە هۆشیاریی و ویژدانن پێماندەڵێن سنوورەکانی هەق و ناهەق کامانایە، تا کوێ شتەکان قابیلی قبووڵکردن و لەکوێدا قابیلی قبووڵکردن نیین. واتە لەپشتی کردەی یاخیبوونەوە جۆرێك لە هۆشیاریی و وێناکردنێکی تایبەت بۆ مرۆڤبوون هەیە کە بە مرۆڤ ئەڵێن تا کوێ دونیا قابیلی قبووڵکردنە و لەکوێدا پێوستە



مرۆڤ بەڕووی ئەو دونیایەدا یاخیببێت. ئامادەگی ئەم جۆرە هۆشیارییە لەناو مرۆڤدا هێما بۆ ئەوە دەکات کە شتێك لە ئینساندا هەیە ئازیز و بەهادارە، شتێك مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ، بەو بوونەوەرە کە خۆی بە خاوەن وژیدان و ڕێز و کەرامتە دەزانێت، شتێکی ناوەکی مرۆڤ دەتوانێت باوەشی پیادابکات، لەگەڵیدا ببێت بەیەك و بە مرۆڤ بڵێت تۆ شایستەی ئەو مامەڵەیە نیت کە دەکرێیت یاخود، تۆ نابێت ئەو سووکایەتیانەت بەرامبەر بکرێت. لای کامۆ ئەم شتە، ئەم شێوازە لە هەستکردن و بیرکرندەوە، بەسراوەتەوە بە بوونی کۆمەڵێك بەهاوە کە ڕێزنەگرتنیان ڕەوایەتی بە یاخیبوونی مرۆڤەکان ئەدات. لێرەشدا و لەناو هەناوی یاخیبووندا جگە لە هۆشیاریی و وژیدانی مرۆڤ. شتێك هەیە ناو ی بەها ئەخلاقییەکانە کە مرۆڤ بەرەو یاخیبوون دەبەن.

## یاخیبوون و گۆڕستانە ناوەکییەکان

هەموو ئەو شتانەی لەسەرەوە باسکران، مەبەستم بوونی هۆشیاریی و ویژدان و ئازار و فشارە، هەموو ئەمانە وادەکەن سنوورێك بۆ سەبر و دانبەخۆداگرتنی مرۆڤ هەبێت، سنوورێك وابکات مرۆڤ نەتوانێت و ئامادەنەبێت هەموو ناشیرینییەکان قبووڵبکات، خراپەکارییەکان کۆبکاتەوە و لەناو خۆیدا بیاننێژێت. مرۆڤ دەتوانێت لێرەو لەوێ لەم یان لەو ساتدا بێدەنگبێت، بەڵام ناتوانێت ناوەوەی خۆی بکات بە گۆڕستان بۆ ناشتنی هەموو ئەو شتانەی بەڕاستی نازانێت، ئەو شتانەی بە دڵی نییە، ئەوانەی مرۆڤ دەشکێنن و بێ بەهاو بێنرخی دەکەن، ئەو شتانەی مایەی جوڵاندنی هەستکردنە بە سووکایەتی. مرۆڤ دەشێت بڕێك لە سوکایەتی و نادادپەروەریی قبووڵبکات، بەڵام ناتوناێت دەرونی بگۆڕێت بۆ گۆڕستانی ناشتنی هەموو ناشیرنییەکانی دونیا، ئەمەیان زەحمەتە. هەمیشە ساتێك دروستدەبێت مرۆڤ نایەوێت چیتر شتەکان بۆ ناو ئەو گۆڕستانە ناوەکییە بنێرێت، یاخود نایەوێت لەناوەوە تەواو ببێت بە گۆڕستان و مردووخانەیەك لە دەرونی خۆیدا دروستبکات بۆ هەموو ئەو شتانە کە قابیلی قبووڵکردن نین. مرۆڤ نایەوێت پڕبێت لە پۆخڵەواتی دونیا، ناوەوەی بگۆڕێت بۆ گوفەکێکی گەورە. ئەم نەویستنە ئەو ساتەیە کە مرۆڤ هەست بە ناهەقییە گەورەکان دەکات و هەست بەوەدەکات پێویستە وەك مرۆڤ شتێك دەربارەیان بکات. یاخیبوون لێرەدا وەك جۆرێك لە پێداویستیی ڕۆحی و



دەرونی لێدێت، هەموو ئەو سنوورانەی سەبرو دانبەخۆداگرتن و قبووڵکردن و ڕازیبوون تێدەپەڕێنێت کە پێشتر ڕەوانەی گۆڕاستانە ناوەکییە کراون و بەشێکیشبوون لە دۆخی قبووڵکردنی ناهەقییەکانی ناودونیا، یان بەشێك لە ستراتیژیەتی گوێڕایەڵی و بێدەنگبوون. ئەو کاتەی کە مرۆڤ ئەو هەستەی تێدا دروستدەبێت کە بوونەوەرێکی قابیلی ڕێزلێنان و نرخاندنە، ئەودەم ئەو هەستە دەبێت بە ڕاستیی و بە بەشێك لە هۆشیاربوونی مرۆڤ بە بوونی خۆی و بە دونیا، ئیتر ڕێزنەگرتن و نەنرخاندنی پۆزەتیڤی مرۆڤ دەبێتە هۆکاریی یاخیبوون، یاخیبوونێك دەشێت تا ئەو شوێنە بڕوات مرۆڤ ئامادەبێت قوربانی بە ژیانی خۆی بدات لەپێناوی پاراستنی ئەو هۆشیاریی و بەهایانەدا کە مرۆڤ وەك مرۆڤ و ێنادەکەن. ئامادەیە بمرێت لەپێناوی پاراستنی مرۆڤبوونی خۆیدا.

## یاخیبوون و ڕق

لە دیدی ئەلبێر کامۆدا مرۆڤی یاخیگەر کەسێك نییە لە ڕقەوە دەستپێبکات، ڕق سەرچاوە و وزەی یاخیبوون نییە، لە هەمووشی گرنگتر ڕق ئەو بەهایە نییە کە کردەی یاخیبوون ئاراستەدەکات. بەپێچەوانەوە یاخیبوونی مرۆڤ ئەو بەهایانەی ئاراستەی دەکەین کە بەهای پۆزەتیڤن، کە مرۆڤ دەکەن بە مرۆڤ، کەوا لە مرۆڤ دەکەن هەستبکات نرخێکی ناوەکیی گەورەی هەیە و ئەو نرخە لە ئێستادا لەژێر فشار و ڕێزنەگرتن و بریندارکردندایە. ئەم جۆرە بەهایانە، واتە ئەو بەهایانەی لە پشتی کردەی یاخیبوونەوە، تەنها بەهای ئەم یان هی ئەو تاکەکەس نییە بەتەنها، بەڵکو بەهای گشتیین، پەیوەستن بەوەوە هەیە کە مرۆڤ وەك مرۆڤ بوونەوەرێکی تایبەت و دەگمەنە و شایانی ڕێزلێگرتن و نرخاندێکی بەرزە. کەسی یاخیگەر لەڕێگای یاخیبوونەوە بەرگریی لە بوونی خۆی وەك تاکەکەسێکی خاوەن ڕێز دەکات، بەڵام هاوکات بەرگریی لە هەموو بەهایانەش دەکات کە بە بوونی ئەو نرخێکی تایبەت و قورساییەکی تایبەت دەبەخشن. یاخیبوون لەم دیدە کامۆییەدا لەوێوە دەستپێناکات کە مرۆڤ شتێکی نییە و دەیەوێت بەدەستی بهێنێت، واتە لە پڕکردنەوەی نووقسانی و بۆشاییەکی ئەخلاقییەوە دەستپێناکات، بەڵکو یاخیبوون لە



بەرگریکردن لە شتێکەوە دەستپێدەکات کە مرۆڤ هەیەتی، شتێك کە لەناوەوەی مرۆڤ خۆیدا جێگیرە و نرخێکی گرنگ بە مرۆڤبوونی مرۆڤ دەبەخشێت. کردەی یاخیبوون کردەی سەلماندنی ئەو بەها ناوەکییە گرنگەیە کە مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی بەنرخ دەناسێنێت. لە سەرێکی دیکەوە هۆکاری یاخیبوون پەیوەندی بە ئەنانیەت و خودپەرستییەکی ناتەندروستەوە نییە، پەیوەندی بە تەماحی ڕاکشان و درێژکردنەوەی خودەوە نییە بۆ دەرەوەی خود خۆی، بۆ فوکردنە خود خۆی لەڕێگای ئەنانیەت و ئێرەیی و بوغز و ڕق و شتی دیکەی لەم بابەتەوە، بەڵکو پەیوەندی بە پێداگرتنی مرۆڤەوە هەیە لەسەر خودی خۆی لەبەردەم دونیادا، سەلماندنی خود و ڕێزگرتن و بەرجەستەکردنیەتی لەناو دونیادا و لەبەردەم ئەوانیتر و لەگەڵیاندا. یاخیبوون قبووڵنەکردنی سوکایەتییە بە خود، قبووڵنەکردنی گرگنی و بێنرخییە، بەڵام هەرگیز تەماحی سوکایەتیکردنی بە کەسانی تری لە پشتەوە نییە. ئەو بەها گشتییەی کە مرۆڤی یاخیگەر بەرگریلێدەکات، بریتییە لە پاراستنی کەرامەت، کەرامەتێکی هاوبەش لەنێوان مرۆڤەکاندا، کەرامەتی ئینسانی.(٨)





کامۆ لێرەدا جارێکی تر پێ لە ڕەهەندە ئەخلاقییەکانی یاخیبوون دادەگرێت و یاخیبوون خۆشی وەك کردەیەکی ئەخلاقی دەبینێت. ئەخلاقیش لە پەیوەندییەکی پتەودا بە هەقیقەتەوە دەبینێت. بەڵام هەقیقەت لای کامۆ هەقیقەتێکی زانستی و تیوریی نییە، هێما نییە بۆ جۆرێك لە مەعریفە کە نەکرێت هەڵە یان ناڕاست بێت، بەڵکو هەقیقەتیش چەمکێکی ئەخلاقییە و بەپلەی یەکەم هێمایە بۆ ڕاستگۆبوونی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆیدا، ڕاستگۆبوونی مرۆڤ لەگەڵ دونیای دەوروبەریدا، جەوهەری هەقیقەت لای کامۆ جەوهەرێکی تاکەکسییە، پەیوەندی بەوەوە هەیە مرۆڤ هەقیقەتی خۆی بەشێوەیەکی ڕاستگۆ و بەرپرسانە بژی. لەم ڕوانینەدا هەقیقەت ئامرازێکە بۆ دروستکردنی خود، بۆ داڕشتنی تاکایەتی مرۆڤ و داڕشتنی و یژدان و هۆشیاریی تاکەکەسی بەرپرسیار. هەقیقەت لێرەدا ڕووبەرێکی ئەخلاقیی ناوەکییە تەواو ناکۆك بە درۆکردن و ڕق و بوغزەوە. چ لەبەرامبەر خود خۆیدا، چ لەبەرامبەر ئەوانیتردا. بەم مانایە هەقیقەت شتێك نییە پەیوەندی بە زانستەوە هەبێت، بەڵکو پەیوەندی بە تێپەڕاندنی درۆ و



ساختەكاریی و ماسك و چەندڕوویی و شتی تری لەم بابەتەوە هەیە. هەقیقەتی زانستی شتێكە گرنگ نییە كێ هەڵگرەكەیەتی، پیاوكوژێك یان فریشتەیەك، بەڵام هەقیقەت بەمانا ئەخلاقییەكەی تەنها كەسێك هەڵگریەتی كە لەگەڵ خۆی و لەگەڵ ئەوانیتر و لەگەڵ دونیادا ڕاستگۆبێت.
خاڵێكی گرنگی تر كە لە كتێبی "مرۆڤی یاخی"دا ئامادەیە بریتییە لە بەخشینی ئاكارێكی گشتی بە كردەی یاخیبوون، یاخیبوون تەنها پابەستی ئاكاری ئەم یان ئەو تاكەكەسی دەگمەن نییە، شتێك نییە تەنها بۆ كۆمەڵێك مرۆڤی ناوازە دانرابێت، بەڵكو كردەیەكی كۆمەڵایەتی و ئەخلاقییە هی هەموو یان زۆربەی مرۆڤەكانە. كامۆ تا ئەو شوێنە دەڕوات كە بڵێت یاخیبوون بەشێكە لە "سروشت"ی مرۆڤ. وەك ئەو كۆجیتۆ دیكارتییە وایە كە دەڵێت "من بیردەكەمەوە كەواتە من هەم"، بەڵام ئەمجارە لەباتی بیكردنەوە یاخیبوون خاڵی سەرەكییە: "من یاخیدەبم كەواتە من هەم". یاخیبوون لێرەدا بەبەشێك لە بوونی مرۆڤ وەك مرۆڤ، ڕەهەندێكە لە ڕەهەندە سەرەكییەكانی مرۆڤبوون. مرۆڤ بۆئەوەی بتوانێت وەك مرۆڤ بێت پێویستە بتوانێت یاخیبێت، بەڵام یاخیبوونی ڕەها نا، بەڵكو تا ئەو سنوورەی مرۆڤەكان لەیەكتر نزیدەكاتەوە و بەیەكتریان دەگەیەنێت. بە مانایەكی دیكە كردەی یاخیبوون پێویستە تا ئەو شوێنە بڕوات كە ڕێگرنەبێت لەبەردەم پەیوەندی مرۆڤەكان بەیەكترییەوە و كۆبوونەوەیان بەیەكەوە بە مەبەستی پێكەوەژیان تێكنەدات. بوونی ئەم سنوورە ناوەكییە و ڕێزگرتن و تێنەپەڕاندنی وادەكات یاخیبوون نەگۆڕێت بۆ پێچەوانەكەی، واتە نەبێت بە ستەمگەریی و كۆیلەگەرایی.(٩) یاخیبوون لەم ڕوانینەدا ئازارە تاكەكسییەكان، بەتایبەتی ئەو ئازارە تاكەكەسییانەی بەشێكن لە ئەزموونی هەستكردن بە عەبەس و پوچگەرایی، دەگۆڕێت بۆ ئازاری دەستەجەمعی. ئازارە شەخسییەكان ڕەهەندێكی گشتیی و دەستەجەمعی گرنگ وەردەگرن. مرۆڤی یاخی هەستدەكات ئازارە شەخسییەكانی، ئەو ئازارانەی لە بێمانایی ژیانەوە دروستدەبن، دەگۆڕێن بۆ ئازارێكی گشتی و دەبن بە بەشێك لە ژیانی پێكەوەیی مرۆڤەكان. ئەمە ئەو شتە دروستدەكات بێت كە كامۆ ناوی "چارەنووسی هاوبەش"ی لێدەنێت، چارەنووسێك لەڕێگای مرۆڤەكان و لەنێوان مرۆڤەكاندا دروستدەبێت.(١٠)
وەك پێشتریش هێمام پێكرد، كامۆ كە باس لە یاخیبوون دەكات و وەك سروشتی مرۆڤ

دەیناسێنێت، هاوکات ئەو خاڵە لەبیرناکات کە مرۆڤی یاخیگەر دەشێت خیانەت لە یاخیبوون بکات، دەتوانێت ناپاکبێت بەرامبەر بەو بەهایانەی بەرەو یاخیبوون دەیجوڵێنن. مرۆڤی یاخیگەر دەشێت تاقەتی لە یاخیبوون بچێت، پەشیمانببێتەوە، چیتر بەلایەوە گرنگ نەبێت یاخیگەربێت، یاخود یاخیگەرییەکەی کورتبکاتەوە بۆ هەندێك کڵێشەی بەتاڵ، بۆ بۆشاییەك نەکرێت سنوورەکانی دەستنیشان بکرێت، یاخود یاخیگەرییەکەی تێکەڵببێت بە نارسیسمێکی کوشندە، ببێتە بە پاڵنەرێك بۆ سوکایەتیکردن بە مرۆڤەکانی تر، هەستی بە کۆیلەکردنی ئەوانیتر گەورەبکات هتد... لەهەموو ئەو دۆخانەدا مرۆڤی یاخیگەر دەبێت بە مرۆڤێکی ترسناك، چونکە یان ئەوەتا مەیلێکی نارسیستی و سوڵتەوی کوشندە لەخۆیدا گەشەپێئەدات و ئەو مەیلانە ئاراستەی یاخیبوونەکانی دەکات، واتە ئامادەیە لەپێناوی خودی خۆیدا، یان لە پێناوی پاراستنی وێنەیەك لەوێنەکانی خۆیدا، ئینکارێکی تەواوی هەموو دونیای دەرەوەی خۆی بکات و هیچ شتێکی ئەو دونیایە نەسەلمێنێت، یان لانیکەم سەرجەمی شتەکانی دەرەوەی خودی خۆی بێڕێز و بێبەها بکات، یاخود مەیلی کۆیلەبوون لەوانیتردا گەورەبکات و بەشێوازی جیاواز ئالآی خەمساردی و گوێپێنەدان و نابەرپرسیارێتی، تا ڕادەی تەسلیمبوون، بەرزبکاتەوە. لەم دۆخانەدا، دۆخی گۆڕانی مرۆڤ بۆ بوونەوەرێکی نارسیستی ترسناك کە توانای ئەوەی نەمێنێت دونیا و کێشەکانی ببینێت، یاخود دونیا بەو شێوەیە وێنابکات کە تەنها وێنەکانی ئەوکەسە لەسەر خۆی بسەپێنن، ئەوەی ئاراستەی کردەی یەخیبوون دەکات چیدی مەسەلەی پاراستنی کەرامەت نییە، کەرامەتی کەسیی و کەرامەتی ئەوانیتر، بەڵکو ئەو هەست و حەز و مەیلانەیە کە قاچێکیان لەناو ڕق و قاچەکەی تریان لەناو نەرجسیەتێکی ترسناکدایە. لەم دۆخانەدا گرنگ نییە مرۆڤ چەند باسی یاخیبوون بکات و چ ئایدیال و بیرۆکەیەکی گرنگیی لێدروستبکات، یان چۆن دەیکات بە دروشمی سەرەکیی ژیانی، لەم دۆخانەدا ڕەهەندە ئەخلاقییە ناوەکییەکە لە یاخیبوون دەسێندرێتەوە یاخیبوون دەگۆڕدرێت بۆ کۆمەڵێك کڵێشەی بەتاڵ و ترسناك. یاخیبوون بۆئەوەی وەك یاخیبوونێکی تەندروست بمێنێتەوە نە لە ڕقەوە دەستپێدەکات، نە لە خودێکی فوتێکراویی تەماحاوییەوە کە خەون بە کۆیلەکردنی دونیاوە ببینێت، نە لەوەشەوە بیەوێت لەدەرەوەی کۆمەڵگادا و بەتەنها یاخیبوونی خۆی بژی. یاخیبوونی ڕاستەقینە یاخیبوونە بۆ پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ وەك مرۆڤ.



# ڕەخنە لە مرۆڤی یاخی

کامۆ یەکێك بوو لەو کەسە کەمانەی لە ساڵانی پەنجادا ڕەخنەی لە کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم و ستالینیزم و شۆڕش و توندوتیژیی گرت، ڕەخنەکردنی ئەم مەسەلانە لەو ڕۆژگارەدا کەم بوو، بەتایبەتی لەلایەن ئەو ڕۆشنبیرانەوە کە لەسەر فیکری چەپ حیسابدەکران. ئەوانەی کە لەگەڵ کامۆدا ناتەبابوون ڕەخنەی ئەوەیان لێدەگرت کە ئەو ڕەخنەی ئەخلاقی لە سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم دەگرێت، ڕەخنەی کەسێك کە نەیەوێت بەشداربێت لەگۆڕانی مێژوودا، یان کەسێك خەون بە گۆڕانی گەورە ببینێت بەڵام نەیەوێت دەستەکانی لەناو ئەو کردەی گۆڕانکارییانەدا پیس ببێت و گەردی لێبنیشێت. ڕەخنەگرانی کامۆ ڕەخنەیان لە کەسێك دەگرت کە بۆئەوەی لەڕووی ئەخلاقییەوە بەپاکی بمێنێتەوە لە مێژوو ڕووداو و کێشە سەرەکییەکانی هەڵبێت. بۆئەوەی لەڕووی ئەخلاقییەوە پاکبێت، باکی بە گۆڕان یان نەگۆڕانی دونیا نەبێت. هەموو ئەوانەی ڕەخنەیان لە کامۆ دەگرت لەوە ئەدوان کە گۆڕانی دونیا بە دەسکێشی سپییەوە ناکرێت. ئەو ڕۆحە ئەخلاقییە سوفییەی کامۆ بەرگریلێدەکات کردەی مێژوویی ئیفلیج دەکات مەیسەری ناکات. بەبۆچوونی من برێکی زۆری



ئەم ڕەخنانە ڕاستن، کامۆ مرۆڤێکی ئەخلاقگەرە و وەك کەسێکی ئەخلاقگەر لە دونیا دەڕوانێت، ناهەموارییەکان و کێشەکان و کارەساتەکان دەبینێت، بەڵام لە ترسی ئەوەی هەر بەشداربوونێکی ڕاستەقینە بۆ گۆڕینی ئەو دونیایە لەڕووی ئەخلاقییەوە بریندار بکات، واز لە بیرۆکەی گۆڕینی دونیا دەهێنێت. لەڕاستیدا ئەلبێر کامۆ دەیویست لەشوێنێکدا بێت لە نێوان پاکیی و شۆڕشگێڕیدا، لەنێوان جوانیی و کۆمەڵگادا، لەنێوان خەونی گۆڕان و پرۆژەی دابەزاندنی گۆڕاندا بۆ ناو مێژوو.

پێداگرتن لەسەر ئەخلاق وا لە کامۆ دەکات یاخیبوون لە کردەیەکی ڕۆمانسی و نامێژوویی نزیکبخاتەوە، یاخیبوون بکاتە جۆرێك لە ڕۆمانسیەتی شۆڕشگێڕیی بەبێ شۆڕش، وەك خەونێکی گەورە بۆ گۆڕانی دونیا و گۆڕانی مرۆڤ، بەڵام بەبێ بەشداریی مرۆڤ خۆی. یاخیبوون وەك کردەیەکەی تاکەکەسی دەروونیی و ئەخلاقیی و

ویژدانیی، بەدوور لە بەرجەستەبوونە مێژووییە کۆنکریتەکانی. بەمجۆرە یاخیبوون دەبێتە کردەیەکی ئەخلاقیی و دەرونیی کە بەزەحمەت دەتوانێت بۆ ناو مێژو و ناو واقیع شۆڕببێتەوە.
بە بۆچوونی من یاخیبوون وەك کردە کاتێك مانا ڕاستەقینەکانی خۆی وەردەگرێت کە یاخیبوونێکی کۆنکریت بێت، ڕووی لە ڕووبەرێکی کۆنکریت و مێژوویەکی کۆنکریت و دونیایەکی کۆنکریتبێت، ڕووی لە کەسی و کۆنکریت و هێزی کۆنکریت و بەهاو نۆرمی کۆنکریت بێت. یاخیبوون دەشێت ڕەهەندێکی میتافیزیکی هەبێت، دەشێت ناڕازیبوونێك بەرامبەر بەوەی بۆ مرۆڤ بەوشێوەیە دروستبووە وەك ئەوەی دروستبووە و بۆ ژیان بەو شێوەیەیەوەك ئەوەی لە ئێستادا وایە، یاخیبوون دەشێت یاخیبوونبێت بەرامبەر بە خوداوەند، بە گەردوون و گشتێتی ژیان، بەڵام ئەمجۆرە یاخیبوونانە کاتێك مانا ڕاستەقینەکانی خۆیان وەردەگرن کە لەناو مێژوویەکی کۆنکریت و کۆمەڵگایەکی کۆنکریت و کۆمەڵێك مرۆڤی کۆنکریتدا دروستببێت. لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی و لە گشتێتییەوە بۆ ناو تایبەتێتی دابەزێت. بەبۆچوونی من ڕوانینی ئێمە بۆ یاخیبوون کاتێك مانای دەبێت کە بتوانین بۆ سەرەتا یۆنانییەکانی یاخیبوون بگەڕێینەوە. لە یۆنانی کۆندا تەنانەت یاخیبوونی میتافیزکیش، یاخیبوون بەرامبەر بە گەردون و بە بوون، بەرامبەر بەوەی کە مرۆڤ وەك مرۆڤ و شەڕ وەك شەڕ و خێر وەك خێر دروستکراون، یاخیبوون بەرامبەر بە خوداکان، هەمیشە ڕەهەندێکی سەرزەمینیی کۆنکریت و دیاریکراوی گرنگی هەبوو. خوداکان لای یۆنانییە کۆنەکان هەم لە ئاسمان و هەم لەناو مێژوودا بوون، لەگەڵ یەکداو لەگەڵ مرۆڤەکاندا لە ململانێدابوون، بۆیە یاخیبوون لە خوداکان یاخیبوون بووە لە شێوازێکی تایبەتی بوونی دونیا و بوونی مرۆڤ خۆشی. یاخیبوون لەوکاتەدا کە ڕەهەندێکی میتافیزکی هەبووە و ڕووی لە یاخیبوون بووە لە ئاسمان، لەهەمانکاتدا ڕەهەندێکی شەخسی کۆنکریتی هەبووە. یاخیبوون بەرامبەر بە خوداکان یاخیبوونێکی ئەبستراکت و گشتی نەبووە، بەڵکو یاخیبوونێکی کۆنکریت و دیاریکراو و مێژوویی بووە. ئەوەی لە یاخیبوونی کامۆییدا نائامادەیە، یان لاوازە، ئەم ڕەهەندە یۆنانییە گرنگەیە.




**کامۆو سێنترالیزمی ئەوروپی**

خاڵێکی لاوازو خراپی تری کتێبی "مرۆڤی یاخیی" لەوەدایە کە لە دیدگایەکی

ئێرۆسێنتریزمییەوە نووسراوە و کامۆ کردەی یاخیبوون و ماناکانی یاخیبوون تەنها بە کۆمەڵگا ئەوروپییەکانەوە گرێدەدات. لەمڕووەوە دەنووسێت: "پێدەچێت کێشەی یاخیبوون مانایەکی ڕاستەقینەی نەبێت، تەنها لەناو فیکری خۆرئاواییدا نەبێت".(١١)

لەم ڕوانینەدا کامۆ دەگەڕێتەوە بۆ بیرۆکەیەکی هاوشێوە لە لای شاعیری ئەڵمانی شیلەر. شیلەر پێیوایە لە کوێدا "کۆمەڵگاکان جیاوازییەکی گەورەیان تێدابێت، وەك لە سیستمی چینایەتی لای هیندۆسەکاندا، یان لەو شوێنانەدا کە کۆمەڵگا "یەکسانبوونێکی رەها"یان تێدابێت لەنێوان مرۆڤەکاندا، وەك لە هەندێك کۆمەڵگای سەرەتاییدا، لەو شوێنانەدا ڕۆحی یاخیبوون زەحمەتە دروستببێت". واتە یاخیبوون لە کۆمەڵگایەکدا قابیلی دروستبوونە کە نە جیاوازییەکانی هێجگار گەورەبن، نە ئەوەشە هەموو کەسەکانی ناوی یەکسان بن. کامۆ پێیوایە تەنها لە خۆرئاوادا نە نایەکسانی بەو ڕادەیەیە کە مرۆڤێك ئاغاو ئەویتر کۆیلە بێت، نە یەکسانیش بەو ڕادەیەیە



کە هەمووان بەیەکتری یەکسانبن. بۆیە یاخیبوون تەنها لەناو خۆرئاوادا قابیلی دروستبوون و هەڵگری مانایە.

ئەم شێوازە لە بیرکردنەوە نەك تەنها بێئاگاییەکی تەواو لە مێژووی یاخیبوون لە کۆمەڵگاکانی دەرەوەی خۆرئاواو لە بەشەکانی تری دونیادا نیشان ئەدات، بەڵکو لەسەر گریمانەیەك دروستبووە کە تەواو ناڕاست و نامێژوویی و میتافیزیکییە. لەسەر کۆمەڵێك وێنەی سادەو گشتگیرییەکی ترسناك دروستبووە بۆ مەسەلەی جیاوازیی و یەکسانی لە کۆمەڵگاکانی دەرەوەی کۆمەڵگا خۆرئاواییەکاندا.

بۆ نموونە گەر کۆمەڵگای کوردی لە سەدەکانی بەر لە سەدەی بیستەم و تەنانەت ناو ناوەڕاستی سادەی بیستەم وەرگرین، دەبینین لە دونیایەکی خێڵەکی و دەرەبەگیی دخراوی وەك کۆمەڵگای ئێمەدا، کە تیایدا ئاغاکان خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆر و رەعیەتەکان تەواو بێدەسەڵات بوون، دەڵێم تەنانەت لەناو مێژوویەکی لەو بابەتەدا چەندان نموونەی مرۆڤی یاخیگەر و کەسایەتی ناڕازیی، ژن و پیاوی بەرگریکەرەمان هەیە کە بەڕووی بەها ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکاندا یاخیبوون. کەمنین ژمارەی ئەو عاشقانەی لە مێژووی کۆمەڵگای ئێمەدا لە دەسەڵات و دین و

بەهاكان یاخیبوون، دەستی یەكتریان گرتووە و بۆ شوێنێكی تر هەڵاتوون بۆئەوەی بتوانن عەشقی خۆیان وەك عەشق بژین. ئەدەبیاتی فۆلكلۆری ئێمە پڕە لە بەسەرهاتی یاخیبوونی كۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و دینی. كە باس لە كۆمەڵگای كوردی دەكەم دەمەوێت وەك نموونەیەك نیشانبدەم كە كردەی یاخیبوون بەشێكە لە مێژووی مرۆڤ لە زۆربەی كۆمەڵگاكانی دونیادا، باوەڕیشموایە كۆمەڵگاكانی دراوسێشمان دەیەها و سەدەها نموونەی مرۆڤی یاخیگەر و ناڕازیان هەیە. بۆ نموونە یاخیبوونی سوفییە گەورەكانی دونیای ئیسلام لە دینی ڕووكەش، یاخیبوونی نووسەرە گەورەكانی دونیای كلاسیكی وەك ئەبو عەلای مەعەرەی و ئەبو نەواس و ئەوانیتر، یاخیبوونی حەلاج و ئیبنی عەرەبی و ئیبن رەوەندیی و ئیبن حەنبەل و ئەوانیتر، نموونەی یاخیبوونێكن كە لەدەرەوەی كۆمەڵگا و مێژوو و فیكری خۆرئاوادا ڕوویانداوە. ئەمە جگە لە یاخیبوونی كۆیلەكان و بەرمەكییەكان و شیعەكان هتد...(١٢)

## چۆن و بۆواز لە كامۆ بهێنین؟

بەبۆچوونی من هەموو پرسیارێكی ڕەها لەسەر چییەتی ماناكانی ژیان و چییەتی ئینسان پرسیارێكی هەڵەیە. مانا شتێك نییە لەدەرەوەی مرۆڤدا، لەدەرەوەی پەیوەندییەكان و دەزگاكان و ڕیزبەستنە كۆمەڵایەتییەكاندا، شتێك نییە لەدەرەوەی شێوازەكانی دەسەڵات و كردەی بەرگریی و شێوازە جیاوزەكانی فیكر لەسەردەمێكی دیاریكراودا. مانا هەمیشە بەشێكە لە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و شتەكانی دەوروبەری، پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی و لەگەڵ ئەو ژینگە كۆمەڵایەتی و فیكریی و مەعریفییەدا كە تیایدا دەژی. مرۆڤ هەرگیز لەناو یەك دونیاشدا ناژی تا بەدوای یەك مانا یان یەك مەبەستی دیاریكراودا بگەڕێت، مرۆڤ هەمیشە لەناو چەندان دونیای جیاوازدا دەژی و هەریەكێكیشیان چەندەها پرسیاری جیاواز و ئەگەری وەڵامی جیاواز و مانای جیاوازیان تێدایە. دروستبوونی هەر دونیایەكیش بەناو ڕستێكی گەورە لە بڕیارو هەڵسوكەوت و جوڵە و مەبەست و پراكتیكی تاكەكەسی و دەستەجەمعیدا تێدەپڕێت. كە باس لەوازهێنان لە كامۆ دەكەم، باس لەوازهێنان لەو پرسیارە ئەبستراكتە گشتییانە دەكەم كە هەمیشە و هەردەم بێوەڵامن و بێوەڵامیش دەمێننەوە، پرسیاری ئەوەی مرۆڤ بۆوا



دروستکراوە؟ ئایا مرۆڤ بوونەوەرێکی سیزێفییە یان نا؟ ئایا ژیان ماناو مەبەستێکی دیاریکراوی هەیە، یان شتێکی بێمەبەست و بێمانایە؟ ئەم جۆرە پرسیارانە لەو جۆرە پرسیارە گشتییانەن کەوەڵامیان نییە. نە ڕاستی و نە هەڵەبوونیان قابیلی سەلماندن نین. ئەوەی پێویستە شوێنی ئەم جۆرە پرسیارە گشتی و ئەبستراکتانە بگرێتەوە پرسیاری کۆنکریتە دەربارەی مرۆڤی کۆنکریتی ناو مێژوویەکی کۆنکریت، کردن و دروستکردنی پرسیاری کۆنکریت خۆیان بەشێکن لە کردەی بەخشینی مانا بە ژیان و بە مرۆڤ لەو دۆخە مێژووییە کۆنکریت و سنووردارەدا. ئەوەی شایانی لێوردبوونەوەیە ئەوەیە ئەلبێر کامۆ لە ژیانی شەخسی خۆیدا جگە لە تێوەگلان لە پرسیار و کێشە و مەسەلەی کۆنکریتەوە شتێکی دیکەی نەکردوە. کامۆ بەبێ ئەوەی باوەڕی بە حیکایەتێکی گەورە بۆ ڕزگاربوون هەبێت، بەبێ ئەوەی ئومێدێکی یۆتۆپیی ئاراستەی بکات، ڕێك وەك دکتۆر ڕوکس لە ڕۆمانی



"تاعون"دا، بەگژ تاعونی نازییەتدا دەچێتەوە و بەشداردەبێت لە کردەی بەگژاچوونەوەی نازیزم لە فەرەنسادا. کامۆ ئەم بەشدارییە بەناوی حیکاتێکی گەورەوە ناکات، بەڵکو بەناوی مرۆڤبوونی خۆیەوە، بەناوی فەرەنسیبوونی خۆیەوە دەیکات. هەروەها بەناوی کۆمەڵێك بەهاوە کە مرۆڤ دەخەنە ناو کۆمەڵێك هاوکێشە و هەڵوێست و شێوازی بیرکردنەوەی کۆنکریت و تایبتەوە. خاڵێکی دیکە لە فیکری کامۆدا کە تەواو پڕ کێشە و گرفتە دانانی هونەر و ئەدەبیاتە لەشوێنی کردەی شۆڕشگێڕانە بۆ گۆڕانی دونیا، سوفیزمێکی ئەخلاقییە لە شوێنی پراکتیکی مێژوویی دەست و پەنجە پیسکەر. کامۆ کە باوەڕی بە شۆڕش و گۆڕان و دەسکاریکردنی ڕیشەیی دونیا نامێنێت، تاقە دەروازیەك بۆ ڕزگاربوون بیبینێت، یان گەڕانەوەیە بۆ جوانیی و ئاسمان و دەریاو خۆرەتاو، گەڕانەوە بۆ سروشت، یاخود گەڕانەوە بۆ هونەر. لەهەردوو دۆخەکەشدا کردەی هەژارخستن و بێنرخکردنی کردە و پراکتیکە مێژوویە کۆنکریتییەکان لەئارادایە. بێگومان کامۆ خۆی وەك تاکەکەس دەتوانێت ڕزگاربوونی خۆی لە نووسین و هونەر و ئەدەبیاتدا بدۆزێتەوە، بەڵام هونەر و ئەدەبیات پرۆژەی ڕزگاربوونی کۆمەڵایەتیی نین. مرۆڤایەتی، کۆمەڵگا، هەژاری و نەداریی لەڕێگای

ئەدەبیات و هونەرەوە ناگۆڕدرێن. ئەدەبیات دەتوانێت بەشێکبێت لە پرۆژەی گۆڕان، بەڵام ئەلتەرناتیڤی کارکردنی چالاکانەی مرۆڤ لەناو مێژوودا بە مەبستی پیادەکردنی گۆڕان، نین. کامۆ لەڕێگای ئەدەبیاتەوە خۆی لەوەهمێکی سیاسی و ئایدیۆلۆژیا گەورەی سەردەمەکەی خۆی ڕزگاردەکات بەڵام دەکەوێتە ناو وەهمێکی ئەدەبیی و هونەرییەوە، لە ئایدیال و حیکایەتە گەورەکانی سەردەمی خۆی دووردەکەوێتەوە بۆئەوەی باوەش بە حیکایەتێکی گەورەی تردا بکاتەوە: حیکایەتی هونەر وەك چارەسەر، وەك دواهەمین ڕێگا بۆ ڕزگاربوون. ئەم وەهمە لەدوای کامۆوە و لەپاڵ کامۆشدا بۆ بەشی زۆری نووسەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرتیش دەگواسترێتەوە. لەم ڕووەوە ڕۆجێ گارودی کە باس لە ئەلبێر کامۆ دەکات دەڵێت ئەو “سۆفییەك بوو، بەڵام بەبێ باوەڕبوون بە خودا”. (١٣) کامۆ وەك چۆن ڕۆحانییەك بوو بەبێ خودا، ئاواش شۆڕشگێڕێك بوو بەبێ شۆڕش و یاخیگەرێك بوو بەبێ یاخیبوون.

بەبۆچوونی من دوای تێپەڕینی ئەو هەموو ساڵانە بەسەر مردنی کامۆدا ئەوەی لەم نووسەرە دەمێنێتەوە دوو شتە. یەکەمیان ئەو ڕێزگرتنە گەورەیەیە لە ژیان لە هەموو ساتێك لە ساتەکانی بووندا، ڕێزگرتنی ژیان تەنانەت لە ساتە هەرە دژوار و هەرە تاریکەکانی تەمەندا، دۆرنەکردن لەگەڵ خۆمان و لەگەڵ ئەوانیتردا، پاراستنی میهرەبانی مرۆڤ، وازهێان لە توندوتیژیی هتد... دووهەمیان پێداگرتنی سەختی کامۆیە لەسەر یاخیبوون لەڕێگای گوتنی نەخێرەوە بەرامبەر بە هەموو ئەو شتانەی ڕێزی ژیان و ڕێزی مرۆڤ و ڕێزی دونیا ناگرن، یاخیبوون بەبێ بوونی نەخشەیەکی گەورە بۆ ڕزگاربوونی یەکجارەکی و هەتاهەتایی، یاخیگەریی تەنانەت لە غیابی یاخیبووندا، شۆڕشگێڕبوون لە دۆخی نامادەگی شۆڕشدا. بەم مانایە ئەوەی لە کامۆ دمێنێتەوە ڕێزگرتنی ئەو بەها ئەخلاقییانەیە کە نرخی مرۆڤ وەك مرۆڤ و نرخی ژیان وەك ژیان بەرز ڕادەگرن. هۆشیاربوون و حەساسبوونە بەرامبەر بەو ڕاستییەی کە مرۆڤ دەتوانێت ببێت بە کابوس بۆ مرۆڤەکانی تر و لەباتی میهرەبانی، بەربەرییەت و لەباتی ڕێز سوکایەتی و لەباتی خۆشەویستی توندوتیژیی لێببارێت. فیکری کامۆ ئەو شوتی خەتەرەمان بۆ لێئەدات کە دەڵێت مرۆڤ دەتوانێت بەناوی بەها و پرنسیپە



گەورەکانەوە تاوانی گەورە و کەم وێنە ئەنجامبدات. بەناوی جوانییەوە ناشیرینیی و بەناوی گۆڕانی دونیاوە گۆڕستان و بەناوی مرۆڤایەتییەکی باشترەوە بێنرخکردنی تەواوی مرۆڤ، دروستبکات. ئەم هەستە ئەخلاقی و ئەم حەساسیەتە ناوەکییە و ئەم گرنگیدانەی تاکەکەسە بە دارشتنی دونیای ئەخلاقیی خۆی، ئەم خۆدارِشتن و خودسازییە تایبەتەیە، وامانلێدەکات تا ئەمڕۆ کامۆ بخوێنینەوە و لەگەڵ تێکستەکانیدا بژین.

## پەراوێزەکان

١- Weiland, J. Sperna (1999). De mens in de filosofie van de Twintigste Eeuw. Amsterdam, Meulenhoff.p. 194.

٢- سیزێفو پرۆمیسیۆس کێن؟

سیزێفلە ئەفسانە یۆنانییەکەدا هەم دروستکەری شاری ئیفیراو هەم یەکەمین پادشای ئەو شارەیە. پیاوێکی فێڵبازو ناپاك و پڕ تەماعە. لە دوو نیوە دروستبووبوو، نیوەی خودا و نیوەکەی تری دز و جەردە. سیزێف لەلایەن خوداکانەوە سزا ئەدرێت بەوەی هەموو ڕۆژێك بەردێکی گەورە پاڵپێوەبنێت بۆسەر لوتکەی شاخێك، بەڵام هەموو جارێك بەر لەوەی بەردەکە بگەیەنێتە سەر لوتکەی شاخەکە بەردەکە خلدەبێتەوەو دەچێتەوە شوێنەکەی خۆی. بەم جۆرە سیزێف هەموو تەمەنی پاڵ بەو بەردەوە دەنێت و بەردەکەش سەرلەنوێ خلدەبێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی. ئەم کارە کە سیزێف تا هەتاهەتایە ئەنجامی ئەدات وەك کارێکی بێماناو بێمەبست دەبینرێت، کارێکی تەواو ناماقوڵ. لێرەوە مرۆڤی سیزێفی مرۆڤێکی ناماقوڵە و ژیانیشی ژیانێکی ناماقوڵە، ئەوەی دەیکات و ئەنجامی ئەدات زیاتر وەك سزایەکی بێماناو بێمەبەست دەردەکەوێت تا کارێکی مانادار و بەسود و ماقوڵ.

بەڵام ئەی پرۆمیسۆس کێیە و مرۆڤی پرۆمیسۆسی چییە؟

پرۆمیسۆس کوڕی یەکێك لە تیتانە گەورەکانی یۆنانی کۆنە، خوداکان بەسەر باوکی پرۆمیسۆسدا سەردەکەون و هەموو دەسەڵاتێکی لێدەسێننەوە. لەئەنجامدا پرۆمیسۆس دژ بەم کارەی خوداکان یاخیدەبێت و لەشاخی ئۆلۆمپ ئاگر لە خوداکان ئەدزێت و ئەیبەخشێت بە ئینسان بۆئەوەی بتوانێت خۆی پێ بەهێز بکات. پرۆمیسۆس سیمبۆڵی مرۆڤی یاخیبووە بەڕووی دونیا و دەسەڵاتی باڵادەستدا. بەڵام پرۆمیسۆس لە یاخیبوونەکەیدا ئەدۆڕێت و دەگیرێت و لەسەر شاخێك بە بەردێکی گەورەوە دەبەسترێتەوە تا دەمرێت.

٣- بڕوانە:

**Scherr, Arthur (2011). "William Shakespeare's KING LEAR and Albert Camus's THE STRANGER". The Explicator,Vol. 69, No. 1, p 22**

-٤

**Geoffrey Parkes (2008). "PUTTING IT TOGETHER: ALBERT CAMUS, MICHELFOUCAULT AND AN ETHICS OF THE SELF". University of Bucharest Review. Vol. X,no. 2, 2008**

٥- بڕوانە:

**Scherr, Arthur (2011). "William Shakespeare's KING LEAR and Albert Camus's THE STRANGER". The Explicator,Vol. 69, No. 1, p 22**

**Weiland, J. Sperna (1999). De mens in de filosofie van de Twintigste Eeuw. Amsterdam, Meulenhoff. p. 207**

٦. بڕوانە:

البير كامو . الانسان المتمرد. ل ٧

٧. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨.

٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢-٢٣-٢٤

٩- هەمان سەرچاوی پێشو ل٢٩

١٠- هەمان سەرچاوەی پێشو ل ٢٩

١١- هەمان سەرچاوەی پێشو ل ٢٦.

١٢. بۆ ڕەخنەکردنی کامۆ لەسەر دیدی ئێرۆسێنتریزم بڕوانە ئەم کتێبەی ئێداورد سەعید الثقافةوالإمبريالية. ترجمه كمال ابو ديت، دار الاداب. ٢٠٠٤.

**Geoffrey Parkes (2008). "PUTTING IT TOGETHER: ALBERT CAMUS,-١٣ MICHELFOUCAULT AND AN ETHICS OF THE SELF". University of Bucharest Review. Vol. X,no. 2, 2008**





# ئایا کامۆ شایانی خوێندنەوەیە؟

سەردار عەزیز

ساردبوو. رەنگی کاشیەکان سپی بوون، بەڵام هێندە سپی نەبوون، وەك لە چیرۆکی دیواری سارتەردا، هەتا ئازاری چاو بدەن. سەرەتای نەوەدەکان بوو، وانەی کیمیا، لە پەیمانگای تەکنیکی بەختیاری/ سلێمانی. ئێمە لە دواوە دانیشتبوین. یەکەمجاربوو نزیك بە یونس دابنیشم. ئەو هاورێیەکی تری هەبوو، ناوی، رۆژگارە زۆرەکان لە یادەوەریمی سڕیوەتەوە. لە سەروی هەموو شتێکەوە ئەوان لەو کۆمەڵە گەنجەبوون کە بە وجودییەکان دەناسران.
من پێشتر لە سەر شەقامەکان رۆمانی نامۆی کامۆم بینی بوو بە وەرگێرانی زمانی عەرەبی. بەڵام ئەو ڕۆژە یەکەمجار بوو کە یونس لە کاتی وانەدا دایە دەستم و پەڕەی یەکەمیم خوێندەوە. دایە مردوە، دوێنی یان ئەمرۆ، نازانم. ڕستەیەکە کە هێندە

دەتحەپەسێنی، دەبێت هەر زوو جارِی بێباکی بدەیت، تەنانەت بەرامبەر مەرگی خۆشەویسترین کەس، هەتا بتوانیت بەردەوام بیت لە خوێندنەوە. دایکی کامۆ ئافرەتێکی بەدبەختی نەخوێنەواری کڵۆڵ بوو. لە ماڵێکی سێ ژوری بێ کارەبا و بێ ئاوی هەژاردا لە جەزائیر وەك بێوەژن دەژیا. بۆ دابینکردنی بژێوی کاری پاککردنەوەی دەکرد. لە سەرووی هەموو ئەمانەوە زۆرێك گوێگران بوو. لە ماڵدا نەنکی کامۆ دەسەڵاتدار بوو کە زۆرجار وەك ئافرەتێکی دڵرەق دەردەکەوت.

دەست بردن بۆ کامۆ، هەوڵدان بۆ خوێندنەوەی کامۆ، بۆ کەسێکی دوورەشاری وەك من وەك بڤەیەك وابوو. بڤەیەك کە هێندە پاشخانی ئایینی و کۆمەڵایەتی هەبوو، هێندە کەلتوری نەبوو. کامۆ ئەو رۆژانە لە سلێمانی لە چوارچێوەیەکی تایبەتەوە دەبینرا؛ چوارچێوەیەکی یاخیبوون و بێباکی. سلێمانی و کوردستان ئەو رۆژگارە لە سەردەمی پاش راپەریندا دەژیا. رۆژگارێك کە تایبەتمەندی خۆی هەبوو. خەون و ئازار هێندە تێکەڵ بووبوون بە ئاسانی لێکجواد نەئەکرانەوە. گەرچی وڵات لە ژێر ئابڵۆقەدا بوو بەڵام کردنەوەیەك لە ئاستی فیکریەوە لە ئارادبوو. کە دەرئەنجامەکە پشێویەکی فیکری بوو کە هێندە بەرهەمی نەبوو.

من، وەك خۆم، لە قۆناغی پەرینەوەدابووم. رارِایی خەسڵەتی باڵای سەردەمی پەرینەوەیە. لاوبووم، دونیای خەیاڵم تەسك بوو، تینوبووم، دەمویست فێربم؛ دەمویست هەبم. ئەمە دۆخێکی گونجاوە بۆ نوسان بە ئەدەبی کامۆوە. ئەلبێرت کامۆ بە زمانێکی سادە دەنوسێت. هەر ئەوەیە کە لە نێو چینی لاواندا خوێنراوەیە، دیارە بە لەبەرچاوگرتنی بابەتی بێباکی و یاخیبوون. رەنگە کەم رۆشنبیری تر هەبن هێندەی کامۆ و سارتەر، کە وەك جوتەیەك دەبینران، لە دونیای کوردیدا ناویان هاتبێت و خوێنرابنەوە. دیارە هەریەك لەم دوانە بە شێوەیەکی فراوان نەخوێنراونەتەوە، بەڵکو چەند دەقێك لە کارەکانیان. نامۆی کامۆ لە هەموان زیاتر. رەنگە هۆکاری هاتنی کتێب لە لوبنانەوە و ئاسانی وەرگێرانی کارەکانی کامۆ لە بەر زمان سادەییەکەی و گونجانی لەگەڵ دۆخی کۆمەڵایەتی دونیای ئێمەدا؛ هۆکارگەلێك بن لە پشت ئەم فراوان خوێندنەوەوە. هەر بۆیە منیش وەك لاوێکی تینو بە خوێندنەوە هەر زوو بەر ئەم شەپۆلە کەوتم. لە کۆمەڵگای کوردیدا کە دەخوێنیتەوە، یان تورِە دەبێت یان دەرئەنجامی تورِەییە. پەیوەندی خوێندنەوە و تورِەیی رەنگە بوارێك بێت پێویستمان بە زیاتر تێرامان هەبێت



لێی. لە ڕاستیدا هیچ هێندەی تووڕەیی ناتوانێت ڕاستی چیەتی ئەوەی لە دونیای ئێمەدا دەگوزەرێت ڕاڤە بکات. وەك چۆن تووڕەیی نابێت پاشخانی شۆڕش بێت کە کامۆ لە کتێبی یاخیدا پێمان دەڵێت، بەهەمان شێوە نابێت پاشخانی گەڕان بە دوای مەعریفەشدابێت. تووڕەیی بوارێکی فەرامۆشکراوە، جگە لە کارە گەورەکەی پیتەر سلۆتەردایك "تووڕەیی و کات" **Zorn und Zeit** کە جۆرێکە لە دەستبازی لە گەڵ ناونیشانە بەناوبانگەکەی هایدگەر کات و بوون، من کاری تر پێنازانم. خوێندنەوەی کامۆ لە ڕوانگەی تووڕەییەوە، وەك تووڕەیەك یان یاخیەك لە دونیای ئێمەدا جگە لە بەهانەی زیاتر بۆ تووڕەییت هیچی تر پێنابەخشێت. ئەمە مەترسیەکی گەورەیە لە مامەڵەکردن لە گەڵ ئەدەبدا. لە ڕاستیدا لە مامەڵەکردن لەگەڵ دەقدا بە شێوەیەکی فراوان. خوێندنەوە بۆ خۆ دڵنیاکردن، بۆ کڵپەدان بە گرکانێکی ناخ. خوێندنەوە گەر نەبێتە مایەی ڕاڕایی، مایەی جودابینی، یان مایەی پرسیار و پیاچوونەوە، ئەوا کارێکی ئایدەلۆژی و دینیە.



سەرباری مێژوویەکی درێژ لە ئامادەبوونی کامۆ، زیاتر وەك ناوێك، یان وەك کاڵایەك، لە دونیای ئەدەبی و ڕۆشنبیری کوردیدا، کامۆ و ڕوانگەکانی بە هیچ شێوەیەك نەناسراوە. دیارە کامۆ هێندەی لە دەرەوەی فەرەنسا جێگای بایەخە نیوهێندە لە نێو فەرەنسادا جێگای بایەخ نییە. هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ دوو بنەما: یەکەم کامۆ لە چینە ئەرستوکراتە ناسراوەکەی فەرەنسا نییە. لە کتێبی وشە: منالییەك کە ڕقم لێیەتی سارتەر باس لە دۆخی چینی ناوەندی خێزانی خۆیان دەکات، کاتێك بەراوردی بکەین لە گەڵ کامۆدا زۆر جیاوازە. دووەم بۆ هەڵوێستی بەرامبەر ڕۆڵی فەرەنسا لە جەزائیر. کامۆ لە پەیوەندیەکی قەیراناویدابوو لە مامەڵەکردنی لەگەڵ کۆڵۆنیالیزمدا. کامۆ لە ساڵی **1942** لە جەزائیرەوە کۆچ دەکات بۆ فەرەنسا. ڕەنگە کێشەی گەورەی کامۆ لەوەدا بێت کە ڕەوشتگەرایە. ڕەوشتگەرایی یانی لە بەرچاوگرتنی دۆخی تاکەکەسی و پشتگوێخستن یان بە هێند وەرنەگرتنی ڕۆڵی دەزگا یان کۆمەڵگا. بەمانایەکی تر دیدێکی فەلسەفیانە نەك کۆمەڵناسیانە. ئەمە وەها دەکات کە کامۆ توشی دوالیزمێك بێت. توشی



ئەدەبی بەردەم

کەرتبوونێك بێت لە ئاگاییدا. بە جۆرێك رخنەگری ئایرلەندی کۆنەر کروز ئۆبرایان دەڵێت کامۆ لە نەستیدا لە گەڵ کۆڵۆنیالیزمی فەرەنسیدا هاوڕابوو، بەڵام لە ئاگاییدا هەوڵی ئەدا دژی بێت. ئیدوارد سەعید دێت دیدی رەخنەی بۆ کامۆ فراوان دەکات، بەجۆرێك کۆبەرهەمی کامۆ و ژیان و ژیاری کامۆ دەخانە خانەیەکەوە کە سەرتاپای دەبێتە مایەی رەخنە. سەعید لە کتێبی کەلتور و ئیمپراتۆریەتدا دەڵێت کامۆ لە جەزائیر گەورەبووە و ژیاوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك زمانی و شێوازی نووسینی بۆنی ئەوەی لێنایەت کە کەلتوری خەڵکی جەزائیری بە هێند وەرگرتبێت. زمانی نووسینی کامۆ زمانی چینی ناوەندی فەرەنسیە. ئەم بێئاگاییە یان ئەم خود بێئاگاییکردنە دەچێتە خانەی بوونی نەبووی ئەویترەوە کە خۆی لە سیاسەتی ئەسیمیلاسیون دا دەبینێتەوە. ئەسیمیلاسیون بە فەرەنسی و ئەسیمیلەیشن بە زمانی ئینگلیزی یانی تواندنەوە. دەکرێت بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دۆخە بۆ خوێنەری کورد نموونەی نووسەرێکی تورك وەربگرین لە تورکیا. ئایا ئەگەر رۆمانی نامۆ پاڵەوانە عەرەبەکەی بکەیتە کورد و شوێنەکەی بگۆریت بۆ تورکیا، کورد چ هەڵوێستێکی دەبێت بەرامبەر دەقێکی وەها. دەقێك کە پاڵەوانەکەی شایانی ئەوە نییە کە ناوی هەبێت. لە کاتێکدا دەزانین





کە پرۆسەی ناونان یان ناونەنان لە دەقی ئەدەبیدا پرۆسەیەکی وردی بە ئاگاییانەیە. بۆ نموونە میرسۆل تورکێك بێت بە ناوی جەنگیز کە وەك سەرباز دێتە مەڵاتیا لەوێ لە ڕۆژێکی گەرمادا لە بێزاریدا کوردێك دەکوژێت. ئەوەی مایەی ڕامانە ئەوەیە گەر سەرجەم پرۆژەی کامۆ وەبگرین دەبینین کامۆ رەخنەگرێکی سەرسەختی شێوازی مۆدرێنی سیاسەتە. رەخنەگرتنی کامۆ لە سیاسەت رەخنەگرتنە لە مەعریفە "ئەپستمۆلۆژیا"، کە دارێژەرێکی ژێرخانی سیاسەتە. بەڵام بە پشتگیریکردنی پرۆسەی توانەوە، کامۆ دەبێتە کەسێکی پراکتیزەکەری سیاسەتی مۆدرێن. زۆر لە لێکۆڵەرەوان کامۆ بە نزیك دادەنێن لە گەڵ سیمون ڤایل، لەکاتێکدا ڤایل بیریارێکی ئاینگەرای فەلەیە.
رەنگە ئەمە لە کتێبی یاخیبووندا باشتر دیاربێت. کامۆ رەخنەگرانە پرۆسەی شۆرش دەگێرێتەوە لە دونیای مۆدێرندا. کامۆ وەك مارکس هاوڕایە لە سەر مەتریاڵ بوونی شۆرش، بەڵام رەخنەی ئەوەیە کە دەبێت نامەتریاڵ



بکرێت ئەویش بە زیادکردنی بیر و هۆش و بەهاو ڕەوشت بۆ شۆرش. شۆرش شۆرش نییە لای کامۆ ئەگەر بەهایەکی بالآی گەردونی بان ـ مرۆڤی نەبێت. شۆڕش دەرئەنجامی ڕق و بێزاری و توڕەیی و تۆڵە و ململانێ نییە. بەڵکو شۆرش بەخشینی جوانی و مرۆڤایەتیە بە دونیایەکی ڕقی بەتاڵ لە جوانی مرۆڤایەتی. قەیرانی ئەم دیدە لەوەدایە کە هەمیشە بە دەقێکی یوتوپی ئەفسانەگەرا دەمێنێتەوە. مرۆڤ مرۆڤە بە هەموو پۆخڵەواتەکانیەوە. گەر بمانەوێت بزانین کە مرۆڤ چۆن دێتە بزاوتن نابێت بیشاعیرێنین دەبێت وەك خۆی ببینین. کێشەی گەورەی ڕۆمانسی سیاسی لەوەدایە کە هەمیشە بە توندوتیژیەکی بێسنوور کۆتایی دێت. کامۆ ڕۆمانسیەکی سیاسییە. پرسیاری سیاسەت ئەوەیە ئایا مرۆڤ وەك ئەوەی کە هەیە یان مرۆڤ وەك کە دەبێت هەبێت؟

با بگەرێنەوە سەر جەزائیر و ژیانی کامۆ و هەڵوێستی. کامۆ ڕەنگە ناهەقی بێت گەر وەها ببینرێت کە بێ دەربەست بووە بەرامبەر دۆخەکە. ئەو گەرچی لە گەڵ پرۆسەی تواندنەوە یان بەفەرەنسیکردندا بوو بەڵام بە گشتی دۆخەکەی پێ باش نەبوو. هەر بۆئەمەش لە ساڵی **1936** پەیوەندی بە پارتی کۆمۆنیستی "شیوعی" فەرەنسیەوە دەکات. بەڵام پاشان کە بۆی دەردەکەوێت کە پارتی شیوعی هێندە جیاوازی لە گەڵ ئەوانیتردا نییە، هەرزوو واز دەهێنێت. دیاردەیەکی سەیرە، فۆکۆ بەهەمان شێوە بۆ ماوەیەك دەبێتە ئەندامی حیزبی شیوعی فەرەنسی بەڵام هەر زوو بۆی دەردەکەوێت کە حیزبێکی زۆر دوورە لەوەوە بۆیە ئەویش هەرزوو وازی لێدەهێنێت.

دیارە پرسی ئەوەی کە ئایا کامۆ شایستەی خوێندنەوەیە پرسیارێکی شایستە بە وەڵام نییە، بەتایبەت کاتێك ئامانجمان لە پرسینی پرسیارەکە وەڵامەکەیەتی. بەڵام ئەگەر ئامانجمان لە پرسیارەکە ئەوەبێت کە چۆن بە ووردی و بەئاگایی کامۆ بخوێنینەوە، بە لەبەرچاوگرتنی کێشە و کەموو کورتیەکانی ئەوا پرسیارێکی ڕەوایە. ئایا کامۆ شایانی خوێندنەوەیە، لە وەڵامدا نەخێر. بەڵام تەنها کاتێك دەزانین کە کامۆ شایانی خوێندنەوە نییە کە نووسینەکانیمان خوێندبێتەوە.



# كامۆ و زەریا و خاك و ئینسان

ئەحمەدی مەلا

میشێل ئۆنفرێ، یەکێکە لەو فەیلەسووفە هاوچەرخانەی ئیمڕۆی فەرەنسا، بە دیدێکی نوێ، مێژووی فەلسەفە لە چەند بەرگێك دەنووسێتەوە. روونتر ئەو دژە-مێژووی فەلسەفە دەنووسێتەوە، هەر لە زەمانی ئەنتیکیتێی یۆنانی دێرینەوە بۆ ئێستا. مەبەستی ئەو روونە، هەروەکوو لە ناونیشانی کتێبەکەشەوە دەردەکەوێت ؛ باس لەو فەلسەفەیە دەکات کە لە پەراوێزی فیکری رۆژئاوا هەڵیکردووە. فەلسەفەیەکی فەرمیی نییە، عاسییە، گیرە، بە کورتی فەلسەفەیەکی یاخییە. نووسەری ناوبراو کاتێك

دێتە سەر ئەلبێر کامۆ، دەڵێ کامۆ ئینسانێکی تەواو راستگۆبووە لە گەڵ خۆی، بە وەفا بووە بەرامبەر بە بۆچوون و بیرکردنەوەکانی، ئینسانێکی "ئەنتێگر" بوو. تەواو بە پێچەوانەی سارتەر کە بە گوێرەی ئۆنفرێ تا رادەیەك هەڵپەرست و دەسەڵاخواز بووە.
رەنگە ئیمڕۆ لە فەرەنسا، کامۆ لە سارتەر زیاتر بخوێندرێتەوە، چونکە کامۆ خاوەن ئایدیۆلۆژیا نییە، ئەو باسی ژیان دەکات، باسی چارەنووسی ئینسان لە سەر گۆی زەمین دەکات، باسی عەدالەت دەکات، باسی جەنگ و فاشیزم دەکات هتد. باس لە تیرۆریسم دەکات، بۆیە هەست دەکرێت کامۆ بۆ ئێستاش دەنووسێت، بەڵام زۆرجار کامۆ وەکو گەلێك لە فیکر و بۆچوون و چەمکی دیکە بە هەڵە دەگوازرێتەوە لای ئێمە. ئەمە هەڵبەتە کێشەیەکە پەیوەندی تەنها بە کامۆوە نییە، بەڵکو پەیوەستە بە ئاستی هۆشیاریی رۆشنبیریی ئێمەوە هەیە و مامەڵەکردنمان لە گەڵ کەلتوور و فەرهەنگی دیکەی جیهان.
ئەمساڵ سەد ساڵ بە سەر لە دایکبوونی "یاخیبوون"دا تێدەپەڕێ. جیاواز لە سارتەر، ئەو لە خێزانێکی یەکجار هەژار لە دایکدەبێ، تەنانەت دایکی نەخوێندەوار بوو، مامۆستاکەی هەست بە بلیمەتی کامۆ دەکات و فێرە خوێندن و نووسینی دەکات، بۆیە لە کاتی وەرگرتنی خەڵاتی نۆبل، لە ساڵی ١٩٥٧دا پێشکەشی ئەوی دەکات.
بەم بۆنەیەوە، بە باشمان زانی چەند نووسەرێك بەسەر بکەینەوە، بۆ ئەوەی بزانین کامۆی ئیمڕۆ مانای چییە؟

یاسمینە کەدرا

لە تەمەنی چواردە ساڵی "نامۆ"ی ئەلبیر کامۆ دەخوێنێتەوە و بە بیروڕای ئەوەی گەورەترین رۆمانی سەدەی بیستەمە. بە شێوەیەکی سادە باس لە ئەبسورد دەکات، شۆڕشگێرانە باسی بابەتەکەی دەکات. وەکو مندالێکی غەمگین باسی جەزائیر دەکات، جەزائیر دەبێتە بابەتی کامۆ. بەڵام رەخنە لە کامۆ دەگرێت و دەڵێ لە رۆمانەکانی تەنها یەك جەزائیر هەیە، ئەویش جەزائیری فەرەنسییە، هەرگیز باس لە جەزائیری بە (کۆ) نەکردووە، مەبەست لە جەزائیری عەرەبی و جەزائیری کابیلییە. لە دەرەوەی جەزائیری فەرەنسی، ئەوەی دەمێنێتەوە شتێك نییە شایانی باس بێت. رەخنە لە کامۆ لەو رووەوە دەگیرێ، چونکە

ئەویتری غەیرە فەرەنسی هەمووو بە "عارەب" ناودەبات، ئەم تێرمە ئاماژە بۆ چەمکێك دەكات بێ بایەخی و بێ موبالاتی پێوەدیارە. هەمووو شتێك ئەگەر ئەورووپی نەبوایە دەخرایە نێو ئەو هەگبەیەوە. راستە وەکو رۆژنامەوان باسی ژیانی رۆژانەی جەزائیرییەکانی کردووە، بەڵام وەکو رۆماننووس حەزم دەکرد پێم بگوتایە " جەزائیر تەنها ئەوە نییە لە سەر کەناری زەریا یەكێك بکوژرێت تەنها لەبەر ئەوەی دونیا گەرمە. پێم دەوت جەزائیر مێژووە، مەلحەمەیە، ئازایەتییە، زیرەکییە و بەخشندەییشە.
بەلام كامۆ نووسەرێکی مەزنی جەزائیرییە و یەکەم خەڵاتی نۆبڵمانە.

**مایسا بەی**

کامۆ یەكێکە لەو نووسەرانە لە هەموان جوانتر باسی خاکی کردووە. من وەکو نووسەرێك لە هەمان چۆڕاوگەوە توێشووی خۆم وەردەگرم : رووناکی، سێبەر، خاك، زەریا. کەس وەکو ئەو جەزائیریی هێندە بە جوانی نەگێڕاوەتەوە. زۆرجار رەخنە لە کامۆ دەگیرێت بەوەی کە میللەتی جەزائیر لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی بە تایبەتی "نامۆ" و "رشانەوە" رەنگی نەداوەتەوە. کامۆ باس لە واقیعێك دەکات، واقیع ئەو کاتەی جەزائیر بەو شێوەیە بووە، راستە لە جەزائیر فەرەنسی و عارەب ژیاون، بەڵام زۆر کەم تێکەڵی یەکتر دەبوون. کامۆ ئەم حاڵەتەی نووسیوەتەوە. لە رۆمانی "خانووە گەورەکە"ی موحەمەد دیبیش کە نووسەر باس لە منداڵی خۆی لە شاری تەلمەسان دەکات، تاقە دەرکەوتنی کەسایەتی فەرەنسی لە رۆمانەکەی ئەو دەمەیە کە عومەر سەبەتەیەك دەباتە بازار و دەچێتە ماڵێکی فەرەنسییەوە، ئینجا رەگەزی فەرەنسی لەو رۆمانە دەردەکەوێت. چونکە لەو سەردەمە گەڕەکی ئەوروپی و گەڕەکی عەرەبی جودا بوون.
بەڵام کاتێك کامۆ لە "دەفتەرەکان"ی ژیانی رۆژانەی جەزائیرییەکان دەنووسێتەوە، باس لە سەرجەم ئەو ناعەدالەتیانە دەکات کە دووچاری عەرەبەکان ببوونەوە، نموونەی ئابوونەی خۆراك وەرگرتن، ئەوەی بەر فەرەنسییەکان دەکەوت زۆر زۆری لەوە زیاتر بوو کە بەر عەرەبەکان دەکەوت، بە تایبەتی کاتێك ئاماژە بۆ بەسەرهاتەکانی ساڵی ١٩٤٥ دەکات، دوا بە دوای رووداوەکانی سێتیف. بە هیچ جۆرێك هیچ مساوەمەیەك بەرامبەر بە



داگیرکاری فەرەنسی ناکات.
کامۆ هەستی بە دابڕانێکی ویژدانی دەکرد، دژ بە توندوتیژییەکان بوو چ لە لایەن داگیرکاری فەرەنسییەوە بووبێت، چ لە لایەن عەرەبە موسڵمانەکانەوە بووبێت. ئەوێك نە فەرەنسییەکان دڵیان پێی خۆشبوو، نە عەرەبەکان.
وەك دەوترێت لەم ساڵانەی دوایی، بە تایبەت لە نێو ئەتیلێکتوالە جەزائیرییەکان هەست بە جۆرە ئاشتبوونەوەیەك لە گەڵ کامۆ دەکرێت، بەڵام ئەمە لە سەر ئەرزی واقیع رەنگی نەداوتەوە، هیچ شەقامێك بە ناوی ئەوەوە ناو نەنراوە، هیچ قوتابخانەیەك ناوی ئەوەی هەڵنەگرتووە، هیچ مەیدانێك ناوی مەیدانی کامۆ نییە.
بە نیسبەت منەوە کامۆ جەزائیرییە، چونکە باس لە خاکی جەزائیر دەکات، ناکرێت کامۆ رەتبکرێتەوە، ئەوێك رووناکی جەزائیر زادی بووبێت. هەمیشە ئەو راستییەی کامۆم لەبیر ناچێت کە وتبووی " من ناتوانم لە دەرەوەی جەزائیر هەڵبکەم، چونکە دەبێ هەمیشە لە تاراوەگەدا بژیم."



## بوالێم سەنسال

ئەوەی بە نیسبەت منەوە جێی سەرنجە، کامۆ بە ئەڤینێکی زۆرەوە جەزائیری دەنووسییەوە. بە شێوەیەکی شەهوانی ئەو وڵاتەی خۆشویستووە. بە وشە، بە نەبرە بە ئاوازێکی رادەبەدەر گوزارشتی لەو وڵاتە کردووە. لە کاتی خوێندنەوەی کامۆ ئەو وڵاتەمان خۆشدەوێ، بە بێ ئەوەی ئەو وڵاتەشمان ناسیبێت، سەرباری ئەوەی کە کامۆ باس لە جەزائیری خۆیمان بۆ دەکات. کاتێك کامۆ دەخوێنینەوە، چاومان بە جەزائیرێکی دیکە دەکەوێت، جەزائیرێکی جوان، باس لە لەش و جەستە دەکات، قسە لە گەڵ ئینساندا دەکات. خەریکە لە جەزائیر ئاشتبوونەوە لە گەڵ کامۆ ساز دەکرێ، پرۆسەی ئەم ئاشتبوونەوەیە سستە، بەڵام بەرەو پێشچوون بە خۆیەوە دەبینێ. بە نیسبەت خۆمەوە، ئەگەر کامۆ لە ژیان بوایە، ئەوە هەموو رۆژێك وەکو خوێنەرێك، بۆیم دەنووسی و پێم دەوت چەند نووسینەکانت ئەفسوونبەخشن و ئیعجابی خۆمم بۆی دەردەخست.

## سارا دیفالا

کامۆ یەکێك لە فەیلەسووفە کلاسیکەکان و

گەردوونییەکان. هیچ نووسەریك نییە بە قەد ئەو باسکرابێت، لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجام درابێت. تەنانەت وەك فەیلەسووفێکی هاوچەرخ حیسابی بۆ دەکرێت. میشێل ئۆنفرای لەبارەی کامۆوە دەنووسێت " رۆمانی رشانەوە، رەمزێکی مەزنە و مێتافۆرێکی روونی دژ بە فاشیسمە، تا ئێستاش بەجێیەو رووداوەکانی رواندە و گرفتەکانی ئیسرائیل و فەلەستینی لەبەر رۆشنایی بخوێنینەوە. لە " مرۆڤی یاخی" کامۆ باس لە یاخیبوونێکی عادیلانە، پێوەردار، ئاشتیانە دەکات. یوتوپییە بێگومان. وانەیەکە لە مەڕ بیرکردنەوە لە دیموکراسی و سۆسیال دیموکراسییەوە.

## میشێل ئۆنفرێ

کامۆ لە گەڵ ئایدیۆلۆژیای باڵادەست نەبوو. ئەو ئینسانێکی ئازاد بوو، ئازادیخوا، سەر بە هیچ شتێك و سەر بە هیچ کەس نەبوو.

ئایا کامۆ فەیلەسووف بوو؟

نووسەرێکی جیهانی بوو، پۆڵێنکردنیشی زەحمەتە. رۆڵەی گەڕەکێکی هەژاری جەزائیرە، هەروەها رۆڵەی سان-ژێرمەن-دێ-پرێیە. داوی دەمەقاڵێیەکەی لە گەڵ سارتەر، ستاتوی بە فەیلەسووفبوونی دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە. بۆ یەکێکی وەکو




مێشێل ئۆنفرێ کە وەکو مۆدێلێك سەیری دەکات و بە گوێرەی ئەو فەیلەسووفێکی تەواوە. "ژیانێکی فەیلەسووفانەی بەسەربرد. فیکرەکان هی خودی ئەوە، وەك هەلپەرست هەرگیز شتی نەنووسیوە. دیدێکی ستراتیژئامێزی نەبوو، گوێی لە دڵ و دەروونی دەگرت. گوێی لە منداڵی خۆی گرت، باوکی کۆچی دوایی دەکات و دایکێکی هەژاری دەبێ. گوێی لە حەوزی ناوەرست دەگرت، رووناکی، ئەمانە فیکری کامۆیان خەملاند. لەبەر ئەمانە، کامۆ فەیلەسووفە!"

بە گوێرەی سارتەر، رەخنەی دوژمنە هەرە سەرسەختەکەی، خودی کامۆ ئەوەی رەتکردەوە کە فەیلەسووف بووبێت " من فەیلەسووف نیم و هەرگیزیش ئەو ئیدیعایەم نەکردووە." لەم رووەوە مێشێل ئۆنفرێ دەڵێت : ئەگەر فەیلەسووف بوون بە بەکارهێنانی موفرەدەی فێنۆمێنۆلۆژیای ئەڵمانی بێت بۆ ئەوەی دونیای پێ قاڵ بکەیت و وەکو نۆرمالیە( سەبارەت بە قوتابخانەی باڵا-پاریس) مەشقەکانت ئەنجام بدەیت، بەڵێ کامۆ لەم رووەوە فەیلەسووف نییە."



ئۆنفرێ دەڵێ : "ئێمە لە قۆناغی ئایدیۆلۆژیا رزگارمان بوو. ئیمڕۆ مێژوو هەق دەداتە کامۆ. روونبینێکی مەزن بوو.

کامۆ زۆر بە هێزەوە دژی کەپیتالیسم راوەستا، دژ بە نائینسانییەتی هەموو سیاسەتێك، چ راسترەو بووبێت چ چەپڕەو. دادوەریی بە بێ ئازادی دیکتاتۆرییەتە، ئازادی بە بێ دادپەروەریش دەبێتە یاسای هەرە بەهێز : کامۆ لە هەمان کات دادپەروەیی و ئازادی دەویست، بۆیە بە ئازادیخواز دەبێ بناسرێتەوە.

ژێدەر
گۆڤاری نوڤێل ئۆبسێرباتۆر.

## ئیتر لە دەرگا نادات؛ پۆستەچی!

حیکایەتێکی چکۆڵە: پۆستەچی، جادووگری دەست زێڕین بوو، لە مەملەکەتە دوورەکان، لە شارە شلۆق و ویلایەتە پڕ لە مرۆڤەکان، لە گوندە دوور و تەریکەکان، لە کوخی نێو لێرەوار و مەزراکانەوە نامەی دەهێناو دەبرد. هەمووان لە دەستی ئەوەوە ژیانیان لەگەڵ یەك دەگۆڕیەوە. ساڵ هات و ساڵ ڕۆی پۆستەچی لە نامەهێنان و بردن نەدەکەوت، بەڵام وردە وردە نامەکانی کەم بوونەوە، ئیتر شارە گەورە و پڕ لە کۆشك و مزگەوت و کەنیسەکان، نامەیان پێ نەدەدا بیگەیەنێت، پۆستەچی دڵگیر بوو، بەڵام هێشتاش بە ئەمەکەوە پەیکی دێنا و دەبرد. ڕۆژ هات و ڕۆژ چوو، پۆستەچی نامەکانی کەم و کەمتر دەبوونەوە، ئەویش پیر و ماندووتر، تا ئەوەی ئیدی هیچ نامەیەکی لە هەگبەدا نەبوو بیگەیەنێت. ماندووانە لە نێو کوچەکانی شاردا دەهات و دەچوو، ڕۆژێك لە دەمەوەختی خۆرئاوابوونی پاییزێکی سارد دا، کیژۆڵەیەك نامەیەکی دایە دەستی، پۆستەچی گەلێك دڵخۆش بوو بەو تاکە نامەیە، دەبوو بیگەیەنێت بە کوخێکی چکۆلە لە جەنگەڵێکی فرە دوور، پۆستەچی کەوتە ڕێ، ڕۆژانێك ڕۆی تا گەیشتە کوخەبۆر، لە دەرکی دا، کەس وەڵامی نەدایەوە، خۆی وە ژورێدا کرد، دیتی ماڵێکی خشتیلەی یەك نەفەری، کەسی لێنییە. جارێکی تر تەماشای پشتی نامەکەی کردەوە بزانێت، نامەکە بۆ کێیە، وەختێك ڕوانی نامەکە بۆ پۆستەچییە بۆ خۆی! پۆستەچی نامەکەی کردەوە، دەستی کرد بە خوێندنەوەی:

سڵاو جەنابی پۆستەچی!

چاوەکانت ماچ دەکەین، دەستت ڕادەموسین، ئەم نامەیە زۆر درەنگ کەوت، بەڵام ئاخرییەکەی گەیشت. ویستمان دوورت خەینەوە لەم شارە گەورە بێڕەحمانە، لەو دێوە زەبەلاحەی بە ناوی تەکنەلۆجیاوە کارەکەی لێت دزی، ویستمان دوورت خەینەوە تا بریندارتر نەبێت، ئێرە کەڵکی ژیانی نەماوە بۆ تۆ، لەوێ لەو کوخ بچووکە دانیشە و

هەرگیز بیر لە هاتنەوە مەکەوە، پۆستەچی ئەزیز، لە ناخی دڵمانەوە خۆشمان دەوێیت..
ئاگات لە خۆت بێت

نامەکە هیچ مۆر و ناوێکی پێوە نەبوو. بەڵام پۆستەچی فرمێسك بە چاویدا هاتەخوارەوە و هەر لەوێ، لەو کوخە بچووکەدا مایەوە، ئەگەر ڕۆژێك ڕێتان کەوتە ئەو کوخە ئێوە لە دەرگای بدەن و سڵاوێکی لێبکەن.

ئەم کتێبە، کتێبی ئەو نامانەیە کە هێشتا دێوە زەبەلاحەکە نەهاتبوو، پۆستەچی بە باشی کاری خۆیی بەڕێوەدەبرد. نامەکانی ناو کتێبی "ئیتر لە دەرگانادات پۆستەچی" نامەی ئەدەبی نێوان نووسەرانی کوردە، کە ساڵانێك لە پاڵ هاوڕێیەتی و دۆستایەتی نێو ژیانی ئاسایی دا، هاوڕێیەتیان بەهۆی کتێب و نووسینەوە لە نامەکاندا ئەزموون دەکرد. ئەم نامانە گەواهیدەری ئەو پەیوەندییە جوانانەن، کە بابەتی گفتوگۆ، باسی ئەدەبیەت و مەراقی جوانیناسی و پاراستنی فەرهەنگ و کلتور بوو. ئەم کتێبە کۆکردنەوەی نامەی ئەدەبی نوسەرانی سێ نەوەی کوردە، هاوتا نوسەرانی دیکەی ناکورد، کە بەرهەمی ئەدەبی سنووری زمانی پێ بڕیون. کۆی نامەکان"١٨٦" نامەی سێ نەوەی جودای دەنگ دیاری ناو ئەدەبیاتی کوردین. نەوەیەك کە بە قەولی زمانی نێو نامەکان، داری فانیان جێهێشتووە و ئێستا لە دارولبەقان، وەك مەلا مستەفای سەفوەت و ئیسماعیل حەقی شاوەیس و ڕەحیمی قازی و ئەحمەد خواجە وهەژار موکریانی و هێمن و چەندانی دیکە. نەوەیەکی تر، کە نەوەی پێشڕەو و دنیادیتەی سەدەی پیش و ئێستاشن، وەك حسێن عارف، عیزەدین مستەفا ڕەسول، شێرکۆ بێکەس، لەتیف هەڵمەت، فەرهاد شاکەلی، ڕەفیق سابیر، محەممەد موکری، نەوەی سێیەم، ئەو نەوەیەن کە ئێستا ئامادەیی تەواویان هەیە و تا ئێستاش نەوەی پڕ ڕەنگی ناو ئەدەبیات و فکرن، وەك شێرزاد حەسەن، مەریوان وریا قانع، فەرهاد پیرباڵ، ڕێبوار سیوەیلی، بەختیار عەلی، نەزەند بەگیخانی و زۆرێکی تر. ئەم سێ نەوەیە بەهۆی نامەوە دیواری نەوەیی دەشکێنن و لە پەیوەندی و ئاڵووێری ئەدەبی و هزریدان، نەوەی کۆن ڕێنمونی نەوەی نوێ دەکات و نەوەی نوێش سەرسامی خۆی بۆ نەوەی پێشوو دەردەبڕێت، بەمەش فرەدەنگی گێڕانەوەکان، کەرنەڤاڵی نەوەکانی

لە ناو کتێبەکەدا سازاندووە.
ئەم کتێبە هەوڵێکی بچووکە بۆ نیشاندانی ڕوویەکی گرنگ و نەبینراوی دنیای ئەدەبیات، ئەو ڕووەی لە ناو خودی نوسەردایە و هەرگیز نەیویستووە لە نێو نووسین و بەرهەمەکانی دا، نیشانی ڕەمکی خەڵك و زۆریبنەی خوێنەری بدات، کەچی زۆر سانایانە لە نێو پەڕەیەکی کاغەزدا بۆ یەکێك لە هاوڕێ و دۆست یان ناسیاوەکانی دەنووسێت و لەبەردەمی دا خۆی ڕووت دەکاتەوە، بێ ئەوەی شەرم لەو ڕووتییە بکات، چونکە لەو ئان و ساتەدا تەنها ئەو دەتوانێت لێی بگات و لە نامەدا  لەگەڵی بکەوێتە نێو گفتوگۆوە. کاتێك سالانێك بەسەر ئەو ڕاز و گفتوگۆ تایبەتانەدا تێدەپەڕێت، نامەدۆستێك دێت و بە جۆریك ئەو نامانە دەبینێت، داوای ئەوە دەکات ئەم نووسینە فەرامۆشکراو یان ڕازدار یانیش شاراوانە، ببێتە موڵکی ئەو خوێنەرانەی، کە بە هەویای دۆزینەوەی ڕووە تاریك و نادیارەکانی نوسەرانن، چونکە ئەوان ڕووە دیارەکەیان خەتم کردووە. ئیدی ئا لێرەدا نوسەرانی نامە دەکەونە جەنگێکی بچوك لەگەڵ خۆیان و کەسی نامەدۆستیش دا، لە لایەك ئاگرێکی ژێر خۆڵەمێش دەردەکەوێت، لە لایەکی ترەوە نوسەری نامە لەو ڕووتییە دەترسێت کە بەرچاوی گشتی دەکەوێت، دەترسێت توشی بەردباران کردن، یان گاڵتە کردن، یان بەزەیی ببێتەوە، بۆیە زۆر بە زەحمەت کەسی نامەدۆست نامەکانیان لە چنگ دەردەهێنێت و دەیانخاتە بەر دەستی خوێنەر.
ئێستا ئەو نامانە لەم کتێبەدا لەبەر دەستی هەموو خوێنەرێك دایە، کتومت وەك خۆی بە بێ دەستکاری و چاکردن و جوانکاری، تاکو تامی ڕەسەنییەتی خۆی لە دەست نەدات.

بوشرا کەسنەزانی

تاهیر بن جەللون

# پیاوێکی تێکشکاو

ڕۆمان



وەرگێڕانی

ئازاد بەرزنجی

### یاخیبوونێك بە بێ بەدیل

# "بووم بە ژێر ڕۆژە خێراکانی مۆدێرنەوە"

### داستان بەرزان

**ئەحمەدی مەلا**

**دەسپێک**

نەوەی دوای راپەڕین خاوەن وزەیە، بەڵام ئەم وزەیە نە کەنالیزە کراوە، نە بە شێوەیەکیش کۆدەبێتەوە کە ببێتە هاندەرێك بۆ گۆڕینی نەخشەی کۆمەڵایەتی ؛ ئەم وزەیە بە نێو دەقەکاندا دەگەڕێ، وزەیەکی سەرشێتانەیە و شت وێران دەکات، بە گژ هەموو شتێکدا دێت و تەنانەت خۆشی بریندار دەکات. بە گژ رابردوودا دەچێت بە بێ ئەوەی کەرەسەکانی هەموو خەملێنراوبن بۆ کردنەوەی دەروازەیەك بەرەو ئایندە، لە ئێستادا ئۆقرە ناگرێ، چونکە ئەم وزەیە لە سیاقەکانی خۆی گەورەترە ؛ بە خەیاڵ هەست دەکرێت لە ئایندەدا دەژی، یا لە نێو جیهانێکی گلۆبالیزەدا، بەڵام رەگوریشەکانی





لە رابردوو ئاو دەخۆنەوە ؛ ئەو توێشووانە هەرس دەکەن کە بەروبوومی رابردووە، خودی ئەم رابردووە بەرجەستەکردنی ئاسان نییە. ریشاڵەکانی لە ئاو و هەوایەکی کۆندا بڵاودەبنەوە کە دەیەوێ شۆڕشی بەسەردا بکات، بەڵام ناتوانێت، رەفزی دەکات، بەڵام نازانێ بەدیلەکان چین.

بو کورتی خودی ژیان دەبێتە قەیران. هەناسەدان زەحمەتە، خەوتن نا ئاساییە، گەڕان و پیاسەکردن گەرای نامۆیی و تەغریبوون دادەنێن. نووسین فریادرەسێکی بێدەسەڵاتە چونکە ئەم نووسینە نەبۆتە بەرهەمی ژیان، بەڵکو لە رەفزکردنی ژیانەوە هاتۆتە بەرهەم.

شیعر لە چوارچێوەی "هەست و حیکمەت و تێگەیشتن"دا دەیەوێ خۆیمان پێ بناسێنێ. ئەم سێ کوچکەیە، دەبنە ئەو کۆڵەگانەی کە شیعری (داستان بەرزان)ی لەسەر بنیات دەنرێ.

١- هەستکردنێکی نوێ دەیەوێ دەقەکان بنووسێتەوە

دەمێکە شیعری کوردی لە هەوارە زیهنییەکانەوە بۆ واقیع شۆڕبۆتەوە، ئەم شۆڕبوونەوەیە خاوەن پەرادۆکسی خۆیەتی ؛ چونکە خودی واقیع شوێنێکی شیعریی نییە، بەڵکو لە ئاڵۆزکارییەکی سەیروسەمەرە پێکدێت ؛ ئایدیۆلۆژیا بە هەموو تەرحەکانییەوە، هەلومەرجی کۆمەڵایەتی بە رەهەندە قەیراناوییەکانییەوە، بارودۆخی سیاسی بە لایەنە هیشکئامێز و برینگەکانییەوە کە لە چوارچێوەیەکی تەسکدا کۆمەڵگا دەخوێنێتەوە. بۆیە واقعی کوردی، واقیعێکی شیعریی نییە، بگرە دژە شیعریشە. شاری سیخناخ بە بێ پلانی تەندروست هەناسەسوارییی دروست دەکات، هاوردەکردنی کەرەسەکانی تەکنەلۆژیای نوێ بە هۆشیارییەکی نوێ، توێژێکی نامۆکار دەخاتە سەر ئەم واقیعە و تەنانەت دایدەپۆشێت ؛ ئینسان وەکو گەمەیەك بە دەستی گەورەکانەوە و گەورەکانیش گەمەیەکی دی بە دەستی هێزە نادیارەکانییەوە برەو بە "لیبرالیسمی نوێ" دەدەن کە دەرکەوتنە کێوییەکانی لە هەرێمی کوردستاندا رەنگ دەدەنەوە.

ئەم واقیعە نامۆکارە، ئینسان تووشی گێژبوون دەکات. ئینسان ئاوڕ دەداتەوە هێچ شتێك نابینێ

کە بۆ توێشووی ئەم سەفەرە بشێت، ئێستایەکی زڕ
بەرەو رووی دەبێتەوە و ئایندە وەکو خەون و خەیاڵێك
ژیانی پڕ لە بێهودەیی دەکات. چەمکەکانی مۆدێرنیتە
سەرهەڵدەدات، بەڵام بە بێ پێگەیەکی فیکریی،
کۆمەڵایەتی، ژینگەیی. لەم ژینگە نوێیە، ئینسان ئەو
کائینە غەریبەیە کە ناگاتە ئەویتر، ئەویترێك کە ناگاتە
ئێمە. تاك گرێدراوی کۆیەکە کە ئەویش لە قوڵایی ناخیەوە
هەست دەکات کە کار لە کار ترازاوە ؛ داستان بەرزان دەڵێ :
دەستمان بە راستی بەر پێستی یەکتر ناکەوێت
بە راستی بۆنی یەکتر ناچێت بە سەرماندا
بە راستی لەرەی دەنگی یەکتر نابیستین ( لا ٣٣)

بۆیە هەستکردن بەوەی کە ئینسان خەریکە خۆی دەدۆڕێنێ، هەستێکی قووڵە لە لای داستان بەرزان، بەڵام ئەم هەستە خاوە، هەڵگری دەلالاتێکە کە وەکو نارنجۆکێك بەرەورووی خاوەنەکەی دەبێتەوە، تەنانەت بە روویدا دەتەقێتەوە.
گەورەترین کارەساتی فیکریی ئەوەیە کە ئینسان هەست دەکات کە ئیدی پەیوەندی لە گەڵ رابردوو نەماوە، یا بە واتەیەکی دی، کەرەسەکانی رابردوو قسەیان پێ نەماوە و زمانیان لە گۆ چووە. ئەم لاڵبوونی رابردووە، لاڵبوونی ئێستاشی لێوە دێتە بەرهەم، چونکە ئەگەر بێت و ئارەزووی ئینسانی لە ساتەوەختێکیدا چڕ ببێتەوە و ئۆخژنبەخشیی  هەنووکەیش بێت، بەڵام ناتوانێت خۆی لە رابردوو داببڕێت.
دەقی شیعریش لە نێو ئەم دیالیکتیکە دەژێت، بەڵام بەجۆرێکی شاعیرییانە ئاودیوی خۆی دەکات و دەکەوێتە شەڕ لە گەڵیدا. هەموو هوروژمێکی راستەقینە بەرەو ئایندە، لە تەقینەوەیەکی رابردووەوە دێتە دی، هەموو ئایندەیەك خەونێکی دێرینە. ئەمە بە تەواوی لە ململانێی نەوەکاندا خۆی بەرجەستە کردووە.

نەوەی شیعری دوای ڕاپەڕین هەست دەکات سنوورێك لە نێوان ئەوان و ڕابردوودا هەیە، هەست دەکات کەلەپووری "باوك" ئیدی فریای خواستەکانی ناکەوێت، هەست دەکات دروشمە سیاسییەکان هی قۆناغە بەسەرچووەکانن، هەستیش دەکات شتێك لە گۆڕاندایە، بەڵام ...؟ گەورەترین پرسیار بەرەورووی ئەم نەوەیە دەبێتەوە کە خودی نەوەکە لە توانایدا نییە بە وردی پرسیارەکە فۆرمولە بکات، نەخوازەڵا وەڵامەکانیش :



نامەوێت بە پێیەکانی باوکم بڕۆم
نامەوێت سەروەرییەکانی باپیرەم بکەمە گوتار (لا ١٧)

"باوك" و "باپیرە" مێتافۆرێکی ئاشکرایە، کەلەپوورێکی لە قسەخراوە، نەهێنراوەتە زمان.
تێکەڵبوونی کەرەسەکانی مۆدێرنیتە بە ڕەقوتەقی، بە هیشك و برینگی، بە تەنهایی، ئەم هەستە لە لای شاعیر بەهێزتر دەکات. هەمومان تابلۆ بەناوبانگەکەی ئێدوار موینخ-مان بینیوە کە ناونیشانی "هاوار"ی دراوەتێ کە لە ساڵی ١٨٩٣ دروستکراوە و هونەرمەند دەڵێ " گوێم لە هاوارێکی بەهێز بوو کە سروشتی دادڕی."
ئەم سەرگوشینەی شاعیرە بە بێ وەڵام دەمێنێتەوە، ئەمە ئەو پەرادۆکسەیە کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆی کرد ؛ ئەگەریش چمکە وەڵامێکیشی دەستکەوێت ئەوە دەیگەڕێنێتەوە بۆ هێزێکی نادیاریی میتافیزیکی "خودا، غەزەبت لێگرتووم!"ە
پەرادۆکسێکی شیعریی نییە، بەڵکو فیکرییە :
لە خەونمدا قژم قەوزەی شین دەگرێت
بە شەقامەکێدا ڕادەکەم
بە هەر دوو دەستم سەرم دەگوشم
هاوار دەکەم : خودا غەزەبت لێگرتووم ( لا ٥٣)

ئەم واقیعە دژوارە ئینسانێك دروست دەكات و كەرەسەكانی بیركردنەوەی پێ نابەخشێت..ئەگەر لە " بواری دەستەواژەیی" دەقەكانی داستان بەرزان بڕوانین، دەبینین لە لایەك دژ بە "باوك" و "باپیرە" وەكو خوازەیەك بۆ كەلەپووری رابردوو بەكارهاتووە، لە هەمان كاتیشدا هەمان دەستەواژەی ئەوان بەكار دەهێنێت و لە فریادرەسێك دەگەڕێت ؛ وەكو لە دوو دێری خوارەوە دەبینرێت.
شاعیر پەنا دباتە بەر پاڕانەوە، پاڕانەوە لە چی؟

هیچم لە دەست نایەت بیكەم
تەنیا دەپاڕێمەوە ( لا ٦٦)

خودی شاعیر هەست بەم دووفاقییە دەكات ؛ دەزانێت رابردوو دەبێتە بارستایی ؛ ئەگەر ئینسان خۆی لەو رابردووە پاك كردەوە ئەوە دڵشاد دەبێت :" مرۆڤی بێ رابردوو شادومانە
ئەوە من ناگرێتەوە ( لا ١١٦)"

٢ - حیكمەت فریادرەسێكی قەیراناوییە

شاعیر لە زۆر شوێن وێنە و دێرە شیعری وامان بۆ دەنووسێت كە لە حیكمەتەكانی رۆژهەڵاتی دێرینەوە نزیكن. حیكمەت چڕكردنەوەی ئەزموونەكانی ژیانە و هەوڵدانێكیشە لە رێژەییەوە بەهایەكی جیهانیی، تەنانەت گەردوونی پێ ببەخشرێت. حیكمەت لە ناواخندا دژە شیعر خۆی پڕ چەك دەكات، چونكە شیعر ناتوانێت مەنگ بێت وەك ئاوێكی وەستاو، شیعر تەنها ئەو دەنگەیە كە لە خوڕەی ئاوەكانەوە گوێمان لێی دەبێت. حیكمەت ئاوێكی وەستاوە! شیعر ناتوانێت باسی وچانی ژیانمان بۆ بكات، زمانی شیعریی لە توانایدا نییە، ئەزموونەكانی ژیان بە شێوەیەك چڕ بكاتەوە بۆ





هەموو زەمان و سەردەمێك بشێ! شیعر هەندەی جوڵەكان دەنووسێتەوە، هەندە ناتوانێت مەنگیی تۆمار بكات.

بۆیە حیكمەت كاتێك ئاودیوی دەقێكی شیعریی دەبێت، ئاوس دەبێت بە قەیران. قەیرانێكی دوو فاقەیە، لە لایەك دەكەوێتە شەڕ لە گەڵ خودی خۆی، لە لایەكی دیكەش دژ بە واقیع، بەڵام واقیعی جەنجاڵی ئێمە بە حیكمەت چارەسەر ناكرێت، ئەگینا لە مێژدابوو، هەموو جۆگەلەكان ڕێڕەوی زەریای حیكمەتییان دەگرتەبەر و گرفت و كێشەكان چارەسەر دەبوون. دونیا بە راوێژ و نەسیحەت بەڕێوە ناچێ!

وانەكانی ئەخلاق فریادڕەس نین، چونكە ئەخلاق لە دووپاتكردنەوەی قسە نەستەقەكان پێكنایەن،لە وانە ئامۆژگارییەكانەوە نایەتە بەرهەم، بەڵكو وانە راستەقینەكانی ئەخلاق لە لێپرسراوییەوە دروست دەبێت، واتە لە پەروەردەكردن و دامەزراندنی پێگەكانی دادپەروەری و داڕشتنی یاساگەلێك كە ئەوانەی سەرەوە بە هەند وەرگرێت. زەمین گەورە بێت یا نا، هیچ لە هاوكێشە راستەقینەكەی ژیان ناگۆڕێت، ئینسان لەوەی ئێستا زەبەلاحتر بێت یا بچوكترین قەبارەی هەبێ، هیچ لە مێژووی بەشەرییەت ناگۆڕێت. یەكێكی وەكو ڤۆلتێر لە حەكایەتە فەلسەفییەكانی ئاماژە بۆ ئەم دیاردانە دەكات، بە تایبەتی لە حەكایەتی " میكرۆمێگا = هەرەبچووك و هەرەگەورە". فیكریی رێژەیی دەهێنێتە نێو فیكریی فەلسەفەی فەرەنسییەوە.

ئەم حیكمەتەی كە شاعیر تێكهەڵكێشی كردووە، وانەیەكی ئەخلاقییە بە بێ كاریگەریی :

مرۆ دەبێت لە ئاسمانەوە سەیری خوارەوە بكات
تا تووشی وەهمی گەورەیی زەوی نەبێت ( لا ٧١)

مێژووی رۆشنبیریی كوردی، بە هەڵبەز و دابەزی مەنهەجیدا تێپەڕیوە، بەڵكو بە بێ مەنهەج گەشەی كردووە، تووشی ساتمەی زۆر گەورە بووە، وەكو سەمەندەر لە خۆڵەمێشی خۆی زیندووبوەتەوە، كەرەسەكانی بە تەواوی نەخەملاون و زۆر ئەستەمە ئاقارەكانی دیاریی بكرێن. لە تێكەڵوپێكەڵییەك

پێکدێت، رەنگە پەنجا ساڵی دیکەش بە تەواوی هێور نەبێتەوە تا رێڕەوی خۆی بدۆزێتەوە. ئەم نامەنهەجییە لە بەرزترین ئاستدا رەنگی داوەتەوە، ئەگەر دەستەواژەکەی گاستۆن پاریس بهێنینەوە یاد، باس لە "بێدەنگی سەدەکان"دەکات ؛ لە لای ئێمە، تەنانەت ئەو سەدانەی کە بێدەنگیش نەبوون، زۆر بە روونی گوێمان لە قسەکانی نابێت.
ئەم نا مەنهەجییەتە هەر لە پێناسەکانی ئێمە بۆ ڕۆشنبیریی دەست پێدەکات تا رۆڵی رۆشنبیر و ئەرکەکانی نووسین و پەیوەندی سەرجەم ئەم چالاکییانەش لە گەڵ ژیاندا. ژیان جەوهەرە، نووسین پاشکۆیە، نووسین هەرگیز نابێتە جەوهەر ئەگەر بێت هەستمان کردبێت خودی ژیانمان دۆڕاندووە. ئەم لێکدانەوەیە و ئەم پەیوەندییە سنوور لە نێوان چاخەکانی ناوەند و چەرخی راپەڕین دادەنێت. مۆنتێن-ی نووسەر و بیرمەندی فەرەنسی سەردەمی راپەڕین بە وردی ئاماژە بۆ ئەم پەیوەندییە نوێیە دەکات.
ژیان ناچێتە نێو هاوکێشەی بردنەوە و دۆڕانەوە، چونکە ئێمە بازرگانی لە گەڵ ژیان ناکەین، بەڵکو هەوڵ دەدەین رێڕەوەکانی بگۆڕین، کەرەسەکانی ئەم گۆڕانکارییانە دەستنیشان کەین هتد.

کە ژیانم دۆڕاند
زانیم نووسین گرینگە ( لا ١٣٩)

٣- تێگەیشتن لە جیهانێك سرك

نەوەی دوای راپەڕین هەست ناکات ئەو دونیای کە گەورەکان دروستیان کرد، هی ئەو بێ. بە پێچەوانەوە هەست دەکات، ئەم دونیا نوێیە هەندەی هی ئەوانەیە کە دروستیان کردووە، هەندە ئەوان خۆیان ناکەنە خاوەنی. موفارەقەی خەونەکانی سیاسی و خەونی نووسەران.
ئەم جیهانە سرکە ؛ نازانین بەرەو کوێ رێڕەو وەردەگرێت. هەرێم بە رووی دونیادا کراوەتەوە ؛





بەڵام لە خۆمان دەپرسین بە رووی چی کراوەتەوە.
ئەگەر ئەم کرانەوەیە لە شەستەکان بوایە، ئەوە رەنگە گەورەترین گۆڕانکاری لە کوردستان رووی دابا، ئەگەر لە حەفتاکانیش ئەم گۆڕانکارییانە رووی بدایە، ئەوە ئیمڕۆ ئێمە لە جیهانێکی دیکە دەژیان، بەڵام کرانەوەی ئیمڕۆ بەرەو دونیایەك کە خودی دونیاکە لە قەیرانە سوودەکانی زۆر سنووردارن. کرانەوەی هەرێم بە رووی دونیا لە ئاڵوێرکردنی کەلوپەل و خولانەوەی سەرمایە زیاتر هیچی دیکە نییە، هیچ بەهانەیەکی پێ نییە جگە لە دروشمەکانی "مافی مرۆڤ" و "مافی ژنان" و "مافی منداڵان" هتد، ئەم مافە بنچینەییانەش زۆر بە مەعلانی لە لایەن سیاسەتەوە ئیشی لەسەر دەکرێ و لە سەر زەمینەی واقیعیش زەربەی لێدەوەشێنرێت.
کەواتە تێگەیشتن لەم جیهانە نوێیە ئاسان نییە. لەبەر یەك هۆکار، کەرەسە و کلیلەکانی کردنەوەی کۆد و نهێنییەکانمان لە لا نییە. هەر ئەم تێنگەیشتنەیە، دەرگاکانی رابردوومان بۆ دەخاتە سەر گازەرای پشت، کاتێك ئاینده نابینرێت، رابروو نەك تەنها بە جوانی، بەڵکو روونتر لە پێشچاومان خۆی نیشان دەدات. هەست و خەیاڵەکانمان بە شێوەیەك دەبزوێنێ و دەیەوێ پێمان بڵێ دوێنی دونیا جوانتر بوو. بەڵام ئایا دوێنی بە راستی دوێنێ جوانتر بوو، یا ئەمە خۆ هەڵخەڵەتاندنێکە بۆ ئەوەی ئێستای پێ رازی بکەین؟

بیر لەو رۆژگارە دەکەمەوە
دارستان بە راستی سەوزبوو ( لا ٣٠)

یەکێك لە گۆڕنکارییە قوڵەکانی کۆمەڵگەی کوردی دروستبوون و چەکەرەکردنی کۆمەڵگەی شارە، رەنگە هێشتا سەرەتایەك بێت، بەڵام ئەم سەرەتایە بە روونی دیارە. تاکو دوێنێش شاری کوردی لە کەڵەکەبوونی ئینسان و سەرجەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە هی چاخەکانی ناوەند

بوون، پێکهاتبوو. شار گوندێکی گەورە بوو. یەکێك لە بەرهەممەکانی کرانەوەی هەرێم بە رووی دونیا دروستبوونی شارە. سەرمایە لە شوێنێك کۆدەبێتەوە و ئیدی سەرجەم پەیوەندییەکان لە دەوری ئەم چەقە خۆیان رێکدەخەن. دەکرێ بوترێت کە سەرمایە بە مانا هەرە سادەکەی لە سەرجەم ئەو سەرمایانە پتەوتر و بەهێزترە کە بوردیۆ ( سەرمایەی کەلتووری، سەرمایەی پەروەردەیی، رەمزی هتد) باسی لێوەدەکات.
ئەمەش دیسانەوە دەبێتە مایەی قەیران. کۆمەڵگەی شار بە ئاسانی دووڕویی کۆمەڵایەتی قبوڵ دەکات. شار واتە گۆڕانکاریی خێرایی رۆڵ و سیما و روخسارەکان. نمایش جێگای کارەکتەری راستەقینە دەگرێتەوە. باسکال، فەیلەسووفی سەدەی حەڤدە، زوو دەیوت "ئینسان بە ماسکەوە پێشدەکەوێ." مۆلییەر لە شانۆنامەکانیدا ئەم کارەکتەرە دەخاتە ژێر میکرۆسکۆبەوە و بە پێکەنینەوە ئەم گاڵتەجاڕییەمان نیشان دەدات.
ئەم هەستە لە کۆمەڵگەی کوردی لە گەشەسەندن دایە ؛ کێ هەست دەکات بەم دیاردەیە ؟ داستان بەرزان بە روونی و بە پێ پێچ و پەنا پێماندەڵێ :
درۆ دەکەین دەقیقەیەك بڕەکات
ماسك نەبێت هەموو دەمرین ( لا ٣٤)
ماسك و مۆدێرنیتێ دوو دەستەخوشکن پێکەوە هەڵدەکەن. ئەوانەی لە گوندەوە دێنە شار خێرا هەست بەم دیاردەیە دەکەن، ئەوانەی لە کوردستان –گوندەوە دەچنە ئەورووپا خێرا هەست بەم دیاردەیە دەکەن. لەم نێوەندە وا هەست دەکرێت سۆز و عیشق و خۆشەویستییەکان لە ناودەچن، ئینسان ون دەبێ. بەڵام ئەوەی ون دەبێ، خۆشەویستی نییە، سۆز نییە، تەنانەت عیشقیش نییە، بەڵکو شێوازەکان، گوزارشتکردن لەم حاڵەتانە گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، بە واتایەکی وردتر، زمانە کە گۆڕانکاری بەسەردا دێت.
لە کۆتایی حەفتاکان گرووپی پینك فلۆید ئەلبومێکی مۆسیقا لە ژێر ناونیشانی "دیوار" دەهێننە





کایەوە و لە ساڵی ١٩٨٢ دکرێتە فلیم، دوای چەند ساڵێکی دی یلماز گونەی فلیمێك بەم ناونیشانە دروست دەکات. پینك فلۆید ئاماژە بۆ بە کەرەسەکردنی ئینسان و تەنانەت بە مێگەلکردنی ئینسان دەکات. رقێکی روخێنەر لە ناو ئینساندا گەشە دەکات و دونیا دەبێتە بەربەست و بە دیوار هەڵدەچنرێ...ئینسان لەم گەردوونە هەند بچووك دەبێتەوە کە ئیدی هەموو بەهاکانی ون دەکات.

ئەم هەستکردنە لە هەرێم لە ژێر پەڕەمووچی شاعیردا دەنووسرێتەوە :

لە ئاهێك دەکەین، لە گەردەلوولی بیاباندا
سەیرکە چەندە ونین ( لا ٣٥)

لە رۆژەکانی مۆدێرنەدا کەس عاشق نابێت
مایە پووچن ئەوانەی دەسووتێن
کەس خەون نابینێت
خەیاڵ مایەی بەدبەختییە
دەبێت شەو و رۆژ لە خودا بپارێینەوە
بمانکوژێت، خودا، بمانکوژێت. ( لا ٣٦)

ئەوەی جێی بایەخ و سەرنجە لە لای شاعیر، نەبوونی هێزی دروستکردنە، یاخیبوون، تێکدانی نەمەتی شیعرنووسینە. ئەم هەستە قووڵە، هەستێکی تراژیدیائامیزە، چونکە ئینسان بەرەو کارەساتی راستەقینە پەلکێش دەکات، وەڵامی شاعیر دەبێ لە ئاستی ئەم هەستە بێت و نارنجۆك بخاتە نێو دێرە شیعرەکانییەوە. لای پینك فلۆید هەست بەو داهێنانە مۆسیقاییە دەکەین کە لە ئاستی ئەو هەستەیە کە ئینسانی دونیای مۆدێرن هەستی پێدەکات...بەڵام زۆر بە داخەوە شاعیر پێمان دەڵێ :

بەیانییەك ماوە خەبەرم بێتەوە
ژیان تۆزێك باش بووبێت ( لا ١١٢)

حەز دەکەین ئاماژە بۆ نەمەتێکی نووسین بکەین کە
ئیمڕۆ لە کوردستان لە لایەن شاعیرانێکی زۆرەوە پەیڕەو
دەکرێ، ئەویش گەڕانەوەیە بۆ منداڵیی. ئەم گەڕانەوەیە
هەڵاتنێکە لە ئێستا و خۆماندوونەکردنیش بۆ درەستکردنی
ئایندە. هیچ نکوڵییەك لەوەدا نییە ئەم دروستکردنە لە ئاستی تاکەکەسیش ئەنجام بدرێت.
هەروەها ئەم گەڕانەوەیە ئەگەر تێکەڵکێش نەبێت لە گەڵ گۆڕانکارییەکی بونیادگەرایی لە ناواخنی زمانی شیعری، ئەوە بە "پاشەکشەکردن" دەبێ بخوێندرێتەوە. ئێمە دەزانین کە شیعر زەمانی نییە، بەڵام زمانی هەیە. بۆیە رەهەندە کاتییەکان دەکرێ بە جۆرێك تەوزیف بکرێن کە لە خزمەتی دروستکردنی زمانێکی نوێی شیعریی کۆتایی بێت. ئەگینا رۆمانسییەتێك باڵی خۆی بەسەر ئەم جۆرە شیعرییانە دەکێشێت کە کەلەپووری شیعری رۆمانسی خەزنەیەکی بۆ جێهێشتووین کە بە تەواوەتی تینوێتیمان بشکێنێ.
ئەمە بە هیچ جۆرێك مانای ئەوە نییە کە ئاوڕ لە رابردوو نەدرێتەوە ( موفرەدە، شوێن، یادەوەری، کەرەسە، ئاماژە...هتد) بەڵام دەبێ بە شێوەیەکی نوێ کە لە ئاستی خواستە شیعرییەکانی ئیمڕۆمان بێت، بەکاربهێنرێن.
ئەم "پاشەکشێیە" لەم وێنە شیعرییە بە جوانی دەردەکەوێت. یاخیبوون بە زمانی منداڵ بۆ ئەوەی دەسەڵات و سەروەری خۆی بسەپێنێ!!

شەوان مەنوو
بەرد بگرە ماڵە دراوسێکان
زەنگی دەرگاکانیان بشکێنە





ریگەمەدە کەس بە گەڕەکەکەتدا بڕوات ( لا ١٣٠)

ئەو چەند ریّرەی کە لەسەرەوە لەمەڕ "دووڕوویی کۆمەڵایەتی" شار نووسیمان، خەریکە دەچێتە دوو توّی هۆشیاریی شاعیرەوە. هەست دەکات کە ژیان شانۆنامەیەکە و کارەکتەرەکان دەبیَ گەمەی خۆیان بکەن. ئەمەیە دونیای نویّ. درکردن و هۆشیاریی لەمەڕ دروستبوونی شار و تێکچڕژانی بەرژەوەندییەکان و سەودا و ئاڵوویّرەکان دەبنە سەنگی مەحەك و بە هەنگاوی یەکەم دەبیَ بژمێردریّت، واتە دوای درکردن بەم حاڵەتانە چۆن شیعر بنووسینەوە؟
لە نێو ئەم "دونیا بیَ رۆح و بەتاڵە"ی کە شاعیر بەمجۆرە ناوی دەبات، پرسیار ئەوەیە : چۆن شێوەکانی گوزارشکردنمان دەسکاری بکەین، یا بە پێچەوانەوە، چۆن ئەم واقیعە نوێیە، ئەم "دونیا نویّ" زمانی شیعریی خۆی بسەپێنیّ. دونیای نویّ بە بیَ زمانی نویّ، واتە هەیکەلێکی بیَ ناوەڕۆك! رەنگە ئەمە پرسیارێکی جەوهەری بێت کە ئاراستەی نەوەی دوای راپەڕین بکریّت!

دونیا ئەوە نییە خەڵکیت لە خۆت خۆشتربوویّت
دەبێت لەسەر هەموو هەموو پەتێك یاریی بکەیت
بەمجۆرە دونیا بیَ رۆح و بەتاڵەکەی
ناوی لە خۆی ناوە "دونیای نویّ" ( لا ١٤٢)

ژێدەر :
لەمەڕ تابلۆکانی میونخ بڕوانە ئەم سەرچاوەیە :
https://www.google.fr/search?q=le+tableau+cri&tbm=isch&tbo=u&source=univ&sa=X&ei=UDiOUp6jL6ar0QWL_oDwAQ&ved=0CD4QsAQ&biw=1366&bih=629

# حەفتا کێل

شیعر

**یەدوڵڵا ڕوئیایی**

بەڕۆژ ئاکرەیی کردوویە بە کوردی

شیعر
یەدوڵڵا ڕوئیایی
حەفتا کێل
بەڕۆژ ئاکرەیی




# ئەلیس مونرۆ

**ئامادەکردنی: ئەدەبی سەردەم**

کاتێك پێتەر ئینگلوند سکرتێری ئەکادیمیای سویدی ڕایگەیاند کە ئەلیس مونرۆ خەڵاتی نۆبڵی پێ بەخشراوە، ئەو کاتە لە کەنەدا سەعات چواری بەیانی بوو، مونرۆ لەگەرمەی خەودابوو، کچەکەی تەلەفوون بۆ دایکی دەکات و خەبەری دەکاتەوە و هەواڵەکەی پێ ڕادەگەیەنێت: "دایکە، برتەوە!" شیلای کچی ئەلیس مونرۆ لەیەکەم وتەیدا بۆ کەناڵی (سی بی سی) کەنەدی وتی:

ـ دایکم توشی هەڵامەت بووە و تەمەنیشی لەسەر و هەشتاساڵەوەیە. شیلا بۆیە ئەم قسەیەی بە کەناڵی ناوبراو وت چونکە ئەوان هەرچەندیان کردبوو نەیانتوانی بوو مونرۆ بدۆزنەوە و وتوێژی لەگەڵدا بکەن. هەروەها وتی:

ـ من هێشتا هەر حەپەساوم زۆریش بەم هەواڵە دڵخۆشم. ئەمڕۆ ڕۆژێکی تایبەتە، چونکە ناوی دایکیشم دەچێتە ڕیزی ئەو خانمە نووسەرانەی کە نۆبڵیان وەرگرتووە.

ئەلیس مونرۆ ئەبێتە سیانزەهەمین خانم کە تا ئێستا نۆبڵی وەرگرتبێت.

کاتێکیش ڕۆژنامە کەنەدییەکان مونرۆیان دۆزییەوە بە تەلەفوون ڕەئی لەسەر خەڵاتەکە خۆیان لێ پرسی:

ـ ئەمزانی من ناوم لەناو پاڵێوراوەکاندایە، بەڵام هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم بیبەمەوە.

هەرە زۆرینەی نووسینەکانی مونرۆ لەسەر ئافرەتانە و بە نووسەرێکی فێمەنیست ناوزەد دەکرێت. وەك چۆن لە گفتوگۆیەکدا لە گۆڤاری ئەتلەنتیکی ئەمەریکیدا وتبووی:

ـ من ژنم و بێگوومان چیرۆکەکانیشم هەر لەسەر ژنانە. من نازانم ئەو چەمکە بۆ پیاوێك چییە کە جگە لەهەر ڕەگەزێکی تر لەسەر پیاو ئەنووسێت؟ هەمیشەش نازانم فێمەنستی مانای چییە. لەسەرەتاوە ئەمووت بێگوومان من فێمەنستم، بەڵام ئەگەر فێمەنستی تەنها مانای ئەوەبێت من شتەکان بزانم و پەیڕەوی تیۆری فێمەنستی بکەم، ئەوا من ئەوە نیم. من کە پێموایە فێمەنستم بەو مانایەیە کە ئەزموونی ئافرەتانم پێ گرنگە.

مونرۆ بەوە ناسراوە کە باس لە ژینگەی دەوروبەری خۆی دەکات، ئەو لە وینگهام لە سەروی ئۆنتاریۆ لە ساڵی 1931 لەدایك بووە لە گەڵ دایکێکی مامۆستا و باوکیدا ژیاوە، لە تەمەنی بیست ساڵیدا شووی کردووە و لەگەڵ مێردەکەیدا گواستویانەتەوە بۆ ڤیکتۆریا و لەوێ پێکەوە کتێبفرۆشییەکیان داناوە. لە هەفتاکاندا لەو پیاوە جیابۆتەوە و جارێکی تر شووی کردۆتەوە و گەڕاوەتەوە ناوچەی ماڵە باوانی. لەگەڵ مێردە تازەکەیدا لە کلینتۆن و ئۆنتاریۆ نیشتەجێ بوون بۆ ئەوەی ئاگای لە دایکە پیرەکەی بێت. بەڵام ئۆنتاریۆ



به شوێنی خۆی و شوێنی بەرهەمە ئەدەبییەکانی دەزانێت.
ـ من باوەڕم بەوە نییە ئەو ڕووداوانەی کە لەسەرم نووسیون تەنها گرێدراوی شوێن بن، ئەگەر لە هەر شوێنێکی تری ئەم زەویەش بژیامایە هەر ئەو شوێنەم وەك شوێنی خۆم لە نووسینەکانمدا بەکار دەهێنا، ڕەنگیشە ئەوکات وردەکاری کەسایەتییەکانم لە ئێستا جیاوازتر بوونایە.
مونرۆ بەراورد بەو نووسەرانەی خەڵاتی نۆبڵیان دراوەتێ جیاوازە، چونکە ئەو یەکەم چیرۆکنووسە ئەم خەڵاتەی وەرگرتبێت.
مونرۆ کێشەی تەندروستی هەبووە، لە کاتێکدا هەم نەشتەرگەری دەماری بۆ کراوە و هەم چەند ساڵێك لەوەوبەریش چارەسەری دژە نەخۆشی شێرپەنجەی بۆ کراوە. کاتێك هاوینی ساڵی پار گفتوگۆیان لە نیویۆرك تایمزدا لەگەڵدا کردووە وتویەتی: ئێستا باشم، یان زۆر خراپ نیم. هەر وەك ئەوەی کەنەدییەکان ڕاهاتوون وا بڵێن.
ـ هیچ چارەیەك نییە، ئەم حاڵەتی تەندروستییەی ئێستا تیایدا دەژیم باشترە لە مردن. من هەست دەکەم ئەوەی ویستوومە کردوومە و هەر ئەمەش وام لێ دەکات تەواو لە ژیانم ڕازیبم.
سەرەتای ساڵی ڕابردوودا مونرو وتوویەتی چیتر ڕەنگە نەنووسێت، چونکە ئەو ئامادەیە کارکەناربێت و دانیشێت، بەڵام ئایا خەڵاتی نۆبڵ ئەم بڕیارەی پێ دەگۆڕێت، ئەگەرچی ئەو بەکەناڵی سی بی سی کەنەدی وتووە:
ـ وا بەرەو پیری دەچم، وەرگرتنی خەڵاتەکەش مانایەکی هێندە گەورەی بۆ خودی خۆم نییە. چونکە من پێموایە ئەم خەڵاتە ڕۆشنایی زیاتر دەخاتە سەر نووسەرانی کەنەدی. پێشموایە ئەمە یارمەتیدەر بێت تا ئەدەبی کەنەدی بەهەموو دنیادا بڵاوبکاتەوە، دیارە تەمەناش ئەکەم هەر وابێت.
مۆنرۆ بە شێوەیەکی زۆر ئاڵۆز دەنووسێت. کاتێ کە خوێنەر دەیخوێنێتەوە نازانێت کە چی لێوەردەگرێت. بەزەحمەت درك بەوە دەکەیت کام لە کەسایەتی ناو چیرۆکەکانی کەسایەتی



یەکەمە، بێگومان ناشزانیت چیرۆکەکەی چۆن کۆتای پێدێت. مونرۆ حەزدەکات چیرۆك لەناو چیرۆکدا درووستبکات لەگەڵ درووستکردنی چەندان کاتی جیاواز کە بەردەوام لە جوڵەدایە.
چیرۆکە درێژەکانی مونرۆ لە نێوان **50** تا **60** لاپەڕەدایە، هەر یەك لەو چیرۆکانە وەك ڕۆمانێکی بچکۆلە وەهایە، خوێندنەوەی تەنها چیرۆکێکیشی بەسە بۆ ئەوەی تا ماوەیەکی درێژ لەگەڵ ڕووداوەکانیدا بژیت.
شێوازی ڕوون و جوانی نووسینی مونرۆ لە نووسینی هونەری چیرۆکدا وەك شێوازی واقیعی ڕۆژانەیی چیخەف وەهایە. تا ئێستا مونرۆ پانزە کۆمەڵە چیرۆکی هەیە. زیاتر ڕووداوەکان هەنووکە و ڕۆژانەین، گرنگترین شت لە چیرۆکەکانیدا کات و وردەکارییەکانیەتی. شێوازی گێڕانەوەی مونرۆ لە چیرۆکدا بەراورد دەکرێت بە شێوازی گێڕانەوەی چیخەف. کاری مونرۆ لە چیرۆکدا زیاتر کارکردنە لە فۆرمدا، ئەمەش وایکردووە ئەو لە **20** تا **25** لاپەڕەدا بە چڕییەکی ئەوتۆ بنووسێت کە ڕەنگە لای ڕۆمان نووسێك ببێتە سەدان لاپەڕە.
بەهۆی نەخۆشییەوە مونرۆ خۆی نایتوانی سەفەر بکات بۆ ستۆکهۆڵم و خەڵاتەکەی وەربگرێت، بۆیە جێنی کچی تەمەن **56**ساڵی نارد تا خەڵاتەکەی بۆ وەربگرێت.

سەرچاوەکان:
ڕۆژنامە سویدییەکان و سایتی نۆبڵ
**DN، Aftonbladet,SvD,**
**Göteborgs posten**
**http://www.nobelprize**



چیرۆک

# ژیانـــی خۆشەویســـت

نووسینی: ئالیس مۆنرۆ
و. لە ئینگلیزییەوە: گۆران مەریوانی



**Dear Life**

**I lived when I was young at the end of a long road, or a road that seemed long to me**

**من** له نەوجەوانیمدا له کۆتایی ڕێگایەکی درێژدا دەژیام، یاخود لەسەر ڕێگایەك که درێژ دەهاتە پێشچاو. کاتێك له قوتابخانەوە،
لەو ئاخرو ئۆخریەشدا، که له خوێندنگەی ئامادەییەوە بەرەو ماڵدەبوومەوە، تەواوی ئەوەی بە هەقیقەت پێیدەگوترا شار، کە هەمیشه جمەیدەهات له جموجۆڵ و چالاکی، شۆسته و دارئەلەتریکی هەبوو، کە تاریکدادەهات پێدەکران، دەکەوتە بەری پشتمەوە. ئەوەی کۆتایی سنوری شاری دیاریدەکرد، دوو پردی ئەمبەر و ئەوبەری سەر ڕووباری مەیتلاند بوون: پردێکیان له ئاسن، تەنگەبەر، هەندێجار ترۆمبێل له بانی دووچاری گرفت دەبوون، بەوەی کامیان بچێتە کەنار و قەیرێ ئۆقرەبگرێ بۆ دەرچوونی ئەوی تریان، پردی دووەم له تەختەدار، بۆ هاتووچۆ، ناوبەناو تەختەدارێکی لێپەرت دەبوو، ئیدی مەردم دەیتوانی له دامێنەوە ڕێك لەو ئاوە ڕۆشنە تیژڕەوە بڕوانێت. ئەمن کەیفم بەوەی دەهات، لێ دواجار هەمیشه یەکێك پەیدا دەبوو تا تەختەدارێك بخاتە شوێن بۆشایی تەختە بەرەوەبووکەوە.

دوابەدوای وان کەلاوەیەکی تەخت، دوو خانووی لەسەر لێواری دارمانی له خۆ گرتبوو، هەموو دەمی بەهارێك بەر لافاو دەکەوتن، وێڕای ئەوەش هەمیشه مەردم ـ مرۆڤ و ئادەمیزادی ـ جۆراوجۆر، دەهاتن و تێیاندا دەگوزەراند. ئەوجا پردێکی تری باریك، بەمبەر و ئەوبەری دەم گەلی ئاشەکەوە کە هێند قوڵبوو بەشی ئەوەی دەکرد بە ئاسانی تێیدا نوقم بیت. ئالەوێوە ڕێگا جیا دەبۆوە و دەبووە دووکەرت، کەرتێکی بە قەدپاڵی گردێکەوە درێژدەبۆوە

بەرەو باشور تا دەبووە جادە -ماشینێکی نایاب، ئەوی دیان بەدەوری مەیدانی بازاڕدا گڕیدەخوارد و ئیدی بەرەو رۆژئاوا خۆی دەکشان.

خراپترین ڕێگا ئەوی من بوو. ڕێگایەکی تریش رووە و باکور دەچوو، شۆستەی خۆی تا مەسافەیەك هەبوو، لەگەڵ برێك خانوو کە بە تەنیشت یەکەوە لکابوون، وەك ئەوەی خانووی نێو شاربن. لە یەکێکیاندا تابلۆیەك لە نێو پەنجەرەیەکیدا دانرابوو، لێی نووسرابوو "چای سالادە" گەواهیدەدا کە رۆژێك لە رۆژان ئەویکانێ فرۆشگا بووبێ. هەر دوا بە دوای ئەو قوتابخانەیەك بوو کە من دوو ساڵی رەبەقی ژیانم تێیدا بەسەر برد و هەرگیز حەزم جارەکی تر بە بینینەوەی نەدەکرد. دواي ئەم ماوە و دەمە دایکم بابمی خستە سەر کەڵکەڵەی کڕینی کۆنە خانووچەیەك لە شار، چونکە بە چونمان بۆشار دەبوو بابم ئەودەم لەوێ باج بدات بۆ منیش دەکرا لە یەکێك لە قوتابخانەکانی نێو شار بخوێنم. پاشان دەرکەوت ئەم شتانە گشتی پێویستی نەدەکرد، چونکە هەر ئەو ساڵە، هەر ئەو مانگەی من تێیدا لە شار دەستم بە خوێندن کرد، جاڕی جەنگ دژی ئاڵمان درا و ئیتر هەر وەکو ئەوەی جادوگەرێ دەستی لە قوتابخانە راوەشاندبێ، لە ئان و ساتدا قوتابخانە هیچ بایەخ و پلە و پایەیەکی نەما، قوتابخانە کۆنەکە کە قوتابییە هار و هاجەکانی نانی نێوەڕوانیان لێدەسەندم و هەڕەشەیان دەکرد کە بیرازمبکەن و کەسی تێدا نەدەحەوایەوە و بە گشتی هیچ کەسێکیش تێیدا فێری چشتێ نەدەبوو. هێندەی نەبرد تەنێ یەك پۆل و یەك مامۆستا مایەوە و وابزانم دەمی پشووش دەرگای پۆلیان نەدەگرت. ئیتر هەر هەمان کوڕگەل کە هەمیشە و بەردەوام پێیان رادەبواردم و وەك عادەتیان لێیان دەپرسیم کە تۆبڵێی ئارەزوی تاکێك نەکەم، ئێستا گشتیان، دوای ئەوەی برا گەورەکانیان دەبوو بچنە سەربازیی، هەڵپەی ئەوەیانە کارێ پەیدابکەن..



نازانم گەر توالێتی قوتابخانەکان لەو سەردەمەدا باشتر بووبێتن یان نا، هێندە هەیە، دەزانم خراپترین شتێك لە قوتابخانە کۆنەکە

تواڵێتەکانی بوون. ڕاستە ئێمە لە ماڵەوە تواڵێتەکەمان لەدەرەوە بوو، لە حەوشێ، بەڵام پاك و تەمیز بوو، تەنانەت عەردەکەشی بە لینێلیوم داپۆشرابوو. لە ڕقدا بوو یان لەبەر هەچ هۆکارێکی تر، کەس لەو قوتابخانەیەدا بەتەنگ ئەوەوە نەدەهات وەختی دانیشتن نیشان لە کونی تەواڵێتەکە بگرێ. خۆ لە شاریش باری من هێند ئاسان نەبوو، ئەوانی تر هەر لە پۆلی یەکەوە یەکتریان دەناسی، شتگەلانێیکیش هەبوون تا ئەو ساتەوەختە من فێریان نە بووبووم، بەڵام چ قەد سەرسامبەخش بوون دانیشتنی سەر ئەو تواڵێتانەی قوتابخانە نوێیەکەم و گوێگرتن لە دەنگی خۆش و خوڕەی شاریانەی ئەو ئاو ڕاما ڵینە.

لە ماوەی قوتابخانەی یەکەممدا، یەك هاوڕێم پەیداکرد. کچێ کە من ناوی بە "دەیان" دەبەم، کەمێ لە ساڵی دووەمی خوێندنم تێپەڕاندبوو. نزیکەی لە تەمەنی مندا بوو، لە یەکێك لەو خانووانەشدا دەژیا کە شۆستەی دەرەوەیان هەبوو. ڕۆژێك پرسی کە داخۆ دانسی چاوبازانەی هایلاندی سکۆتلاندی دەزانم، وتم نازانم، ئەو ئامادەیی خۆی نیشاندا تا فێرمبکا. هەر بەو نیازە، دوای قوتابخانە چووینەوە بۆ ماڵی ئەوان. دایکی لە ژیاندا نەمابوو، ماڵی دایە ـ و بابەگەورەی گرتبوویانە خۆی. جا بۆ ئەوەی دانسی هایلاندی ـ چاوبازانە فێربم، پێی وتم، پێویستت بە جوتێ پێڵاوی ناڵدارە تا لە کاتی دانسدا تەقە تەقی پێبکەیت، ئەو هەیبوو، منیش، بێگومان نەمبوو، بەڵام ژمارەی پامان نزیك وەك یەك وابوو، جا دەکرا  کاتێك ئەو هەوڵیدەدا دانسم فێربکا، پێڵاومان ئاڵوگۆڕ بکردایە، دوای قەیرێ تینومان بوو، دایەگەورەی ئاوی خواردنەوەی داینێ، بەڵام ئاوەکە تامی ناخۆشبوو، هی بیرێکی دەست هەڵکەنراوبوو، ناخۆش هەر بەوەەی قوتابخانە دەچوو. من بۆم ڕوونکردەوە کە ئێمە لە ماڵەوە چقەد ئاوێکی سازگاری بیرێکی ماشین ـ لێدراومان هەیە، دایەگەورەی، بەبێ

ئەوەی بە هیچجۆرێ پێی قەڵسبێ، وتی، ئەویش خۆزگە بە بیرێکی وا دەخوازێ.

زۆری نەبەرد، دایکم لە دەرەوە قوتبۆوە، دوای ئەوەی چووبوو بۆ قوتابخانە بە شوێنما و نە یدۆزیبوومەوە. هۆڕنی بۆ لێدام تا بە ئاگام بێنێتەوە، تەنانەت وەڵامی هێمای خوداحافیزیە دۆستانەکەی دایەگەورەشی نەدایەوە. دایکم ئەغڵەب ترۆمبێلی نەدەئاژوو، کە دەشیکرد، ئیدی هەمیشە بێ ئارامی و نیگەرانیەکی ویقارسیفەت ماوەی ئاژوتنی لەخۆ دەگرت. بە ڕێوە بەرەو ماڵەوە هۆشداری دامێ کە نابێت هەرگیز جارێکی تر سەر بەو ماڵەدا بکەم. (دوایی دەرکەوت کە ئەمە کارێکی هێند قورس و گران نەبێ، چونکە پاش چەند رۆژێ دەیان ئیتر نەهاتەوە بۆ قوتابخانە، دوورخرابۆوە بۆ شوێنێکی تر). من بە دایکم گوت کە دایکی دەیان مردوە، ئەویش گوتی بەڵێ، دەزانم. دانسی هایلاندی سکۆتلاندیم بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی، هەقی خۆتە رۆژێك لە رۆژان بە باشی فێر بیت، بەڵام لەو ماڵەدا نا.

من ئەو دەم نەمدازانی و ـ ناشزانم کەنگێ پێمزانی ـ کە دایکی دەیان لەشفرۆشبووە و بە دەردێ مردوە لەشفرۆشان تووشی دەبن. ئاواتیشی خواستووە لە زێدی خۆی بینێژن، قەشەی کەنیسەکەی خۆشمان کفن و دفن و تەلقینی بە خاکسپاردنی بۆ سازکردووە، بۆچوونی جیاواز هەبوە لەمەڕ ئەو مەتنەی کە لە خاکسپاردنیدا خوێندراوەتەوە. هەندێ پێیان وابووە، دەبوو قەشە هەندێ وشەی فەرامۆشبکردایە و ناویانی نەهێنابان، لێ دایکم وای بۆ دەچوو کە هەق بە قەشەیە.

ئەجری گوناه مەرگە.



ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم روداوەدا گوزەشت ئینجا دایکم ئەمانەی بۆ گێڕامەوە، یا پێدەچوو ماوەیەکی زۆری بەسەردا گوزاردبێ، مودەتێکیش بوو زۆر رقم لە فرەگەلێ لەو قسانەی ئەو دەیگوت دەبۆوە، بە تایبەتی ئەو کاتانەی لە هەڵچونیدا تونێکی دەنگی بەکاردەهێنا وەك ئەوەی سەدای لە یەقیندا بزیرنگێتەوە.

ناوناوە تووشم دەبوو بە تووشی دایەگەورەوە و ئەو هەمیشە بە بینینی

من خەندە بە لێوان بوو. ستایش و ئافەرینی دەکردم کە لە قوتابخانە بەردەوامم و هەواڵی دەیانیشی دەدامێ، دەشیگوت کە دەیان ماوەیەکی باش ئیدامەی، جا لە هەر شوێنێ بووبێ، بە خوێندنی خۆیداوە، لێ بەقەد من نا. بە گوێرەی قسەی دایەگەورەی، ئاخری ئەو ئیشێکی بە نسیب بووە لە ریستۆرانتێ لە تۆرۆنتۆ، لەسەر ئیش جلکی پولەکەداریش دەبێ بپۆشێ. ئەودەم، هێند گەورە بووبووم، بەشی خۆشم عەجول و بێحەیا، تا بەدەر لە هیچ گومانێ بزانم کە لە شوێنێکی ئاوهادا، دەبێ لەو جلك و پولەکانەی رووتیشبێتەوە.

دایەگەورەی دەیان تەنێ کەسێ نەبوو کە بۆچوونیان وابوو من ماوەیەکی زۆر و تولانی لە قوتابخانە مابوومەوە. بە درێژایی ئەو رێگایەی من گوزەرم پێدادەکرد کۆمەڵێ خانوو هەبوون کە میانی نێوانیان زۆرتر بوو وەك لە خانووی نێو شار، کەچی سەرباری ئەوەش کەلاوە و ئەرزی زۆریان لە دەوروپشت نەبوون. یەکێك لەوانە بەسەر تەپۆڵکەیەکی بچکۆلەوە بوو، ماڵی وەیتی ستریت بوو، ڤێتەرانی(٢) یەکەم جەنگی جیهان. برێ مەڕ و ژنێکی هەبوو، کە من بەشبەحاڵی خۆم بە درێژایی ئەو هەموو حەمکە ساڵە تەنیا جارێك دیبووم، ئەویش ئەوجارە بوو کە خەریکی پڕکردنی سەتڵی ئاوخواردنەوە بوو لای پەمپی ئاوەکەیان. وەیتی کەیفی پێدەهات گاڵتە بکات لەمەڕ ئەوەی کە من، حەیف و خەسار قەت قوتابخانە تەواوناکەم و دیپلۆم وەرناگرم. منیش بە شۆخییەوە وەڵامم دەدایەوە و خۆم گێلدەکرد کە هەق بەوە. لە هەقیقەتدا من دڵنیا نەبووم ئەو بڕوای بەچی بوو. بەڵام خۆ هەر بەمشێوەیە خەڵکی دەبوونە ئاشنای تۆ و تۆش بەوان ئاشنا دەبوویت. سڵاوێك لە تۆ و سڵاوێك لەوان و ئەوجا کەمێك ئاخاوتن لەمەڕ ئاو و هەوا و خۆ ئەگەر ترۆمبلیان پێبایا و تۆش پیادەڕەو، ئامادەبوون بتگەیەنن. بە گوند و دێهاتی راستی نەدەکرد، کە خەڵکی عادەتەن جوان جوان دەزانن ماڵە دەر و دراوسێ لە ناوەوە چۆنن و هەمووش، کەم یان زۆر، نزیکەی بە یەك شێوە بژێوی

خۆیان دابیندەکەن.

خۆێندنی منیش، هەچ کەسێ بگری، بۆ ئەوەی ئەو پێنج پۆلەی قوتابخانەی دواناوەندی تەواوبکا، هەر بەقەد ئەوان وەختی برد. بەڵام کەم قوتابی دەیانبڕی. ئەو رۆژانە کەس لە خەڵکی رانەدەبینی لەو ژمارە کەسەی لە پۆلی نۆوە دەچوونە دواناوەندی بە نسیبیان حاسڵبانایا، لێوان لێوان، دوای بڕینی ئەو پێنج ساڵە، لە مەعریفە و ڕێزمان بانایە. هەندێك پاڕتتایم کاریان دەستکەوت و کەم کەم دوای ماوەیەك کران بە فوولتایم. کچان شوویان کرد و منداڵیانبوو، ئیتر ئا بەو شێوەیە یان بە شێوە پێچەوانەکەی. لە دواساڵی پۆلی دواناوەندیدا، کە تەنیا لە چوار بەش یەك بەشی ئەو قوتابیانە مابوونەوە کە لە سەرەتاوە هاتبوون، بۆچوونێك بۆ مەعریفە و، جۆرێك هۆشیاری جیدی لە هەمبەر ئامانج پێکان هەبوو، یان، رەنگە تەنیا پاشماوەی رەگی ئیحساسێك بووبێ کە گوزارشت بوو لەوەی ئێمە لە ئەساسەوە خۆمان سەرقاڵکردوە بە شتی ناعەملی دوور لە پراکتیکەوە، بەدەر لەوەی کەمێ گرینگی بدرێ بەوەی داخۆ چارەنووسمان بە کوێڕا دەگا..

وام هەستدەکرد عومرێك لە زۆربەی ئەو کەسانە دوورم کە لە کلاسی نۆدا ئاشنایان بووم، ئیتر بالێگەڕێم باسی حاڵی خۆم لە قوتابخانەی یەکەمم هەر نەکەم باشە.

شتێك هەبوو لە گۆشەیەکی ژووری نانخواردنماندا کە هەمیشە کەمێ سەرسامی دەکردم کاتێ گسکی ئەلکترۆلۆکسەکەم (٣) دەردەهێنا تا عەردەکە خاوێن بکەمەوە. دەمزانی چییە ـ ژانتایەکی گۆڵف بوو کە تازە و نفت و نوێ دەهاتە بەرچاو، بە دار ـ کڵەب و تۆپی گۆڵفەوە. تەنیا بیرم لەوە دەکردەوە ئەمە چدەکات لە ماڵی ئێمە، من هیچ شارەزاییەکی ئەوتۆم لەو یاریەدا نەبوو، لێ بیر و بۆچوونکی خۆم هەبوو لەمەڕ ئەو کەسانەی سەرگەرمی ئەو جۆرە یاریە بوون. ئەوان لەوجۆرە کەسانە نەبوون کە بەدلەی ئیشیان لەبەردەکرد، وەك بابم، هەرچەندە باوکم کە دەچووە شار پانتۆڵێکی باشتری ئیشی لەبەردەکرد. لە هەندێ ڕووەوە، بیرم بۆ ئەوە دەچوو، دایکم



به هەرحاڵ دەکرێ جۆرە بەرگێکی ئاوها سپۆرت بپۆشن، گەر پێویست بکات، لە ژێر گرێی رەفتەیەکیشدا پرچی جوانی خاو و پەخشانی کۆبکاتەوە. ئەقڵم نەی دەبڕی تۆپێکی ئاوها بهاوێژێتە ناو کونێکەوە. بەدڵنیاییەوە کارێکی بێ بەهای لەوجۆرە، لە ژێر سەنگ و شکۆی ئەودا بوو.

حەتمەن رۆژێك لە رۆژان بۆچوونێکی تری هەبووە. دەبێ وا بیریکردبێتەوە کە بۆ خۆی و باوکم دەلوێ وەك جۆرێکی تر لە خەڵك خۆیان بگۆڕن، خەڵکانێك کە لەزەت لە کاتی دەستبەتاڵیان دەبەن. گۆڵف، ئاهەنگ و زیافەتی ئێواران. رەنگە قەناعەتی بە خۆی کردبێ کە ئەو جۆرە سنور و مەرزانە جیاوازیان نییە. ئەو سەرکەوتو بوو لە باشکردنی گوزەران و حاڵی خۆیدا، سەرکەوتوبوو لەوەدا، لە کێڵگەیەکی بێ ئومێد و کەمتروسکەوە، لە ناوچەی کەنەدیان شیڵدەوە ـ کێڵگەیەك کە گەلێك زۆرتر ئومێدی لێ چاوەڕوان نەدەکرا، لەوەی بابم لێوەی هاتبوو ـ کەچی توانیبووی ببێتە مامۆستای قوتابخانە، بە جۆرێکیش دەپەیڤی کە هامشۆی خزم و کەس و کاری ئاسان نەکردبوو. رەنگە ئەو بیریکردبێتەوە کە ئەو بە ئەندازەیەك خۆی هیلاك و ماندوکردوە، ئیتر بۆ هەچ شوێن و جایەك بچێ بە پیریەوە دێن.

بیر و بۆچوونی باوکم جۆرێکی تر بوون. ئەو وای بۆ نەدەچوو کە خەڵکی شار یان هەچکەسێکی تر جا با لە هەر شوێنێکی ترەوە هاتبن لە خودی ئەو باشترن. بەڵام بۆچونی وابوو کە خەڵکی رەنگە وا بیربکەنەوە. جا پییێی باشبوو هەرگیز دەرفەتیان نەداتێ تا ئەو نیەتەیان دەربخەن.

بۆیە لە کێشەی گۆڵفدا، پێدەچێت، بابم بردبێتیەوە.

ئەو بەو شێوەیە نەدەژیا کە دایك و بابی بە تەمابوون بژی، لەسەر کێڵگە نەخراپ نەباشەکەی ئەوان بمێنێتەوە و رەنجی وان کوێرنەکاتەوە.

ساتەوەختێك خۆی و دایکم زێدە و نشینگەی خۆیان جێهێشت و عەردێکیان لە کۆتایی ئەوسەری ڕێگایەکدا، لە نزیك شارێکەوە، کڕی، نەیاندەزانی ئەو نەخشەو پلانەی ئەوان هەیانبووە، سەروکاری بەخێوکردنی ڕێوی ـ زیوی و، کەمێ دواتریش، مینك (٤) دەبن و، دەرگای بەختیان بۆ دەکاتەوە. بە جەحێڵی بابم زیاتر پێی خۆشبووە سەرقاڵی ئەو مقەستانە بێت کە کەوڵی ڕێوییان پێچێکردوە، وەك لەوەی خەریکی کاروباری کێڵگە و مەزرا بێ یان لە قوتابخانەی دواناوەندی بخوێنێ ـ وێڕای ئەوەش ئەمکارە هێندە پوول دەخاتە گیرفانیەوە کە قەت لەوە و پێش بە خۆیەوە نەیدوە ـ ئیدی کاتێك ئەم بیرۆکەیە لە کەللەی دەدات، بەری نادات و، هەروەك خۆشی بیری لێکردبۆوە، بەدرێژایی ژیانی دوی دەکەوێ. چی پارە و پوولێکی هەبووە لەم بیرۆکەیەدا دەیخاتەگەڕ، دایکیشم چی لە سەردەمی مامۆستاییەکەیدا پاشەکەوتکردوە، دەیخاتە سەر.

چی کولانە، قەفەز و لانۆچکە هەیە تا حەیوانەکان تێیدا بژین، خۆی دروستیکرد، ئەو عەردە پان و بەرینە، دوازدە هێکتار، کە پڕ بە پێستی پڕۆژەکە بوو، سەرلەبەری عەردەکە بە مێرگ و مێرگوزارەوە، بە لەوەڕگاوە بۆ مانگاکانمان و بۆ ئەو ئەسپە پیرانەی کە چاوەڕوانبوون ببنە قووتی ڕێویەکان، بەزیادەوە بەشیدەکرد. مێرگەکە تا ڕۆخی ڕووبارەکە درێژدەبۆوە و دوازدە ڕەشە درەختیش سێبەری بۆ کردبوو.

ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە، دێتەوە یادم کە کوشتارێکی زۆر لەو ڕۆژگارەدا ڕوویدەدا. پیرە ئەسپەکان دەبا ببنایا قوت و ڕێویەکان دەبا هەموو ساڵێك لەیەکدی جودا بکرانابایا، تەنێ ئەوانە گلدەدرانەوە کە بۆ وەچەخستنەوە لەباربوون. لێ ئەمن بەم دیمەنانە ڕاهاتبووم و دەمتوانی بە ئاسانی فەرامۆشیانبکەم، ئەویش بەوەی دیمەنێك بەخەیاڵ دروستبکەم کە لە یەکێك لەو کتێبانەی خوێندبوونمەوە وەرمدەگرت، وەك ئانێ(٥) لەبان تەپۆڵکە سەوزەکە یان پان(٥) لە نێو بێشەلانە زێوینەکەدا.

ڕەشە درەختەکانیش کە سێبەریان لەوەڕگاکەی داپۆشیبوو، کۆمەکیان دەکردم، هەروەها ڕووبارە باق و بریقەدارەکە، بەهەمان شێوە ئەو کانیەی کە لەو کەنگەی سەرو مێرگی لەوەڕەکەوە هەڵدەقولا و ئەسپە حوکمدراوکان بە مەرگ و مانگاکانیش ئاویان



لێدەخواردەوە و ئەوجا منیش، لە جامولکەیەکی فافۆندا کە لەگەڵ خۆمدا بردبوومە وێندەرێ. بۆ هەر کوێ دەچوویت دەبوو پات بنابا بە ڕیخ و تەرسی گەرم و گوڕدا، بەڵام من لە زیهنی خۆم دەرمدەپەڕاندن هەروەك ئانا لەسەر تەپۆڵکە سەوزەکە دەبا بیکردبا.

ئەو رۆژگارە دەبوو ناو بەنا کۆمەکی باوکم بکردابا، چونکە براکەم هێشتا تەمەنێکی ئەوتۆی نەبوو. ئاوی فرێشم، بە پەمپ هەڵدەهێنجا، ئەمسەر و ئەوسەری قەفەز، هێلانە و کولانەکانم دەکرد و پاك و خاوێنم دەکردنەوە، جای ئاوی ئاژەڵەکانم پڕدەکردەوە. کارەکەم پێخۆشبوو. کەیفم بە کارێکی گرینگی ئاوها دەهات و حەزیشم دەکرد کە زۆربەی وەختان تەنیا بم. دوایی دەبوو بۆ ماوەیەك لەماڵەوە بمامایەتەوە و یارمەتی دایکم بکردایە، ئەویش رقی هەڵدەستاندم و عەجولیکردم. "دەمەوەر بووم"؛ وایان پێدەگوتم. دایکم دەیگوت، من هەستی بریندار دەکەم، زۆربەیجار بەوە کۆتاییدەهات، دەچووە گەوڕەکە بۆ لای باوکم و بۆی دەگێڕاوە. ئەویش سەرقاڵی هەر شتێك بایە دەستی لێ هەڵدەگرت و بە قایشەکەی بیرازیدەکردم. (لەو رۆژگارەدا ئەمە سزادانێکی ناباو نەبوو). دوایش دەچوومە سەر تەختی خەوی خۆم دەگریام و نەخشە و پلانم دادەنا کە چۆن هەڵبێم. بەڵام ئەم قۆناغەش بەسەرچوو، لە هەرزەکاریمدا گوێڕایەڵ بووم، تەنانەت رووخۆشیش، چی خەڵك هەبوو کەیفیان بەو بەسەرهاتی سەیر و سەمەرانەی من دەهات کە دەمگێڕاوە، چی لە شار یان لە قوتابخانە روویداوە. خانووەکەمان گەلێك فەرەح بوو. بەتەواوەتی نەماندەزانی کەنگێ بینا نراوە، بەڵام خۆ سەدساڵێك بەلانیکەمەوە دەبوو، چونکە ساڵی 1858 ئەو ساڵەیە کە یەکەم نیشتەجێگەر وێستەیەك لە جێگایەکدا دەکا نێوزەدە بە بۆدمین ـ ئێستا نەماوە و لە نێوچووە ـ کەیەکێ بۆخۆی دروستدەکا و بە رێچکەی ڕووبارەکەدا سەربەرەوخوار

دەبێتەوە تا عەردی ئەوناوە لە دار و درەخت پابکاتەوە کە پاشان دەبێتە گوندێکی تەواو. هێندە نابا گوندە تازەکە دەبێتە خاوەنی کۆمپانیایەکی داربڕینەوە و هوتێلێك و سێ کڵێسا و قوتابخانەی خۆی، هەمان قوتابخانە دەبێتە یەکەم قوتابخانەی من کە زەندەقی بردبووم. پاشان پردێك لەسەر ڕووبارەکە دروستکرا و هێندەی نەبرد بۆ خەڵکی دەرکەوت کە چەند لەبارتر دەبێ گەر بێت و لەبەری ئەوبەری

ڕووبارەکە نیشتەجێبن، لەسەر عەردێك کە بەرزتر بێت، ئیدی بەو شێوەیە ئەو خانوبەرەیەی لە بنەڕەتدا لەوێندەرێ بنیات نرابوون هێدی هێدی کوێربووونەوە و رەشبوون لە بەر چاوی خەڵك، تا بووە ئەو نیمچە ـ کوێرە ـ گوندەی کە من لەوەوبەر لێوەی دوام.

بە عەقڵمدا ناچێت خانوکەی ئێمە یەکیك بووبێت لە نۆبەرەی ئاوەدانکردنەوەی ئەو ناوچەیە، چونکە بە خشتی ـ بڕاو داپۆشرابوو، خانوەکانی تر، پاکی لە دار بوون، بەڵام بە هەموو مەزەندەیەك، ماوەیەکی کورت دوای ئەوان، خانوەکەی

ئێمەش بناغەی بەرزکرابۆوە. پشتی لە گوندەکە بوو، رووشی لە رۆژئاوا، لەسەر دەشتێکی کەمێك سەربەرەولێژ کە بەرەو ئەو گەلیە چەپەرە درێژ دەبۆوە، لەو شوێنەدا کە روبارەکە جایەکی دروستدەکرد، ئێمە ناومان نابوو (بیگ باند). لەولای روبارەکەوە شوێنك هەبوو بە درەختی رەشی هەمیشە سەوز، داپۆشرابوو، رەنگە سەرو بووبن، بەڵام هێند دووربوون مرۆڤ نەیدەتوانی لە حوکمی چاوی تەواو دڵنیابێ. زۆر دوورتر، لە دامێنی سەرەولێژیەکی تردا، خانویەکی تریش هەبوو، گەلێك گچکە لەو دوورەوە دیاربوو، لە چاوی منیشەوە لە خانۆچکەی کورتە باڵاکانی نێو حیقایەتەکان دەچوو. هەرچەندە ئێمە ناوی ئەو کابرایەمان دەزانی کە تیایدا دەژیا، یان رۆژێك لە رۆژان تیایدا ژیابوو، دەشێ ئێستا مردبێت. رۆڵن گرەین، ناوی بوو، سەرباری ئەو ناوە ئەفسوناویەش کە هەیەتی، کەچی هیچ دەور و شوێنێکی نییە لەوەی کە من حاڵیحازر دەینووسم، چونکە خۆ ئەمە سەرگوزشتە و سەربوردە نییە، ئەمە ژیانە.

دایکم، بەر لە من، دووجار منداڵی



لەبارچووبوو، بۆیە دەبێ لە دایکبوونی من، 1931، جۆرێك لە دڵنەوایی دابێتێ. بەڵام دنیا تا دەهات بەرەو خراپتر دەچوو. راستیەکەی باوکم کەمێ درەنگ دەستی دابووە سەروکاری بازرگانی فەرو. ئەو سەرکەوتنەی ئەو بە ئاواتی دەخواست، ئەگەری زۆر زیاتر بوو لە بیستەکاندا، ئەودەم کە تازە فەرو باویبوو، خەڵکیش پارەیان هەبوو. بەڵام ئەو رۆژانە هێشتا ئەم دەستی نەدابووێ. لەگەڵ ئەوەشدا تا سەروبەند و کۆتایی جەنگیش، دەبێ بازاڕ لە کۆتایی جەنگیشدا بووژانەوەیەکی بە خۆیەوە دیبێ، چونکە ئەو هاوینە بوو باوکم خانوەکەی نوژەنکردەوە و خشتەکانیش کە بۆیەیەکی سووری عادەتی کرابوون، رەنگی قاوەیی لێدان. هەندێ گرفتمان لەگەڵ رووکار و دیوی دەرەوی خشتەکاندا هەبوو، چونکە وەك پێویست خانوەکەیان لەسەرما و سۆڵ نەدەپاراست. خەڵکی پێیان وابوو بۆیە و رەنگکردن باشە و سەرماپارێزە، بیریشم ناکەوێتەوە گەر بۆچوونکەیان راستی پێکابێ. وێڕای ئەمانە حەمامێکمان دروستکرد و شوێن ئاسانسۆری نەقلی خواردەمەنیش، کە قەت بەکار نەدەهێنرا، کرا بە دۆلابی ئاشپەزخانە، ژووری نانخواردنە گەورەکەش بەخۆیی و پێپلیکەکانی دەرەوەی، گۆڕدرا و کرا بە ژوورێکی ئاسایی لەگەڵ پێپلیکانەی ناوەوە. ئەم گۆڕانکاریە، بێ ئەوەی بەتەمابم، منی رازی و خۆشحاڵکرد، چونکە باوکم هەر لەو ژوورە کۆنەدا لە منی ئەدا و منیش هەر لەوێدا لە تەریقی و شەرم و شکۆشکانمدا خۆزگەم بە مەرگ دەخواست، ئێستا ژوورەکە هێندە جیاواز و گۆڕاوە، سەختە بە عەقڵی کەسێکدا بێ، شتی ئاوها لەوێدا روویدابێ. من لە قوتابخانەی دواناوەندی بووم و ساڵ لە دوای ساڵ باشتر دەبووم، چونکە ئیتر لە دەرسی وەك ئیشی دەست و دەستوخەت خۆشیمان تێپەڕاندبوو، ئەودەم دەرسی کۆمەڵایەتیش کرابوو بە مێژوو، دەکرا لاتینیش بخوێنیت.

پاش ئەوەی ئەم وەرزە جۆرێك گەشبینی بەخۆیەوە بینی و سەرباری گۆڕانکاری لە دیکۆر و رووکاردا، کاروباری بازرگانیمان هەمدیسان وشکیکردەوە، ئەمجارەیان ئیتر بە ئامان و زەمان راستنەبۆوە. بابم فەروی خۆشدەکرد، لە دەستپێکدا لە فەروی رێوی و پاشان لە مینك، بەڵام بە گشت جۆرەکانیەوە، شەرمەندانە، پولێکی کەمی پەیدادەکرد و، ئیدی دوایی بەڕۆژ دەستیکرد بە تێکدان و لادانی سەرلەبەری کولانە ـ قەفەز و ئەو لانۆچکانەی کە تێیدا کار و کاسپیمان سەریهەڵدا و سەرینایەوە، ئەمانە گشتی پێش ئەوەی پێنج شەفت دەستبەکاربن لەو کۆپمانیایەی ئاسن توانەوەدا کە هەبوو. تا ئیتر نیوەشەوانێ نەدەگەڕایەوە بۆ ماڵ.

بۆ خۆشم هەر لەگەڵ دەگەیشتمەوە ماڵێ، دەستبەکاردەبووم و فراوینی بابم سازدەکرد. دوو کەڵبازم بۆ سوردەکردەوە و کەچەپێکی زۆرم پێدا دەکرد. تەرمۆزەکەشیم پڕدەکرد لە چای خەستی ڕەش. ئینجا چۆرەکێکی بڕشت بە مرەباوە، یان پارچەیەك پای گەورەی خۆماڵیمان بۆ دادەنا، هەندێجاریش دایکم خواردنی بۆ ئامادە دەکرد، هەرچەندە ئیشی هەویری دەستی ئەو بەڕێوە بوو، کەم کەم متمانەی خۆی بدۆڕێنێ.

جا شتێك روویدا، کە نە بە باش نە بە خراپ چاوەڕوان نەدەکرا، بووە گورزێکی گەلێ ماڵوێرانکەری تر بە بەراورد بە زیان و لەدەستدانی دەرامەت. ئەویش سەرهەڵدانی یەکەم نیشانەکانی دەردی پارکینسۆن بوو لە دایکمدا، رۆژگارێ کە ئەو کەمێ لە چلی تێپەڕاندبوو.

لە سەرەتاوە، ئەوەندە پەکی نەکەوتبوو. گلێنەی بەدەگمەن، تەنیا لە حاڵەتی حەپەساویدا سەریدەکرد، بریقەی لیکی سفتی دەوروپشتی لێوی جوان دەبینرا کە لە زێدە تفی دەمیەوە دزەیدەکرد. سبەینان دەبوو کەمێ یارمەتی بدرابا تا خۆی بتوانێ جلی خۆی لەبەربکات، ناو ناوەش دەیتوانی هەندێ کاروباری ماڵێ بکات. سەیر بوو، تا مودەتێکی دوور و درێژ جۆرێك لە توانا و قودرەتی رۆحی لەبەر نەبڕابوو. رەنگە ئێستا بڵێن ئیتر نەگبەتیگەلێکی زۆر ئێخەی بەرنەدان. کاروباری بازرگانیمان تیاچوو، تەندروستی دایکم کەوتبووە سەرەولێژی. تەنانەت لە



دووتۆیی چیرۆکێکی خەیاڵی و فیکشنیشدا جێگەی نەدەبۆوە. بەڵام بەدبەختیەکە لەوەدایە من ئەم رۆژانەم وەك مودەتێکی ناکام و نابەختیار لە بیرەوەریمدا یاداشت نەبووە. حاڵەتێکی تایبەت لە قوڕبەسەری و نائومێدی ماڵمانی نەگرتبۆوە. رەنگە هی ئەوە بێت نەماندەزانی دایکم هەرگیز چاکنابێتەوە، بەڵکو تەنیا خراپتر دەبێ. بەشبەحاڵی باوکم، توانا و قودرەتی خۆی هەبوو، تا ماوەیەکی زۆریش هەر لە دەستی نەدا. ئەو دڵی بە هاوکارەکانی کۆپمانیای ئاسنتوانەوە دەکرایەوە کە فرەگەلێکیان وەك خۆی وابوون، زیاد دەردی کەوتن و یاخود نەگبەتی و بارگرانییان لە ژیاندا چەشتبوو. ئەو حەزی لە کارەکەی بوو، وەك جۆرێك لە زۆرانبازی لێی دەڕوانی، ئینجا سەرباری ئەوەش حەزی لەشەفتی زووی ئێشکچی ـ شەوان بوو. کاریان مێتاڵی تواوە خستنە ناو قاڵب و فۆڕمەوە بوو. کۆمپانیای ئاسنتوانەوە تەباخی مۆدێلی قەدیمی دروستدەکرد کە لە سەرانسەری دونیادا دەفرۆشرا. کارێکی خەتەر بوو، دەبوو تۆ خۆت ئاگاداری خۆت بیت، بە قسەی باوکم. مووچەکەشی موناسیب بوو ـ ئەڵبەتە ئەویش بۆخۆی بەش بە حاڵی بابم شتێکی تازە بوو.

وابزانم ئەو هەر پێیخۆش بوو لە ماڵەوە دوورکەوێتەوە، جا با شانیش بداتە بەر کارێکی قورس و فرە مەترسیدار. دوورکەوتنەوەی لە ماڵەوە و تێکەڵبوونی لە گەڵ پیاوانی تردا کە ئەوانیش گرفتی خۆیان هەبوو، بەڵام درێخییان نەدەکرد تا باشترین هەلومەرج لەو وەزعەی تێیکەوتوون بێننە گۆڕێ.

هەر لەگەڵ ئەو لەماڵ بەدەرئەکەوت من دەستم دەکرد بە ئامادەکردنی خواردنی شێوێ، دەکرا ئەو خواردنانە سازبکەم کە بە لای منەوە عەجیب و غەریب بوون، وەکو سپاگێتی یان ئوملێت(٦)، تا ئەوساتەی ئەمانە هەرزان و تالانبونابا، هەر ئەمانە بوون، دوای ئەوەی لە شۆردنی قاپ

و قاچاخ دەبووینەوە ـ خوشکەکەم قاپ و قاچاخی ویشکدەکردەوە و براکەشم قەناعەت پێدەکرد تا بڕوا و پاشماوەی ئاوی پیسی تەشتی قاپ و قاچاخ شتنکە توڕداتە ئەو دەشتە تاریك و نووتەکەوە ـ (من دەمتوانی بۆ خۆم ئەمکارانە بکەم لێ پێمخۆش بوو هەر دەستوربدەم) ـ ئەوسا پاڵم لێئەدایەوە و هەردوو پام دەخستە سەر ئەو کورە گەرمە، کە دەرکەکەی نەمابوو، دەستمدەکرد بە خوێندنەوەی ئەو رۆمانە قەبە و گەورانەی لە کتێبخانەی شار بەقەرز هێنابوونم: پیاوە ئازادەکان(٧)، لە ژیانی نێو دورگەی ئیسلاندە دەدوا، کە فرە سەختر بوو لە زیندەگی ئێمە، بێ ئومێدیەکی تەواو باڵی بەسەر ئەم دورگەیەدا کێشابوو، یادەوەری شتگەلێك کە رابووردووە، کە بەهیچ جۆرێك لە هیچ شتێکی وا نەئەدوا من بتوانم لێی حاڵیبم کەچی بەو حاڵەشەوە نەمدەتوانی دەستی لێبەردەم، یاخود شاخە ئەفسوناویەکە، باس باسی نەخۆشی سیل بوو، پڕ بوو لە بیانو-و پاساو هێنانەوەی گەورەو گران دەربارەی، لە لایەك، وەك ئەوەی پێناسەی زیندەگی بە جۆرێك لە بلیمەتی و پێشکەوتن بکرێ و، لەلایەکی تریشەوە، وەك تاریکستان و نائومێدیەکی تۆقێنەر. من هەرگیز وەزیفەی قوتابخانەم لەم ساتەوەختە گرانبەهایەدا نەدەکرد، بەڵام کە کاتی تاقیکردنەوە دەهات، ئیتر قۆڵم لێهەڵدەماڵی، شەونخونیم دەکرد و، مێشکم پڕ دەکرد لەو شتانەی بە ئەقڵی خۆم دەبا بمزانییبا. من یادم لە مەدای کورتدا، تابڵێی تیژبوو لە بەرامبەر ئەو ئەرك و وەزیفانەی پێمدەسپێرا باش ئیشیدەکرد.
لەو بڕوایەدا بووم، سەرباری چەندەها نەهامەتی و سەختی، من کەسێکی بەختەوەر بووم..
هەندێجار من و دایکم گفتوگۆمان دەکرد، زیاتر باسی رۆژانی نەوجەوانی ئەو بوو. ئەودەم بەدەگمەن روویدەدا بۆچوونێکی پێچەوانەی ئەوم هەبایە کە چۆن لە شتەکان ورد دەبۆوە.



زۆربەیجار باسی ئەو خانوەی دەکرد کە ئێستا کابرای ڤێتەرانی جەنگی تیێدایە و بە وەیتی ستریتس مەشهورە ـ کابرای کە خەمی بوو بزانێ من چەند ساڵم گەرەکە تا قوتابخانە تەواودەکەم. باسەکە خۆی لە قەرەی ئەو نەئەدا، بەڵکو کەسێکی تر، زۆر لە پێشتر لەو

خانوەی ئێستای ئەودا ژیاوە پێش ئەوەی بمرێ، پیرەژنێکی شێت بە ناوی خاتوو نێتێرفیلّد. خاتوو نێتێرفیلّد بەقاڵێکی خۆی هەبووە، ئەودەم هەموو کەس بەقاڵێکی خۆی هەبوو لە رێیی تەلەفونەوە رایاندەسپارد، کە شت و مەك و خواردەمەنیان بە ترۆمبێل بۆ بەرنە بەر دەرکێیی ماڵێ، جارێك روودەدا، دایکم دەیگێرایەوە، کابرای بەقاڵ بیری دەچێت کەرە لەگەڵ باقی شتە خوازراوەکاندا بنێرێ، یان خاتوو ێتێرفیلّد بیریکردوە داوایبکات، کە جەحێڵە کارگوزارەکە دەرکی دواوەی لۆریەکەی دەکاتەوە تا شتەکان لە ماشین داگرێ، پیرێژن دەبینی لە راسپاردە هێنراوەکاندا نوقسانییەك هەیە، شتێك کەمە، ئیدی دەهری دەبێ. خۆشی بۆ کارێکی وا، جا هەر چۆنێك زانیبێتی، رێکوپێك ئامادەکردوە. خۆیی و قیمەکێشێك بە دەستیەوە حازر و ئامادەن، قیمەکێش بەرزدەکاتەوە بە نیەتی ئەوەی جەحێڵە کارگوزارەکە بە سزای خۆی بگەیەنێت، ـ بێگومان گوناهی ئەویش نییە ـ جەحێڵی کارگوزار هەر ئەوەندەی بۆ دەکرێ بەرەو لای دیوی شۆفێر ـ سوکان هەڵبێ، پێ بە ماشیندا بنێ و خۆی دەربازبکات، تەنانەت فریا ناکەوێ دەری دواوەی ماشێنیش دابخات.

هەندێ وردەکاری ئەم چیرۆکە نەدەچووە عەقڵەوە و مرۆڤی دەحەپەسان، هەرچەندە نە من نە دایکم بیرمان بۆی نەدەچوو ئەودەم. چۆن پیرێژن پێشوەخت زانیویەتی کە لە نێو شت و مەکی راسپاردەی ئەودا کەرە نوقسانی دێنێ و، تیایدا نابێت؟ باشە بۆچی دەبێ بە قیمەکێشێکەوە بێتە دەرێ، پێش ئەوەی بزانێ شتێ نوقسانە؟ هەمیشە قیمەکێشێکی پێبووە، تا لە حاڵەتێکدا، نەکا ئێ ئەمە دنیایە، تووشی بێ بە تووشی بەلایەکەوە؟

وا قاوبوو گوایە خاتوو نێتێرفیلّد بەڕاستی خانم بووە لە سەردەمی لاوێتیدا.

سەرگوزشتەیەکی زۆر زیاتر لەمە گرینگتر هەبوو لەمەڕ خاتوو نێتێرفیلّد،

چونکە هەم منی تێدا بووم و هەم لەدەورو و پشتی ماڵی ئێمەشدا روویداوە. رۆژێکی خۆشی پایز بووە. منیان خستۆتە نێو عەرەبانەی منداڵی خۆمەوە و بردومیانەتە دەرێ بۆ سەر ئەو چیمەنە تازە چێکراوە شینبووە. ئەو پاش نیوەڕۆیە باوکم لە ماڵەوە نەبووە - دایکیشم سەرقاڵی برێك جلشتن بووە لە تەشتی بەر بەلوعەکەدا. لەبەر ئەوەی من یەکەم منداڵیش بووم پۆشتەو پەرداخبووم بە جلوبەرگی بەدەستچنراو - وقردێلە و رەفتە و زۆر شتی تر کە دەبا بە دەست و بەوپەڕی وریاییەوە، لە ئاوی سازگاردا، بشۆردرابا. هیچ پەنجەرەیەکیش لای دایکمەوە، لەو جێگایەدا کە دایکم جلی لە سینکی بەر بەلوعەکەدا دەشت و لە ئاوی هەڵدەکێشا، نەبووە، گەر بتویستبا لە دیوی دەرێ بڕوانی، دەبا مەتبەخت تەیبکردبا بۆ بەری ئەوبەر، بۆ لای پەنجەرەی بەری باکور. ئیتر لەوێوە دەمی رێگاکەت دەبینی کە لە سندوقی پۆستەکەوە درێژدەبۆوە بۆ بەردەرکی ماڵێ.

بۆچی دایکم بە خەیاڵیدا هات دەست لە جلشۆریەکەی هەڵبگرێ، لاکاتەوە تا تەماشایەکی دەمی راستە جادەکە بکات؟ چوون چاوەڕوانی کەسی نەدەکرد. باوکیشم لە گەڕانەوەی دوانەکەوتبوو. دەشێ داوای شتێکی لێکردبێت کە تا لای بەقاڵەکە بڕوا، تا شتێك کە ئەو پێویستی بووبێ بۆ سازکردنی، جا هەر شتێك بووبێ، شێوی ئەو ئێوارەیە، دەشبێت بە خەیاڵیدا هاتبێت، گوتبێتی بزانم فریام دەکەوێت، ئەو پێداویستیەم لە وەختی خۆیدا فریادەخات تا سازیبکەم. ئەو رۆژگارە دایکم دەستی چێشتلێنانی گەلێك رەنگین بوو - زۆر وەستاتر بوو لەوەی خەسوی لەتەك ژنگەلێکی خزم و ناسیاوی بابم بە پێویستیان دەزانی.
ئەگەر رەچاوی مەسرەف و خەرجی تێچوونی بکرابایا، وەك ئەوان دەیانگوت.



یان دەشێ پەیوەندی بە شێوی ئەو ئێوارەیە نەبایا، بەڵکو کێشەی نەخش و نیگاری جلکێك بووبێ کە باوکم دەبا لەگەڵ خۆی بیهێنابا، یاخود قوماشێك، پارچەیەك بۆ کراسێکی ئاودامانی نوێ، دایکم بەتەمابووبێ بۆ خۆیی بدروبا.
ئیتر ببڕای ببڕای دوای ئەم رووداوە

نەیگوت لە پای چی وا یکرد.
بەدگومانی لە دەستی ئاشپەزی دایکم تەنیا گرفت و کێشەی خانەوادەی ماڵی بابم نەبوو. حەتمەن دەبێ، لەو بەینەدا، قسە و قسەلۆکیش لەمەڕ جلوبەرگیشی کرابێ. بیر لەوە دەکەمەوە دایکم چۆن خۆی ئاسایی عەسران، تەنانەت گەر تەنێ راوەستابا و جلکی بشتابا لەبەردەم سینکەکەدا، جلوبەرگی خۆی دەگۆڕی. نیو سەعاتێکیش دوای فراوین دەنوست، لەگەڵ راشدەبوو هەمیشە بەرگێکی تری دەپۆشی. دوایی، رۆژگارێکی تر، کاتێك لە فۆتۆگرافەکانی ئەو ورد دەبوومەوە، بەلامەوە سەختبوو بڕوابکەم کە مۆدەی ئەو زەمانە لە دایکم، یان لە هیچکەسکی تر، هاتبێ. پۆشاکی ژنانی ئەو عەیامە فۆرمێکی نەبوو، فەردە ئاسا دەوەستا، مۆدەی قژی کورتی تا سەر شانیش لە روخساری خڕ و نەرم و ناسکی دایکم نەدەهات. بەڵام هیچ گومانی تێدا نەبوو ژنگەلی خزمانی بابم، کە هێندە نزیك لێمانەوە دەژیان، هەمیشە بۆیان دەکرا چاوێکیان بخەنە سەر دایکم، هیچ قسەیەکیان لەوبارەیەوە نەبوو. نەگبەتی دایکم لەوەدا بوو، وا نەدەهاتە پێشچاو وەك ئەوەی خۆی چۆن بەسروشت، بەتەبع وابوو. وا نەدەهاتە بەر چاو وەك ئەوەی لە مەزر و کێڵگەیەکدا گەورەبووبا، یان وەك ئەوەی بڕیاریدابا کە لە مەرز و کێڵگەیەکدا بمێنێتەوە.

ئەو ترۆمبێلەکەی باوکمی نەبینی بە راستە جادەکەدا بگەڕێتەوە. لە جیاتی ئەو، پیرەژنی بینی، خاتوو نێتێرفیڵد. دەبێ خاتوو نێتێرفیڵد بە پێ لە ماڵی خۆیەوە بەڕێکەوتبێ. هەمان خانوو، ماوەیەکی زۆر دوای ئەم رووداوە، من کابرای یەك-قۆڵم تێدا بینی، کە پێی رادەبواردم و، تەنیا بۆ تاقە جارێك، یەك زەڕەم لە ژنە پرچ کورتەکەی لای پەمپی ئاوەکەوە بینی. ئا ئەو خانووەی کە ئەو پیرێژنە شێتە رۆژگارێك زۆر لەوەوبەر، پێش

ئەوەی من هیچ شتێك دەربارەی ئەو بزانم، دوای تەتەری جەحێڵ کەوتبوو بە قیمەکێشێکەوە، هەر لەبەر ئەوەی لە بیریکردبوو کەرە لەگەڵ خۆیدا بپێچێتەوە و بهێنێ.

دەبێ دایکم لە چەند دەرفەتێکی جیاوازدا خاتوو نێتفێرفیڵدی بینیبێت بەر لەو رۆژەی ئەو بە راستە جادەکەدا بەر و ماڵی ئێمە دەکەوێتە رێ. رەنگە ئەوان قەت بەیەکیشەوە قسەیان نەکردبێ. بەڵام رێشی تێدەچێ، جا هەرچۆنێك بێ، کردبێتیان. رەنگە دایکم مەسەلەکەی بە جیدی وەرگرتبێ، هەرچەندە باوکیشم پێی گوتبێت کە کێشەکە ئەوە ناهێنێت. رێی تێدەچێ، باوکم بەو نیازە، رەنگە تووشی گێچەڵت بکا، شتێکی لەوجۆرەی گوتبێ. دایکم هاوخەمی کەسانێك بوو، وەك خاتوو نێتێرفیڵد، تا ئەودەمەی بێوەی بوون.

بەڵام لەو ساتەوەختەدا نە بیری بۆ بێ وەیی، نە هاودەردی چوو بوو. ئێستا بە هەڵەداوان لە دەرکی مەتبەقەوە دەرکەوت تا پڕم پێدابکا و لە عارەبانەی مندالانەم دەربێنێ. سەرعارەبانە و دەسماڵ و بەتانی هەر لەوێدا بەجێهێشت و بەڕاکردن خۆی کردەوە بە ماڵدا و هەوڵیدا دەرکی ئاشپەزخانە جوان لەسەر خۆی گەڵەدا. بێ خەم بوو لە دەرگای دەرێ ـ چونکە هەمیشە داخرابو ـ بەڵام کێشە دەرگای مەتبەق بوو. هێندەی من ئاگاداربم، قەت قفڵێکی رێکوپێکی نەبوو. بوبوو بە عادەت شەوانە کورسیەکی مەتبەقیان هەڵدەسپارد بە دەسکی دەرکی مەتبەقێ، تا گەر کەسێ هەوڵیدابا بێتە ژوورێ، کورسی بترازێ و زرمەیەکی ترسانکی لێ هەستێ. شێوەیەکە، بە لای منەوە، لە جۆری بیرکردنەوەی خۆت و بەختت لە بواری ئاسایش ـ و ماڵپارێزیدا، کە بەراورد ناکرێ بە شێوە بیرکردنەوەکەی باوکم کە بە هەقیقەت دەمانچەیەکی تۆپڵی، لە چەکمەجەی مێزەکەی ماڵەوەیدا هەبوو. سەرباری ئەوەش لە ماڵی پیاوێك کە بەردەوام دەبوو ئەسپ کوشتاری بکا، بوونی تفەنگێك و دوو تاپڕ، شتێکی گەلێك ئاسایی بوو. بێگومان زامنیان داخرابوون. تۆ بڵێی دایکم قەت، کاتێ شانی کورسیەکەی دەخستە ژێر دەسکی دەرگاکە، بیری لە چەك نەکردبێتەوە، گەر بۆ تاقە



جارێکیش بێ؟ داخۆ قەت لە ژیانیدا دەمانچەیەکی بە دەستەوە گرتبوو، یان چەکێکی خستبێتە سەرپێ؟

تۆ بڵێیی هەرگیز بە بیری دایکمدا نەهاتبێ کە پیرێژن رەنگە تەنیا بۆ سەردانێکی دراوسێیانە هاتبێ و هیچی تر؟ بڕواناکەم. حەتمەن دەبێ لە رێکردنیدا شێوە جیاوازییەك هەبووبێ. دەبێ نزیکبوونەوەی بە عەزمێکەوە بووبێ کە بە هی ژنێ نەچووە بە قەسدی میوانی بە راستە جادەیەکدا بێ، نزیکبوونەوەیەکی دۆستانە نەبووە لەسەر ئەو رێجادەیەی بەر ماڵی ئێمە.
دەشێ دایکم نوێژ و دوعاشی کردبێ بەڵام هەرگیز باسێکی لێوە نەکرد.

ئەو دەیزانی پشکنینی ورد بۆ دەسماڵی سەرعەرەبانە و بەتانیەکەی کراوە. چونکە، هەر بەرلەوەی بە توزێك لولە تۆپی پەردەی سەر پەنجەرەی دەرگای مەتبەق بە پەلە داباتەوە، یەکێك لەو سەرجێیی عەرەبانە منداڵانەی بینی چۆن هەڵدرا بە حەوادا و ئەوجا کەوتەوە سەر عەرد. ئیدی دایکم هیچ هەوڵێکی تری نەدا تا لولە تۆپی پەردەی سەر باقی پەنجەرەکانی مەتبەق بەرداتەوە، بەڵکو منی توندتر لە ئامێزی خۆی نا و لە گۆشەیەکی نەبینراودا خۆی مەڵاسدا. هیچ تەقولبابێکی حەیابەرانە لە دەرگەی ئاشپەزخانە هەڵنەستا. هیچ پاڵێکیش بە کورسیەکەوە نەنرا. نە کورسی بەگازی پشتا بەربۆوە و نە زرمەی لێ هەستا. دایکم لە گۆشە پەنهانەکەی خۆیدا، نزیك بە ئاسانسۆری خۆراکی ئاشپەزخانە وەستابوو، یەك لە دوای یەك ئومێدی دەخواست، ئەو بێدەنگییەی ماڵی لەخۆ گرتبوو، نیشانەی ئەوە بێ ژنە بۆچوونی خۆی گۆڕیبێت و بەرەو ماڵەوە گەڕابێتەوە
بەڵام نەخێر. ئەو بە دەوری خانوودا دەهات و قەیرێکی باش لەبەردەمی

هەر پەنجەرەیەکی نهۆمی عەردیدا دەوەستا. گومانی تێدا نییە بەو رۆژە خۆشە پەنجەرەکان گەڵە نەدرابوون. ئەو جوان بۆیدەکرا روخساری بنێتە سەر یەك بە یەکی شووشەی پەنجەرەکان. جا لەبەر ئەوەی رۆژێکی تابڵێی خۆشیش بوو، لولە تۆپی پەردەی سەر پەنجەرەکان هێندەی بکرێت بەرزکرابوونەوە. ژنە باڵای هێند بەرز نەبوو، لێ پێویستی نەدەکرد خۆی بەرزبکاتەوە تا دیوی ناوەوە ببینێ.
دایکم ئەم شتانەی چۆن دەزانی؟ خۆ منی لە باوەشی خۆی نابوو، دەسا چۆن بەو ناوەدا رابکا، لە پشت ئەو مۆبێلە بۆ پشت مۆبێلەیەکی تر، تا خۆی قایمبکات، لە دەرەوە بڕوانێ، زەندەقی لە ترسا چووبێ و دوو چاوی ئەبڵەقگیر ببینێ لێی بڕوانن و دەشێ بە زەردەخەنەیەکی قەشمەرگیرەوە لێیان روانیبێ.

لە نزیك ئاسانسۆری مەتبەقەوە بە پاوە مایەوە. ئاخر چ دەتوانێ بکا؟

راستە، ژێرزەمینمان هەبوو. پەنجەرەکانی هێند تەنگبوون کەس بۆی نەدەکرا لێیانەوە خۆی بکێشێتە ناوەوە. بەڵام هیچ ئەڵقەڕێژك لە دیوی دەرەوە بە دەرگای ژێرزەمینەکەوە نەبوو. هەر چۆنێ بێ، لەوێ، وەزعەکە بە هەموو شێوەیەك ساماناکتر دەبوو، گەر لەو تاریکە و نووتەکیەدا، لەو ژێرزەمینەدا، بوەستی و گەر ژنە دواجار بکرایە بۆی خۆی بکردایە بە ماڵدا و بە پێپلیکانەی ژێرزەمینەکەدا خلبوایەتەوە، دۆخ نالەبارتر دەبوو.
ئەڵبەتە هۆدە و ژووری تر لە نهۆمی سەریشەوە هەبوون، بەڵام دایکم بۆ ئەوەی خۆی بگەیانایەتە ئەوێ، دەبوو کەلەگیەکەی ببڕیایە، ئەو ژوورە گەورەیەی کە لە ئایندەدا بووە شوێن تەمبێکردن و بیرازکردنی من، بەڵام کە پێپلیکانە تازە دروستکراوەکانی ناوەوە ئەو رووبەرەیان داپۆشی، ئیتر ترس و تۆقی خۆی لەدەستدا.



بیرمنایە کەی یەکەمجار دایکم ئەم چیرۆکەی بۆ من گێڕایەوە. بەڵام وابزانم ئەو کاتە بوو کە جۆر و نەقڵی سەربوردی پێشوو تری ئەم چیرۆکە لەو شوێنەدا بە کۆتا دەگا کە ـ خاتوو نێترفیڵد روخسار و دەستی

دەنێ بەشووشەی پەنجەرەیەکەوە، ساتەوەختێکە دایکم جوان خۆی حەشارداوە. لێ هەندێ جۆر و سەربوردی دوایی تری نەقڵەکە لەو جێیەدا کە ژنە سەیردەکا، دێتە پایان. ئینجا بێ ئارامی و ترس دایدەگرێ و دوابەدوای دەنگی زرم و کوت دێ. بەهیچ جۆرێ باسی قاو و قیژ و هەرا و هوریا نەکراوە. رەنگە پیرەژن توانا و حەوسەڵەی شتی وای نەبوبێ. رەنگیشە کە کەف و کوڵی دادەمرکێتەوە، دێتەوە یادی ئیتر لە پای چی هاتووە.

بە هەرحاڵ، سەرنجام وازدێنێ و تەسلیم دەبێ، ئەوە ئیتر تەوای ئەو کارانە بووە ئەو کردوێتی. دوای ئەوەی بەدەوری خانووەکەدا خولێك دەخوا و سەیری سەرلەبەری دەرگا و پەنجەرەکانی دەکا، ئەوسا دەستهەڵدەگرێ و بە رێی خۆیدا دەگەڕێتەوە. دایکم دوایی، لە بنی ئەو بێدەنگی و کپییەدا، غیرەت دەداتە خۆی، لە دەوروپشتی خۆی دەڕوانێ، لە کۆتاییدا وای بۆدەچێ کە دەبێ خاتوو نێتێرفیڵد بەرەو جایەکی تر رۆیشتبێ.

سەرباری هەموو ئەمانەش کورسیەکەی لە دەسکی دەرگاکە دەرنەهێنا تا باوکم گەڕایەوە ماڵێ. من نامەوێ لەم رێیەوە بڵێم کە زۆرجار دایکم بەتایبەتی باسی ئەم بەسەرهاتەی کردووە. نەدەچوونە ریزبەندی ئەو باس و خواسانەی کە من ئاشنایان بووم و، زۆربەی وەخت، بە گرینگم دەزانین. هەوڵوتەقەلای دایکم تا دەستبکات بەخوێندن لە قوتابخانەی دواناوەندیدا. ئەو قوتابخانەیەی ئەو دەرسی تێدا دەگوتەوە، لە ئالبێرتا و منداڵان بە سواری ئەسپ دەهاتنە پێش دەرگای، هاوڕێکانی قوتابخانەی ئاسایی، ئەو گاڵتە و یاریە بێگوناە و پاکانەی ئەوان ئەودەم دەیانکرد.

من هەمیشە، جا ئەو هەرچی بگوتایە، پەییم بە مەبەستی دەبرد و

دەفامیم چ دەڵێ، تەنانەت گەر سەدای روونیش نەبووایە و هەر لە بۆڵە بۆڵی بکردایە، خەڵکی تر حاڵی نەدەبوون. من وەرگێڕی بووم، جار ناجارەش لێوان لێو دەبووم لە نا ئومێدی کە دەبوو هەموو ئەم رستە ئاڵۆزانە یان گوتەیەك کە ئەو وایدەزانی شۆخی و گاڵتەیە و، منیش جوان دەمبینی کە ئەو خەڵکە میهرەبان و سادەیە کە وێستەیەکیان کردوە تا بە سەرپاوە کە من بدوێن، چۆن خوا خوایانە نە جاتیان بێ و زوو هەڵبێن.

دیدەنیەکەی نێتێرفیلد، خاتوونی پیرەساڵ، وەك ئەو ناوی لێنابوو، بەسەرهاتێك بوو کە پێویستی نەدەکرد من جارێکی تر باسیبکەم. بەڵام رووداوێکیش بووە کە دەبێ من لە مێژبێ، پێی ئاشنابووبم. لە بیرمدێتەوە، جارێ لە گەرمەی باس و خواسدا لێم پرسی، خەبەرێکی لەو ژنە پیرە هەیە کە چی لێ بەسەر هاتبێ!

بردیان"، گوتی. "ئۆه، وابزانم. نەیانهێشت بەتەنیا سەربنێتەوە"."

کە شوومکرد و گواستمەوە بۆ ڤانکۆڤەر، بەردەوام لە شارەکەی خۆمەوە کە تێیدا گەورەبوبوم، هەفتانامەیەکم بۆ دەهات کە لەوێندەرێ پەخشدەبوو. وابزانم یەکێك، رەنگە باوکم یان ژنی دووەمی، راپەرموبوون تا بێبەش نەبم لە بەشداربوونی رۆژنامەکە. زۆربەیجار چاویشم لێنەدەکرد، لێ جارێ سەیرمکرد، چاوم بە ناوی نێتێرفیلد کەوت. ناوی کەسێك نەبوو کە لەودەمەدا لە شار ژیابێ بەڵام دیاربوو ناوی ژنێك بوو لە پۆرتلاند، ئۆریگۆن، کە بە کچێنی ئەو ناوەی هەبووە و نامەیەکی ناردبوو بۆ رۆژنامەکە. ئەم ژنەش، وەك من، تا ئەودەم و بەردەوام بەشداری رۆژنامەی شارەکەی خۆی مابوو، ئەوجا هۆنراوەیەکی دەربارەی سەردەمی منداڵی خۆی لە رۆژنامەکەدا نووسیبوو.



من دامەنی گردێك پێدەزانم،
داپۆشراوە بە گیا
لە ژووریەوە ڕووبارێکی رۆشن و
ڕوون دەڕوا
شوێنی عەیش و نۆش و ئاشتیە
مەزرا
یادەوەری گەلێ خۆشەویست و شیرینە
ئەویا

چەند کۆپلەیەك بوو، کە خوێندمەوە،

زانیم باسی هەمان پێدەشت و مەزرای گوێ رووبارێکە، وامدەزانی هی منە، هی خۆمە بە تەنیا.

ئەو دێڕانەی لێرەدا دەیاننوسم، یادەوەریەکن، لە قەدپاڵی ئەو گردە کۆن و قەدیمە دەدوێن کە ئەو باسیان لێوەدەکا. گەر پێتان وایە هێندە بەهای هەیە. جێگایەکی بچکۆلە لە رۆژنامە بە ئەمەکدارەکەتاندا بگرێ، ئەمن سوپستان دەکەم.

خۆر بە سەر ڕووبارەوە وەستاو
بریق و باقی بێ وەستانی ئاو
لە کەناری ئەوبەریشدا شکۆفە گوڵی
رەنگا و ڕەنگە تا بڕ دەکا چاو

ئەمە گوێ رۆخی رووبارەکەی ئێمە بوو. کەنارەکەی من. کۆپلەیەکی تری باسی بێشەیەکی پڕ درەختی سەرو بوو، بەس من بزانم ئەو یادی لە خشتەیبردبوو ـ ئەوانە درەختی چنار بوون، کە ئەودەم پاکیان بە ئافاتی چناری هۆڵەندی مردبوون، نەمابوون.

شتەکان تا دێن لە ماباقی نامەکەدا جوانتر رۆشندەبنەوە. ژنە دەنووسێ کە باوکی ـ ناوی نێتێرفیلْد بووە ـ پارچەیەك عەردی لە ساڵی 1883 لە دەوڵەت، لەو شوێنەدا کە دواتر لەوەرتاونی پێدەگوترا، کڕیوە. عەردەکە درێژ دەبووەوە رووەو ڕووباری مەیتلاند:

بە درێژایی کەنار سۆسەن و بەیبون خۆیان هەڵخستوە
درەخت سێبەری خۆی لەوناوەدا راخستوە

لە کێڵگەی ئاویی رووی تەختی ڕووباردا
قازی سپی پۆل پۆل سفرەی خوانیان داخستوە.

ئەو توخنی، حەتمەن منیش بومایە هەروامدەکرد، ئەوە نەکەوتبوو چۆن بەهاران ناڵ و سمی ئەسپەکان لە قوڕ و لیتەدا پیس دەبوون. بێگومان بەلای باسی تەرس و ریخی ئەسپەکانیشدا هەر نەچووبوو.
لە راستیدا، من خۆشم چەند هۆنراوەیەکم، کەمێك نزیك بەم سروشت و رۆحەوە، نووسیبوو، وابزانم ئێستاکێ بزرمکردوون، یان رەنگە هەرگیز وەڕوی پەڕەی کاغەزم نەخستبن. چەند کۆپلە شیعرێك کە بە سروشتدا هەڵدەدەن، بەڵام لە پاشاندا، گیرمکرد و کەمێ سەخت بوو کۆتایی پێ بێنم و قفڵیبکەم. دەبێ حەتمەن هەر لەو سەروبەندەدا هۆنیبێتمەوە کە تاقەت و تەحەمولی دایکمم نەمابوو، باوکیشم راوی نەهەنگی بێ میهرەبانیی و بێ بەزەیی لە مندا دەکرد. یان هێندەی تێهەڵدەدام تا قەترانی ڕەشی لە ورگ و ڕیخۆڵەوە پێدەردەکردم(٨)، هەروەکو خەڵك بۆ خۆشی و گاڵتەوگەپ دەیانگوت.

ژنە نووسیبوی کە لە **1876** دا لە دایکبووە. ژیانی لاوێتی و هەرزەکاری، تا ئەودەم شوویکردوە، لە ماڵە باوانی بەسەربردوە. ماڵەکەش دەکەوتە ئەو شوێنەوە کە شار کۆتایی پێدەهات و پێدەشت خۆی دەکردەوە و، رووە و خۆرنشینیش دەکەوەتەوە. رێکوڕاست ماڵی خۆمان. رەنگە دایکم قەت بەمەی نەزانیبێت، هەرگیز نەیزانیبێ کە خانوەکەمان هەر هەمان ماڵ بووە کە خێزانی نێتێرفیلد، تێیدا ژیاون و ئەوەی پیرەژن بۆی دەڕوانی، کاتێك سەرینا بە پەنجەرەکەوە، لەو خانوەی دەڕوانی کە رۆژێك لە رۆژان ماڵی خۆی بووە؟



رێی تێدەچێت. ئێستا کە چوومەتە تەمەنەوە، گەلێك گرینگی بە ڕێنوسی ناو کەشکۆڵ و مەتنە هەڵگیراوەکان دەدەم، بەسەبر و ئارامێکی بێ سنورەوە کاتی خۆم تەرخاندەکەم بۆ گەڕان و تاووتوێکردنی شتەکان، ئەوجا دەبینم، چەندەها خانەوادەی جیاواز، لەو کاتەوە

خێزانی نێتێرفیڵد خانوەکە دەفرۆشن هەتا ئەو رۆژەی ماڵی باوانی من دەگوێزنەوە ناوی، خاوەنی ئەو خانوە بوون. دەکرێ پرسیارێ بکرێ، باشە بۆ خانوەکە دەفرۆشن کەچی ژنە خۆی هێشتا ساڵانێکی زۆر لە عومری باقی ماوە. بێوەژن کەوت؟ نەداری و دەستکورتیبوو؟ کێ دەزانێ؟ ئەی ئەو کەسە کێ بوو، هەروەکو دایکم دەیگوت، هات و ئەوی لەگەڵ خۆی برد؟ دەشێ کچەکەی بووبێ، هەر هەمان ژن کە شیعرەکانی دەنووسی و لە ئۆرێگانۆ دەژیا. رەنگە کچەکەی تریان بووبێ، ئەو دوور دوور ـ لەم گەورەبوو، کە عەرەبانە منداڵانەکەی بۆی ئەمدیو-و ئەودیو دەکرد. هەر دەمودەست دوا بە دوای ئەوەی دایکم پڕ بە مندا دەکا، بەقەول و گفتی خۆی، تەنیا لەبەر ژیانی خۆشەویست. کچەکەی ماوەیەك، لەسەردەمی لاوێتیمدا، زۆر دوور لە منەوە دەژیا. دەکرا نامەیەکی بۆ بنووسم، یان رەنگە بکرابایە دیدەنیم بکردایە. ئەگەر ئەوەندە سەرقاڵی پێکەوەنانی خێزانە تازەکەی خۆم نەبومایە و هێندەش هەمیشە بەتەنگ نووسینی ناپەسەندانەی خۆمەوە نەبومایە. بەڵام ئەو کەسەی بەڕاستی حەزمدەکرد ئەودەم بیدوێنم و لەگەڵیدا دانیشم دایکم بوو، کە ئیدەی لە بووندا نەمابوو.

نە لە ئاخر و ئۆخری نەخۆشیەکەی دایکمدا، نە بۆ بەخاکسپاردنی گەڕامەوە ماڵەوە. من دوو منداڵی بچکۆلەم هەبوو، کەسیشم لە ڤانکۆڤەر شکنەدەبرد لە ئەستۆیان نێم. چیشمان هەبوو بەهەزار حاڵ بەشی سەفەرێکی وای نەدەکرد، مێردەکەشم رقی زۆر دەبۆوە لە فۆڕماڵیتێت و کاروباری ڕەسمی، باشە بۆچی ئەو قەرزاربارکەم؟خۆ خۆشم هەمان هەست و ئیحساسم هەبوو. هەندێ شت هەن لە هەمبەریاندا دەوەستین و دەڵێین: ناکرێ هەرگیز لێیان ببورین، قەت بیان بەخشین، یاخود قەت لە خۆمان نابوورین. بەڵام هەر دەیکەین ـ ئێمە بەردەوام، بێوچان ـ دەیانکەین.

1. Alice Munro, Dear LifeVintage Books, www.vintage-.books.co.UK, 2013

2. ڤێتەران: سەربازی دێرین.

3. ئێلێکترۆلۆکس: جۆرێ لە گسکی کارەبایی کە کۆپمانیەکی سویدی دروستیدەکا.

4. مینك: جۆرێ لە گیانداری فەرو دار کە نزیك لە ئاوەوە دەژین و فەرویان بەهادارە.

5. ئانا پان و ئەو ناوانەی تر: ناوی کۆمەڵێ پاڵەوان و چیرۆکی منداڵانەن.

6. ئۆملێت: جۆرێکە لە هێلکەورۆن کە لە سەوزە، قارچك، پەنیر، گۆشت تاد تێدا دەپێچرێتەوە، بە ڕەچەڵەك لە ڕێی ئینگلیزەکانەوە لە هیندستانەوە هاتوەو بڵاوبۆتەوە.

7. سێ ڕۆمانی بەناوبانگی دونیان

Independent People, Remembrance of Things Past,The Magic Mountain

8. تا خۆی پیسکرد، یان گوویکرد بە خۆیدا.





## گفتووگۆیەکی تەلەفزیۆنی لەگەڵ

# ئەلیس مۆنرۆ

وەک باوە هەموو خەڵات پێدراوەکانی نۆبڵ وتەی خۆیان لە ئاهەنگی وەرگرتنی خەڵاتەکەدا پیشکەش بکەن، بەڵام ئەمساڵ ئەلیس مۆنرۆ براوەی خەڵاتی نۆبڵ، لەبەر باری تەندروستی نەیتوانی بەشداربێت و وتەکەی خۆی پێشکەش بکات، "جێنی" کچی خەڵاتەکەی لە پاشای سوید وەرگرتوو، تەلەفزیۆنی سویدیش ئەم چاوپێکەوتنەیان لەگەڵ مۆنرۆدا سازدابوو، لە ئاهەنگەکەدا پیشاندرا.



**سازدانی: ستێفان ئۆشباری**

**و. له سویدییه‌وه‌: هیوا قادر**




مۆنرۆ: من هه‌ر له‌سه‌ره‌تاوه حه‌زم به خوێندنه‌وه بوو، چونكه حه‌كایه‌تی په‌رییه ده‌ریاییه خنجیلانه‌كه‌ی "هۆ. سیٚ. ئه‌ندسن"یان بۆ خوێندبوومه‌وه. نازانم ئێوه ئه‌و حه‌كایه‌ته‌تان له‌بیرماوه یان نا، حه‌كایه‌تێكه ترسناك غه‌مباره. ئه‌و بووكه ده‌ریا خنجیلانه‌یه عاشقی شازاده‌یه‌ك ئه‌بێت، به‌ڵام ناتوانێت شووی پێبكات، چونكه بووكی ده‌ریایه، ئه‌م حه‌كایه‌ته ئه‌وه‌نده غه‌مبارانه‌یه ناتوانم ورده‌كارییه‌كانی تری بگێڕمه‌وه.

به هه‌رحاڵێك كاتێك گوێم له حه‌كایه‌ته‌كه بوو، چوومه ده‌ره‌وه‌وه و كه‌وتمه پیاسه‌كردن به ده‌وری ئه‌و خانووه له خشت دروستكراوه‌ی تیایدا ئه‌ژیاین، كه‌وتمه گه‌ڕان به‌دوای خه‌یاڵێكی خۆشدا بۆ كۆتایی چیرۆكه‌كه، چونكه پێموابوو ئه‌و بووكه ده‌ریا خنجیلانه‌یه مافی خۆی بوو شوو به شازاده‌كه بكات، من ئه‌مویست ئه‌م چیرۆكه له‌به‌رخاتری خۆم بگۆڕم نه‌ك بۆ ئه‌وه‌ی به‌هه‌موو دنیادا به‌و جۆره بڵاوببێته‌وه، ئه‌گه‌رچی پێشموابوو ئه‌وه‌ی من ئه‌یكه‌م كارێكی زۆر باشه. چونكه ئیتر بووكه ده‌ریاییه‌كه ئه‌یتوانی شوو به شازاده‌كه بكات و تا ڕۆژه‌كانی كۆتایی ژیانی به خۆشی بژی، چونكه شایسته‌ی جۆره ژیانێكی ئاوها بوو. بۆ ئه‌وه‌ی بووكه ده‌ریاییه‌كه ئه‌و كاره‌ش بكات ئه‌بوو زۆر كاری ناجۆر بكات بۆ ئه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵاتی شازاده بباته‌وه و نیازپاكی خۆی پیشان بدات. بووكی ده‌ریا ئه‌بوو جه‌سته‌ی خۆی بگۆڕێت و په‌لوپۆ بۆ خۆی په‌یدابكات بۆ ئه‌وه‌ی ببێت به مرۆڤێكی ئاسایی، هه‌رچ هه‌نگاوێكیش كه هه‌ڵیهێناوه‌ته‌وه بیٚ ئه‌ندازه ئازاری پیٚ گه‌یشتووه. به‌ڵام ئه‌مه ته‌مه‌نای خۆی بوو كه بتوانێت له‌پاڵ شازاده‌كه‌یدا به‌پێوه بوه‌ستێت. بۆیه من پێموابوو

که شایستەی ئەم جۆرە ژیانەیە نەك ئەوەی بەتەنها لە دەریادا بمرێت. من بۆ خۆشم هیچ بەلامەوە گرنگ نەبوو کە سەرلەبەری خەڵکی دنیا ئەم چیرۆکە تازەیەی منیان گوێ لێنابێت، چونکە کاتێك ئەو کۆتاییەم بۆ حەکایەتەکە دۆزییەوە وەك ئەوە وابوو چیرۆکەکە چاپکرابێت. بەڵێ، هەروابوو. ئەمە یەکەم هەوڵدانی من بوو بۆ نووسین.

ستێفان ئۆشباری: باسی ئەوە بکە چۆن فێری گێڕانەوەی چیرۆك و دواتریش نووسینەوەی بوویت؟

مۆنرۆ: هەمیشە چیرۆکم لە خەیاڵی خۆمدا دروست ئەکرد. ڕێگایەکی دوورودرێژم ئەبڕی بۆ چوونە قوتابخانە، لە کاتی ڕۆیشتنمدا بەخەیاڵ چیرۆکم دروست ئەکرد. بەڵام لەبەرئەوەی ئێستا بەتەمەنتر بووم چیرۆکەکان زیاتر و زیاتر باس لە خۆم ئەکەن، وەك پاڵەوانێك لێرەو لەوێ دەرئەکەوم، پێشم گرنگ نییە دەمودەست چیرۆکەکانم لەلایەن دنیاوە بخوێنرێتەوە.

تۆزقاڵێکیش بیرم لەوە نەکردۆتەوە کەسانی تر هەست بە چیرۆکەکانم بکەن و بیانخوێننەوە، چونکە ئەمە پەیوەندی بە خودی چیرۆکەکان خۆیانەوە هەیە. زۆرینەی جاریش لە دیدی منەوە ئەم چیرۆکانە غەمگینن، بەڵام ئازایەتی بووکە دەریاییە خنجیلانەکە وەك خەیاڵێك لەناویاندا هەیە، کە ئەو کەسێکی ئاقڵبووە و توانیویەتی ژیانێکی خۆشتر بنیات بنێت.

ستێفان ئۆشباری: ئایە گرنگە چیرۆك لە گۆشەنیگایەکی ژنانەوە بگێڕیتەوە؟

مۆنرۆ: پێموانەبووە ئەمە گرنگ بێت، بەڵام من هەرگیز خۆم بە شتێکی تر نەبینیوە جگە لە ژن، زۆر چیرۆکی جوان لەسەر کچی بچکۆلە و ژنان هەن. کاتێك گەیشتمە تەمەنی هەرزەکاری چیرۆکەکانم زیاتر پەیوەندیان بەو شتانەوە بوو کە پیاو پێویستی پێیانە. کاتێکیش کچێکی بچکۆلانە بووم هیچ هەستێکی خۆ بەکەم زانینم لەلانەبوو کە من ئافرەتم. ئەمەش ڕەنگە پەیوەندی بەوەوە هەبێت کە من لە ناوچەیەکی ئۆنتاریۆ ژیاوم و لەوێش ژنان زیاتر کاتی خۆیان بە خوێندنەوە بردۆتەسەر



و زۆر کاتیش هەر ئەوان حەکایەتیان گێڕاوەتەوە، پیاوەکانیش لە دەرەوەبوون و سەروکاریان لەگەڵ کارە گرنگەکاندا هەبوو و حەکایەت لەناو دنیای ئەواندا نەبووە. بۆیە من هەستم ئەکرد لەماڵەوەم.

ستێفان ئۆشباری: دەوروبەرت چ ئیلهامێکی پێبەخشیویت؟
مۆنرۆ: لەڕاستیدا من پێموانییە پێویستم بە هیچ جۆرە ئیلهامێك هەبێت، هەستم کردووە چیرۆك زۆر گرنگە بۆ جیهان، بۆیە ویستوومە بەردەوامبم لە دۆزینەوەی چیرۆکەکان. ئەمەش پەیوەندی بە هیچ ئینسانێکی ترەوە نەبوو، هیچ پێویستییەکیشم بەوە نەبووە بۆ هیچ کەسێکی باسبکەم، ئەمەش ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕێوە تا ئەو کاتەی هەستمکردووە شتێکی خۆشە بەناو خەڵکانی تردا بڵاوی بکەمەوە.



ستێفان ئۆشباری: چ شتێك بۆ تۆ گرنگە کاتێك چیرۆکێك ئەگێڕیتەوە؟
مۆنرۆ: ئا، لەسەرەتادا ئەمویست چیرۆکەکان کۆتاییەکی خۆشیان هەبێت. بەڵام دواتر دەستمکرد بە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی وەك "بەرزاییەکانی وزەرینگ" کە کۆتاییەکی غەمگینیان هەبوو، دواتر بەیەکجاری ئەو جۆرە تێگەیشتنەم گۆڕی و ڕووم کردە تراژیدیا، پێشموابوو باشم کردووە.

ستێفان ئۆشباری: چ سەرنج ڕاکێشییەك لە باسکردنی ژیانی شارۆچکە بچووکەکانی کەنەدادا هەیە؟
مۆنرۆ: ئینسان پێویستە خۆی لەوێ بێت ئەوسا لەمە تێ ئەگات. پێموایە هەموو جۆرە ژیانێك بۆ خۆی سەرنج ڕاکێشە، هەر جێیەك لە هەر شوێنێك بێت سەرنج ڕاکێشە. پێموانییە هێندەی ئێستا ئازابوومایە گەر بهاتایە من لە شارێك بژیامایە و لەگەڵ کەسانێکدا بکەوتمایەتە کێبەرکێوە کە وەك ئەڵێن لە ئاستێکی کلتوری بەرزدان. من نەچوومەتە ئەم جۆرە کێبەرکێیانەوە. من تەنها هەر خۆمم ناسیوە کە چیرۆك بنووسێت،

لای هیچ کەسیش باسم نەکردووە، هەروەها ماوەیەك وا حاڵیبووبووم کە تەنها کەسێك بتوانێت لە دنیادا ئەمە بکات هەر منم.

ستێفان ئۆشباری: ئایە تۆ هەمیشە لە نووسینەکانت دڵنیابوویت؟

مۆنرۆ: بۆ ماوەیەکی زۆر دڵنیابووم بەڵام دواتر کە گەورەبووم توشی نادڵنیاییەکی زۆر بووم کاتێك کەسانێکی ترم بینی کە ئەیان نووسی. بۆیە پێموابوو نووسین کەمێك لەوە قورسترە کە چاوەڕێم ئەکرد. بەڵام هەرگیز و بەهیچ جۆرێك کۆڵم نەدا، چونکە نووسین تەنها شتێك بوو کە خۆمم بۆ تەرخانکردبوو.

ستێفان ئۆشباری: کاتێك دەست بە چیرۆکێك ئەکەیت، ئایا هەمیشە بەسەرهاتەکان لەبەرچاوتدا ڕوونن؟

مۆنرۆ: لەبەرچاومن، بەڵام بە جۆرێك لە جۆرەکان کاتێك ئەنووسیت شتگەلێك ڕووئەدەن، ئەگەرچی من هەمیشە کە دەست ئەکەم بە نووسین ئەبێت شتێکی ڕوون و ئاشکرام لەلا گەڵاڵەبووبێت کە چیرۆکەکە باس لە چی ئەکات.

ستێفان ئۆشباری: چۆن ئەچیتە ناو چیرۆکێکەوە کاتێك بەتەواوی دەست بە نووسین ئەکەیت؟

مۆنرۆ: ئا، تەواو شپرزەم! بەڵام دیارە هەمیشەش سەیرم کردووە تا بزانم منداڵەکانم نانی نیوەڕۆیان خواردووە. من ئەوکات ئافرەتی ماڵ بووم، خۆم وا فێرکردبوو لە کاتەکانی دەستبەتاڵیدا بنووسم، هەروەها هیچ کاتێکیش دەستم لە نووسین هەڵنەگرتووە، سەرباری ئەوەی کاتی واهەبووە کە زۆر غەمگین بووم، چونکە هەستمکردووە ئەوەی کە ئەینووسم زۆر باش نییە و زۆر شتم ماوە فێریان ببم و کارەکەم زۆر زۆر لەوە قورسترە کە چاوەڕێم کردووە. بەڵام وازیشم لە نووسین نەهێناوە و هیچ کاتێکیش ئەمە ڕووی نەداوە.

ستێفان ئۆشباری: قورسترین شتێك چییە کاتێك ئەتەوێت چیرۆکێك بگێڕیتەوە؟

مۆنرۆ: پێموایە ئەو ترسەیە کاتێك کە ئەچیتە ناو چیرۆکێکەوە و ئەبینیت نارێکە. لەسەرەتادا گرژی هەیە، پاشان هەست ئەکەیت تاڕادەیەك باش ئەڕوات،



بەڵام دواتر سەرلەنوێ بە چیرۆکەکەدا دێیتەوە، ئەمەش دوای ئەوە دێت کە بەڕاستی ئەبێت دابنیشیت و کاری لەگەڵ بکەیت. من هەمیشە هەستمکردووە شتێکی باشە ئاوها کاربکەم، چونکە هەڵەی منە نەك نووسینەکە گەر چیرۆکەکە باش دەرنەچێت.






ستێفان ئۆشباری: بەڵام ئەی ئەگەر لە چیرۆکەکە ڕازی نەبوویت، چ کارێك ئەکەیت تا ئەوەی نووسسیوتە چاکیبکەیت؟
مۆنرۆ: ئەمە کارێکی قورسە. هەوڵ ئەدەم شێوازێکی باشتر بدۆزمەوە بۆ گێڕانەوەی چیرۆکەکەم. زۆر جار کەسایەتی واهەن کە شانسی تەواوەتیت پێ نەداون، بۆیە پێویستە بیر لەوە بکەیتەوە کە چۆن ئەم کەسایەتیانە بناسێنێت و شتێکی تەواو جیاوازتریان لێ دروستبکات. کاتێك گەنجتر بووم مەیلی زێدەڕۆیم لە زماندا هەبوو، دواتر دەستمکرد بە لابردنی زۆر لەو زێدەڕۆییانە. دوای ئەوە بیری زیاتری لێ ئەکەیتەوە و زیاتر ئەچیتە ناو ئەوەی کە نووسیوتە، ئەو کات ئەبینیت ڕێگایەکی زۆر دوورت لە پێشە، سەرباری ئەوەی لەسەرەتای دەستپێکردندا پێتوابووە هەموو شتێك تەواوە.

ستێفان ئۆشباری: تۆ چەند چیرۆکت فڕێداوە؟
مۆنرۆ: ئا، کاتێك گەنجبووم هەموو شتێکم فڕێ ئەدا. لەڕاستیدا نەم ئەزانی بۆ، بەڵام لەم ساڵانەی دواتردا ئەمە

زۆر دووباره نەبۆتەوە. من هەستێکی گشتی ئەوتۆم هەیە کە ئەزانم ئەبێت چی بکەم تا چیرۆکەکان بژین. بەڵام هەمیشە لێرەو لەوێ هەڵە ڕووئەدات، دواتریش ئەبێت لەبیریان کەیت.

ستێفان ئۆشباری: قەت لە فڕێدانی چیرۆکێکت پەشیمان بوویتەتەوە؟
مۆنرۆ: پێموانییە، لەحاڵەتی وادا تاڕادەیەکی زۆر ئازارم بەدەست ئەوەوە چەشتووە کە نووسیومە و لەسەرەتاشەوە هەستمکردووە بەدەرناخوات. ئەمە ڕووئەدات وەك وتم زۆر نا.

ستێفان ئۆشباری: ئایا تەمەن چەندە کاریگەری لەسەر نووسینت داناوە؟
مۆنرۆ: ئاهـ بە شێوەیەکی پێشبینیکراو. لەسەرەتاوە لەسەر شازادە جوانەکان ئەنووسیت، دواتریش لەسەر ژنی ماڵ و منداڵ ئەنووسیت و دوای ئەوەش لەسەر ژنانی بەتەمەن، ئەمەش بە جۆرێك دێتە پێشێ بێ ئەوەی ئینسان خۆی هەوڵبدات شتێك بکات تا بەلایەکی تریدا بەرێت، دیدگات ئەگۆڕێت.

ستێفان ئۆشباری: پێتوایە تۆ بۆ ژنانی نووسەری تر گرنگبوویت، لە کاتێکدا تۆ ژنی ماڵ بوویت و توانیوتە کاری ماڵ و کاری نووسین پێکەوە کۆبکەیتەوە؟
مۆنرۆ: بەڕاستی نازانم، تەمەنا ئەکەم وابێت. منیش کە گەنج بووم پەنام بۆ ژنە نووسەرەکان تر ئەبرد، ئەمەش تا بەرزترین ئاست بەهێزی کردم، بەڵام بە ڕاستی نازانم ئەگەر بڵێم من بۆ کەسانی تر گرنگ بووبم. من نامەوێت پێداگری لەسەر ئەوە بکەم کە نووسین بۆ ژنان ئاسانترە، بەڵام ئەوەشیان ڕاستە کە ئافرەتان جێ پەنجەیان دیارە لە ڕاپەڕاندنی کارە گرنگەکاندا، تەنها خۆیان بۆ کات کوشتن تەرخان نەکردووە لەکاتێکدا هەموو ئەوانی تر لە دەرەوەی ماڵن، بەڵکە ئافرەت ئەتوانێت بە جدی بنووسێت هەروەك ئەوەی کە پیاوێك ئەنووسێت.

ستێفان ئۆشباری: پێتوایە چ کاریگەرییەك لەسەر ئەوانە دروست ئەکەیت کە چیرۆکەکانت ئەخوێننەوە، بەتایبەتی ژنان؟



مۆنرۆ: ئا، من ئەمەویت چیرۆکەکانم کاریگەریان لەسەر ئینسانەکان هەبێت، هیچیش گرنگ نییە ئەو کەسە ژن بێت یان پیاو یاخود منداڵ. من ئەمەویت چیرۆکەکانم شتێك سەبارەت بە ژیان بڵێن، نەك لەبەرئەوە ستایش بکرێن چونکە لە حەقیقەت ئەدوێت، بەڵکە ئەبێت لەبەر ئەوەبێت کە جۆرە خەڵاتێك ئەبەخشێت بەوەی کە ئەیانخوێنێتەوە. ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئیتر ئەبێت چیرۆکەکان کۆتاییەکی خۆشیان هەبێت. ڕاسترە بڵێم ئەمەویت خوێنەر بە جۆرێك توشی هەژان ببێت کە هەستبکات دوای تەواوبوونی بۆتە کەسێکی تر.



ستێفان ئۆشباری: پێتوایە تۆ کێیت؟ ئایە سیما چ مانایەك ئەگەیەنێت بۆ تۆ؟
مۆنرۆ: ئا، من لە لادێ لەگەڵ ئەو ئینسانانەدا گەورەبووم کە بە گشتی خاوەنی بنەچەیەکی سکۆتلەندی یان ئێرلەندین، زۆر گرنگ بوو ئینسان فەخر بە خۆیەوە نەکات و پێیوانەبێت زیرەکە. قسەیەکی باو هەیە کە ئەڵێت: "ئەها، بەڕاست تۆ خۆت بە زیرەك ئەزانیت؟". بۆ ئەوەی خۆت سەرقاڵی شتێك بکەیت وەکو نووسین ناچاریت بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت خۆت بە زیرەك بزانیت، بەڵام من بۆ خۆم کەسێکی تەنها بووم.

ستێفان ئۆشباری: پێشتر تۆ فێمەنیست بوویت؟
مۆنرۆ: من هیچم لە بارەی "فێمینیزم"ـەوە نەئەزانی. بەڵام دیارە کە فێمەنیستیش بووم، چونکە من لەو ناوچەیەی کەنەدا گەورەبووم کە نووسین ئاسانتر بوو بۆ ئافرەتان وەك لە پیاوان. هەرە نووسەرە گەورە و گرنگەکان پیاو بوون، بەڵام گەر بزانرایە ئافرەتێك چیرۆك ئەنووسێت ئەوا بێگومان زۆر زیاتر مایەی نەنگی بوو بەراورد بە پیاوێکی نووسەر. نووسین سەرقاڵییەك نەبوو پیاو خۆی بۆ تەرخانبکات. بەڵێ، دیارە مەبەستم لەو سەروەختەیە کە گەنج بووم، بەڵام ئێستا بە هیچ جۆرێك وانییە.

ستێفان ئۆشباری: پێتوایە گەر وازت لە خوێندنی زانکۆ نەهێنایە نووسینەکانت گۆڕانکاریان بەسەردا ئەهات؟
مۆنرۆ: زۆر بەباشی گۆڕانکاری بەسەردا ئەهات، ڕەنگبوو زۆر بەحەزەرتربووما یە و زۆر زیاتریش بترساما یە بۆ ئەوەی ببم بە نووسەر، چونکە ئەوکات باشتر ئەمزانی ئەوانی تر تا کوێ چوون و لە چ ئاستێکدان، ڕەنگبوو ئەوکات تەواو ورەم بەربدایە. ڕەنگبوو پێموابوایە کە ئەو کارە بۆ من قورسە، بەهەرحاڵ ئەکرا بۆ ماوەیەك وابووما یە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من هەر ویستوومە بنووسم و بەردەوام بم.

ستێفان ئۆشباری: ئەو توانایەی تۆ هەتە بۆ نووسین مەوهیبەیە؟
مۆنرۆ: ئەو کەسانەی نزیکمن پێموانییە ئەم قسەیەیان پێوابێت، بەڵام من هەرگیز توانای نووسینی خۆم وەك مەوهیبەیەك نەبینیوە، نووسین بۆ من کارێك بووە توانیومە بیکەم گەر تەنها زۆر لە خۆم بکەم و کۆششی تەواوەتی بۆ بکەم. ئەگەر نووسین مەوهیبە بێت، ئەوا بەڕاستی مەوهیبەیەکی ئاسان نییە دوای "بووکە خنجیلانەکەی دەریا".

ستێفان ئۆشباری: هیچ کاتێك دردۆنگ بوویت، هەستت کردووە باش نیت؟
مۆنرۆ: بەردەوام تا ئێستاش! من زۆر زیاتر بەرهەمم فڕێداوە بەراورد بەوانەی تەواوم کردوون و بۆ چاپم ناردوون، ئەمەش تا نزیکەی تەمەنی سی ساڵی بەردەوام بووم لەسەری. بەڵام سەرباری ئەوەش هەوڵمداوە فێری نووسین بم وەك ئەوەی کە ویستوومە. ئاوهام، نا، بەڕاستی ئەمە شتێك نییە هەستبکەیت هەروا ئاسانە.

ستێفان ئۆشباری: دایکت بۆ تۆ چی گەیاندووە؟
مۆنرۆ: ئاهـ، هەستەکانی من بۆ دایکم زۆر ئاڵۆزبوون. چونکە ئەو نەخۆش بوو، ئەو نەخۆشی پارکینسۆنسی هەبوو، زۆر پێویستی بە یارمەتی هەبوو، زۆر زەحمەت بوو قسەبکات، خەڵکی تێینەئەگەیشتن چی ئەڵێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسێکی زۆر کۆمەڵایەتی بوو زۆریش حەزی لە



تێکەڵبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی بوو، بەڵام بۆ ئەو ئەمە کارێکی مەحاڵ بوو چونکە نەیئەتوانی قسەبکات. من هەستم بە شەرم ئەکرد و خۆشیشم ئەویست بەڵام بەجۆرێك لە جۆرەکان نەم ئەویست قسەکەری ئەو بم، نەم ئەویست بچمە پێشەوە و ئەو جۆرە قسانە لە زمانی ئەوەوە بکەم کە ئەو ئەیوسیت بە خەڵکی بڵێت، ئەمەش قورس بوو. بۆیە بەباشی هەست بە زۆرینەی ئەو گەنجانە ئەکەم کە کەسێکیان یان دایك و باوکیان ئەم کێشە قورسانەیان هەیە. لەو تەمەنەدا ئینسان نایەوێت باری شانی ژیانی بەم جۆرە کێشانەوە قورسبێت.



ستێفان ئۆشباری: دایکت هیچ ئیلهامێکی پێ بەخشیویت؟
مۆنرۆ: بێگومان پێی بەخشیوم، بەڵام بەو جۆرە نا کە هەستم پێکردبێت یان تێیگەیشتبم. کاتێك چیرۆکم بۆ نەئەهات ئەوم بیر نەکەوتۆتەوە، من چیرۆکم نەئەنووسی بەڵکە ئەمگێڕایەوە، نەك بۆ ئەو بەڵکە بۆ خەڵکی تر. بەڵام ڕاستییەك هەیە کە ئەو چیرۆکەکانمی ئەخوێندەوە، هەروەها باوکیشم ئەیخوێندنەوە... پێموایە دایکم میهرەبان تر بوو بەرامبەر هەرچ کەسێك گەر بیویستایە ببێت بە نووسەر.
ئەشێ ئەو شێوازی حەزلێکردنی خۆیی هەبووبێت، بەڵام ئەو خەڵکانەی دەوروبەرم نەیان ئەزانی کە من ئەمەوێت ببم بە نووسەر، منیش کارێکم نەئەکرد تا بزانن چونکە بۆ زۆرینەیان ئەوە بێ مانایی بوو. ئەو کەسانەی من ئەمناسین بە گشتی نەیان ئەخوێندەوە و دیدێکی پراکتیکیان بۆ ژیان هەبوو، بۆیە ناچاربووم بیرۆکەکانی خۆم لەو خەڵکانەی دەورووبەرم بشارمەوە.

ستێفان ئۆشباری: ئایە بۆ تۆ قورس بووە چیرۆکێکی ڕاستەقینە لە دیدێکی ژنانەوە بگێڕیتەوە؟
مۆنرۆ: نەخێر، بەهیچ جۆرێك، چونکە من خۆم وا بیر ئەکەمەوە، لەبەر ئەوەی خۆم

ژنم، ئەمەش هەرگیز نارەحەتی نەکردووم. ئەو جۆرە گەورەبوونەی وەك خۆم ویستوومە کەمێك تایبەت بوو، ئەگەر بە جۆرێك لە جۆرەکان کەسانێك هەبووبن لە دەوروبەری مندا خوێندبێتیانەوە یاخود خوێندبێتیان هەموویان ئافرەت بوون، ئەوانەشی ئەو جۆرە سەرقاڵییەیان هەبووە بە زۆری مامۆستا یاخود شتێك بوون لەو بابەتە، بەڵام دنیای خوێندنەوە و نووسین ڕێگایەکی دوور و داخراوبوو لەبەردەم ئافرەتاندا، لەکاتێکیشدا زیاتر ئەم کارە بۆ ژنان دەستەبەرتربوو وەك لە پیاوان، چونکە پیاوان یان جوتیاربوون یان سەرقاڵ بوون بەو جۆرە کارانەوە.

ستێفان ئۆشباری: تۆ لە ماڵێکی کارکەردا گەورەبوویت؟
مۆنرۆ: بەڵێ.

- هەر لەوێشەوە چیرۆکەکانی تۆ دەستیان پێکردووە؟

ستێفان ئۆشباری: بەڵێ، نازانم کە ئایا لەماڵێکی کارکەردا بووبم، من تەنها سەیری ئەو دەوروبەرەی خۆمم کردووە کە تیایدا بووم و لەسەریم نووسیوە.

ستێفان ئۆشباری: پێتوابووە



هەمیشە ناچاربوویت تەنها لەو کاتە کەمانەدا بنووسیت کە بۆت هەڵکەوتوون کە لە نێوان بەخێوکردنی منداڵ و خواردن دروستکردندا بووە؟
مۆنرۆ: بەڵێ، هەرچ کاتێك توانیبێتم نووسیوومە، مێردی یەکەمم زۆر



یارمەتی دەرم بوو، ئەو پێی وابوو جێی ئافەرینە بنووسم. ئەو هیچ کات هەڵوێستێکی وای نەئەنواند وەك زۆر لەو پیاوانەی تر کە پاشتر ناسیمن پێیان وابوو مادام من ئافرەتم ناتوانم سەرکەوتووبم. ئەو پێیوابوو ئەوەی من شتێکە ئەو خۆی ئەیەوێت بیکەم و هەمیشەش پشتی ئەگرتم.
لە کتێبخانەکەدا
بەدەر لە هەموو شتێك ئەو کارە زۆر خۆشبوو، ئێمە گواستمانەوە بۆ ئێرە تاکو کتێبفرۆشییەك بکەینەوە، هەموو خەڵکی پێیان وابوو کارێکی بێ عەقڵانە ئەکەین و لەبرسان ئەمرین، بەڵام ئێمە وامان لێنەهات و زۆر سەرسەختانە کارمان کرد.
.




وەرگرتنی خەڵاتەکەی مۆنرۆ لەلایەن کچەکەیەوە

ستێفان ئۆشباری: لەسەرەتادا کاتێك هەردووکتان کتێبفرۆشیەکەتان کردەوە ئەم کارە تا چەندە گرنگ بوو بۆتان؟
مۆنرۆ: مەعیشەتمان لەسەر ئەوە بوو هیچ شتێکی ترمان نەبوو. هیچ سەرچاوەی داهاتێکی تریشمان نەبوو. یەکەم ڕۆژ کە کردمانەوە **175 $** دۆلارمان فرۆشت. پێمان وابوو ئەو پارەیە زۆرە. هەرواش بوو، کاتێك زۆری خایاند تا توانیمان فرۆشمان دووبارە بگەیەنینەوە ئەو ئاستە.

من ڕاهاتبووم لەودیو کاشێرەکەوە دابنیشم و کتێبەکان بدەمە دەستی خەڵکی و هەموو ئەو کارانەی تری ناو کتێبفرۆشییەکەش بکەم، زۆرینەی کات کەسێك نەبوو یارمەتیم بدات، خەڵکی ئەهاتنەن ژوورەوە و قسەی زۆریان لەسەر کتێبەکان ئەکرد. ئەوێ بووبووە جێیەك بۆ کۆبوونەوەی خەڵکی، سەرەتا کەس هیچی نەئەکڕی، بەتایبەتی لە ئێوارانداا، من لەوێ بەتەنها دائەنیشتم و خەڵکی تەنها بۆ ئەوە ئەهاتن قسەبکەن. ئەمەش زۆر خۆشبوو هەستم بەبەختەوەری ئەکرد. تا پێش ئەو کاتە من ژنی ماڵەوەبووم و بەردەوام لە ماڵەوە بووم هەروەها نووسەریش بووم، ئەمەش شێوازێکی باش بوو بۆ چوونەدەرەوەم بۆ دنیا. پێموانەبوو ئێمە پارەیەکی باشمان دەستکەوتبێت، ڕەنگە لەبری ئەوە قسەیەکی زۆرم لەگەڵ خەڵکیدا کردبێت بۆ ئەوەی کتێب بکڕن، بەڵام ئەمە زەمەنێکی زۆر نایاب بوو لە ژیانی مندا.

ستێفان ئۆشباری: ئەتەوێت ژنانی گەنج ئیلهام لە کتێبەکانت وەربگرن و حەز بە نووسین بکەن؟

مۆنرۆ: ئەوان ئازادن تا چەند حەزئەکەن کتێب بخوێننەوە. من ئەمەوێت ئینسانەکان خۆشییەکی زۆر پێش هەر شت لە خوێندنەوە وەربگرن تا لە وەرگرتنی ئیلهام.

ئەمە ئەوەیە کە من ئەمەوێت. ئەمەوێت حەز لە خوێندنەوەی کتێبەکانم بکەن و هەست بکەن بە جۆرێك لە جۆرەکان ئەو کتێبانە پەیوەندی بە ژیانی خودی ئەوانەوە هەیە. ئەمە مەبەستی هەرە سەرەکی منە چونکە من کەسێکی سیاسی نیم.

ستێفان ئۆشباری: تۆ کەسێکی کلتوریت؟

مۆنرۆ: هەڵبەتە من وام. دڵنیاش نیم ئەمە مانای چییە، بەڵام پێموایە کە ئەوەم.

ستێفان ئۆشباری: پێ ئەچێت تۆ شێوازێکی سادەت هەبێت بۆ تێڕوانین لە دنیا؟

مۆنرۆ: بەڕاست وایە؟ ئا، ڕەنگیشە وابێت.

ستێفان ئۆشباری: بەڵێ، من لە جێیەکدا خوێندمەوە کە تۆ ورد و درشتی شتەکان بە شێوەیەکی سادە



ڕوون ئەکەیتەوە.
مۆنرۆ: بەڵێ، ئەمەوێت ئەوە بکەم. بەڵام پێموانییە مەبەست لە سادەکردنەوەی بێت، چونکە من بۆ خۆم هەر ئاوها ئەنووسم. پێموایە سروشتییە بۆ من کە بە شێوازێکی سادە بنووسم.



ستێفان ئۆشباری: ئایە هیچ کات کەوتوویتەتە قۆناغی ئاوهاوە نەتوانیت بنووسیت؟
مۆنرۆ: بەڵێ، تێیکەوتووم. وایە، وازم لە نووسین هێناوە، ئەوەش کەی بوو، وابزانمساڵێك لەوەوبەر بوو، بەڵام ئەوەش بڕیارێك بوو خۆم دام، نەك لەبەرئەوەی ئەمویست بنووسم و نەم ئەتوانی، بڕیارمدا نەنووسم لەبەرئەوەی ئەموویست منیش وەك هەموو کەسانی تری دنیا بژیم. چونکە کاتێك ئەنووسیت کارێك ئەکەیت کە ئەوانی تر نایزانن، دیارە ناشتوانیت باسیشی لێوە بکەیت، ئینسان بەردەوام لەو دنیا نهێنییەدا عەوداڵە و لە دنیا ئاساییەکەشدا کاری تر ئەکات. من بە جۆرێك لە جۆرەکان هەستم بە ماندووبوون کرد چونکە بە درێژای ژیانم هەر ئەم کارەم کردبوو، بەڕاستی هەر بە درێژایی ژیانم. ئەگەر کاتێکیش نووسەرانی ترم بینیبێت سەیرمکردووە بە جۆرێك لە جۆرەکان زیاتر ئەکادیمیانە ئەنووسن، بەمەش کەمێك شپرزە بووم، چونکە من هەمیشە زانیومە کە بەو جۆرە ناتوانم بنووسم. من ئەو بەهرەیەم نەبووە.
.
ستێفان ئۆشباری: ئەمە پەیوەندی بە جۆرێکی ترەوە هەیە لە گێڕانەوە؟
مۆنرۆ: بەڵێ، من هەمیشە بە ئاگاییەوە ئەو شێوازە لە نووسینم هەڵنەبژاردووە و دوای جۆرێك لە بیرۆکە نەکەوتووم، دیارە بێگومان من بە ئاگابووم لەمە، بەڵام من بە جۆرێك نووسیوومە کە هەستمکردووە ڕاستە و باشە بۆ من.

ستێفان ئۆشباری: ئایە هیچ کاتێك خۆت بۆ ئەوە دانابوو خەڵاتی ئەدەبی نۆبڵ وەربگریت؟

مۆنرۆ: ئۆی، نا، نا! من ژنم. بەڵام ژنانێکیش هەن ئەم خەڵاتەیان وەرگرتووە، ئەوەیان ئەزانم. من تەنها خوماری ئەو شانازییەم، زۆر دڵخۆشم، بەڵام من هەرگیز بەو جۆرە بیرم نەکردۆتەوە وەك زۆر لە نووسەرانی تر کە مەیلی بەرز ڕاگرتنی بەرهەمەکانی خۆیانیان هەیە. دیارە ئینسان ناشچێت بگەڕێت و بەهاورێکانی بڵێت من خەڵاتی نۆبڵ وەرئەگرم. ئەمە بەهیچ جۆرێك شتێکی ئاسایی نییە.

ستێفان ئۆشباری: هیچ کات ڕوویداوە بگەڕێیتەوە و یەکێك لە کتێبە کۆنەکانت بخوێنیتەوە؟

مۆنرۆ: نا! نەخێر! من لەوە ئەترسم! نا، گەروابکەم ئەوا بەدڵنیاییەوە ویستێکی زۆرم لەلادروست ئەبێت شتێك لەملاو و ئەولا بگۆڕم. تا ئێستا لە هەندێك بەشی کتێبەکانمدا ئەوەم کردووە کاتێك لە ڕەفەی کتێبخانەدا دەرمکردوون، بەڵام لەوەش تێگەیشتووم کە بێماناییە گۆڕانکاری لەو کتێبانەدا بکەم، چونکە ناکرێت لە هەمان کاتدا ئەو گۆڕانکارییە لە هەموو نوسخەکانی تری ئەو کتێبەدا بکەیت کە لەدەرەوەن.

ستێفان ئۆشباری: ئایە شتێکی تایبەتی ئەوتۆت هەیە بە ئەکادیمیای بڵێیت لە ستۆکهۆڵم؟

مۆنرۆ: ئۆی، ئەمەوێت بڵێم زۆر سوپاسگوزارم بۆ بەخشینی ئەم شانازییە گەورەیە، هیچ شتێك، هیچ شتێك لە دنیادا نەی ئەتوانی هێندەی ئەم خەڵاتە دڵخۆشم بکات. سوپاس!

سەرچاوە:

Alice Munro ـ Nobel Lecture

Nobelsamtal med Alice Munro

Samtalspartner Stefan Åsberg, SVT

Översättning Rose‌ـMarie Nielsen





# کتێب دز

## ئەو کاتەی مردن لەسەرقاڵترین ڕۆژەکانی خۆیدایە

**وەرگێڕان و ئامادەکردنی لە ئینگلیزییەوە : سورمە**

بۆ یەکەمجار لە وڵاتی ئۆستورالیا لەساڵی 2005 و دواتریش لە ساڵی 2006 لە وڵاتی ئەمریکا چاپکرا، ئەم کتێبە پێنجەمین ڕۆمانی مارکوس زوساکە و زیاتر لە یەك ملیۆن کۆپی لێ فرۆشراوە. ئەم ڕۆمانە باس لە سەردەمی نازییەکان دەکات لە دەمی مردنەوە. ئەوەی چیرۆکەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە مردن خۆیەتی، ڕەنگە

هەر ئەمەش بێت وایکردبێت چەندین خەڵاتی جۆراوجۆر وەربگرێت و دواتریش بکرێتە فیلمی سینەمایی، زوساك بە سێ ساڵ ئەم کتێبەی نووسیوە و بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی نازییەکان و هۆلۆکۆست سەردانی وڵاتی ئەڵمانیای کردووە، دایك و باوکی زوساك لە جەنگی جیهانی دووەمدا لە ئەڵمانیا گەورە بوون و چیرۆکەکانی خۆیان بۆ زوساك گێڕاوەتەوە، بەپێی ئەو ڕڤیوە جیاوازانەی بۆ ئەم کتێبە کراوە لە رۆژنامەی گاردیاندا زووساك ئەوەی وتووە کە دوو ڕووداوی ڕاستەقینە کە بەسەر دایك و باوکیدا هاتوون کاریگەرییان لە سەر نووستینی ئەم ڕۆمانە هەبووە، یەکەمیان بۆمباباران کردنی شاری مینشن ی ئەڵمانیا. دووەمیان ئەو گەنجەی نانێك ئەدات بە یەکێك لەو جولەکانەی کە بەناو شەقامەکاندا مارش ئەکەن، کۆتایی ئەم ڕووداوەش بە کوشتنی ئەو کوڕە جولەکەیە لەلایەن سەربازێکەوە کۆتایی دێت. هەروەها زوساك ئەوەشی



وتووە کە سەرسام بووە بە بیستنی ئەو چیرۆکە راستەقینەیەی کە دەربارەی کتێب دزێك لە شاری سیدنی ئۆستورالْیا ڕوویداوە. کارەکتەری سەرەکی ئەم رۆمانە کچێکی بچکۆلەیە، بەوردی باسی پەیوەندی نێوان ئەم کچە بچکۆلەیە و دایك و باوکی دووهەمی دەکات، هەروەها لەگەڵ دانیشتوانی گەرەکەکەیدا و ئەو جولەکەیەی لە جەنگی جیهانی دووەمدا لە ماڵی ئەواندا خۆی حەشاردەوە.

دوای بردنەوەی چەندین خەڵات بۆ ماوەی **230** هەفتە یەکێك بووە لە پڕ فرۆشترین کتێبەکان کە لە لیستی "**The New York Times**" ئاماژەی بۆ کراوە.

مردن یەکەم دەرکەوتنی خۆی لەبەرامبەر ئەم کچە نۆ ساڵانەیەدا بە ناوی لیسێڵ لەو کاتەدا نمایش دەکا کە ئامادەی ناشتنی تەرمی براکەیەتی لە ساڵی **1930**دا، براکەی بە ناوی ڤارنەر لەو شەمەندەفەرەدا ئەمرێت کە لەگەڵ دایکی و خۆشکەکەیدا بۆ شاری مۆڵتینگ لە ئەڵمانیا بەڕێکەوتوون. دایکیان ئەم گەشتە ڕێکدەخات تاکو هەردوو منااڵەکەی لەلای خێزانێکی متمانەپێکراو بەجێ بهێڵێت و دووریان بخاتەوە لە خۆی و




هاوسەرەکەی کە رابردوویان لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا هەبووە. لە پێناو ناشتنی کوڕەکەیدا ئەم ژنە بڕیاردەدات لە شوێنێك دابەزێت و کورەکەی بنێژێ پێش درێژەدان بە گەشتەکەیان، لە کاتی ناشتنی براکەیدا لیسێڵ یەکەم کتێبی خۆی دەدزێت. گۆڕهەڵکەنەکە ئەم کتێبەی لێ دەکەوێتە ناو بەفرەوە و سەرەڕای کەم زانینی ئەم بۆ تەمەنی خۆی و نەتوانینی خوێندنەوەی ئەم کتێبە لیسێڵ ئەم کتێبە هەڵئەگرێتەوە وەك دواهەمین یادەوەری براکەی.

 بە درێژای ئەم کتێبە مردن چیرۆکەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە. بەڵام لە چەند ساڵی دوایدا لیسێڵ دەبێتە گێڕەوەرەی دووەم، لیسێڵ دوای ئەوەی لەو ماڵەدا نیشتەجێ دەبێت کە دایك و باوکێك سەرپەرشتی دەکەن کە دایك و باوکی راستەقینەی ئەو نین، شەوانە بەو خەوە ناخۆشانە گەمارۆ ئەدرێت کە بە دایك و برا مردووەکەیەوە دەیان بینێت.

بە پێی کات پەیوەندی نێوان لیسێڵ و هانس کە باوکی دووەمیەتی گەشە دەکات. هانس هەموو شەوێك دێت بۆ لای لیسێڵ تا ئەوکاتەی خەوی لێدەکەوێ ئەم پەیوەندییە لیسێڵ دەخاتە کەشێکی ئارام و دڵنیا کەرەوەوە لە ماڵە نوێیەکەیدا، هانس شەوە درێژە بێ خەوەکان بە دەرفەت دەزانێ و لیسێڵ فێری خوێندنەوە و نووسین دەکات، هانس بۆیاخچییە و خێزانەکەی رۆسا کە کەسایەتییەکی توندتری هەیە ڕۆژانە لیسێڵی بچکۆڵە فێری کاری جل شۆری و گەیاندنی جلەکان بە دەستی خاوەنەکانیان دەکات، رۆسا هێنان و بردنی جلەکان بە لیسێڵ دەسپێرێت، بەڵکو ئەمە ئومێدێك بێت تاکو مشتەرییەکانیان بەردەوام بن و لەم کارە بێبەرییان نەکەن.

بۆ جەژنی مەسیح لیسێڵ دوو کتێبی بەکارهاتووی لەلایەن هانسی باوکیەوە پێشکەش دەکرێ، هانس کچ و کوڕێکی خۆی هەیە کە گەورە بوون و لە شوێنێکی تر ژیان دەکەن، بەڵام هەموو ساڵێك بۆ جەژنی مەسیح دەگەڕێنەوە لای دایك و باوکیان، کورەکەی هانس یەکێکە لەوانەی کە بە توندی پشتگیری هیتلەر دەکات و هەمیشە ئەرگۆمێنتی توندوتیژ لەگەڵ باوکیدا ئەهێنێتەوە دەربارەی ئەوەی نەیتوانیوە سەرکەوتوانە ئەندام بێت لە پارتی

نازییەکاندا(دژایەتییەکانی کورەکەی هانس پەیوەندی بەو ڕووداوەوە هەیە کە زۆر لە پێشتردا ڕوویداوە دەربارەی نووسین دژی جولەکەکان لە لایەن خاوەنکارەکانەوە و ئەم وەك ئەوانیتر ئەو دروشمە ناشرینانەی دژی جولەکەکان بەکارنەهێناوە) کورەکەی هانس ئەرگۆمێنتی ئەمجارەی بە تووڕەیی جێدەهێڵێ لەگەڵ باوکیدا، بەڵام ئەوەش لەیاد ناکات کە پێشنیاری خوێندنەوەی کتێبەکەی هیتلەر بۆ لیسێڵ بکات لەبری ئەو کتێبانەی باوکی داویەتێ. لەهەمان کاتدا لیسێڵ دەبێتە هاورێی نزیکی کوڕێك لە کۆڵانەکەی خۆیان بە ناوی ڕودی کە زۆر جار داوای ماچی لێدەکات و هەمیشە وەڵامەکانی بە نەخێر دەدرێتەوە. جارجار ئەم دوانە کاری دزینی کتێب بەیەکەوە ئەنجام ئەدەن تەنها لە پێناو تێرکردنی ئەو برسیەتیەی تێیکەوتوون.

ئەو گردبوونەوەیەی بۆ ڕۆژی لە دایکبوونی هیتلەر لە **20/4/1940** دا دەکرێ هاوکاتە لەگەڵ سوتاندنی کۆمەڵێك کتێبی زۆر لەلایەن خەڵکەوە، ڕێك لەم کاتەدا لیسێڵ دووەم کتێبی خۆی دەدزێت، تاکە شایەتیش کە ئەم دیمەنە ئەبینێت خێزانی پارێزگارە کە یەکێکە لەو موشتەریانەی ڕۆسا ی دایکی لیسێڵ جلەکانی بۆ ئەشوات.

لە ڕوداوەکانی دواتری کتێبەکەدا هانس لەلایەن کەسێك بە ناوی ماکس ڤاندنبێرگ پەیوەندی پێوە دەکرێ، کە کوڕی ئەو جولەکەیەیە لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا هانسی رزگاری کردووە. ئالێرەدا هانس پێشنیاری کورەکەی بە جێدەهێنێ و کتێبەکەی هیتلەر دەکرێ تاکو لە ناو ئەم کتێبەدا بلیتی شەمەندەفەر و هەندێك دیکۆمێنتی پێویستی تر بگەیەنێتە ماکس، تا لە شەوێکی تاریکدا ببێتە دانیشتووی گەرەکی هانس و لە ژێرزەمینیماڵەکەیاندا خۆی حەشاربدات، پەیوەندی نێوان ماکس و لیسێڵ رۆژ بەرۆژ بەهێزتر ئەبێت، لە یادی رۆژی لە دایکبوونی ماکس کتێبێك پێشکەش لیسێڵ دەکات.

ئەم کتێبەش وەك زۆربەی نووسراو





فیلم و ئەو هونەرانەی تر جۆرێکی ترە لە گێرانەوە و وەیادهێنانەوەی ئەو توند و تیژیانەی لە جەنگی جیهانی دووەمدا بەرامبەر جولەکەکان کراوە. وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا تایبەتمەندی ئەم کتێبە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە مردن ڕووداوەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەوەی ئێمە دەیبینین، ئەوەی خوێنەر دەیخوێنێتەوە و هەستی پێدەکات بینینی ڕووداوەکانە لە چاوی مردنەوە. ئەم فیلمە لە مانگی 1ی ساڵی **2014** لە بەریتانیا نمایش دەکرێت.

ئەم فیلمە لە دەرهێنانی "برایان پێرسیڤاڵ" ە و "ئیمێلی واتسن و سۆفی نێلیس" یەکێکن لەو ئەکتەرانەی بەشدارییان تیایدا کردووە. لە ساڵەکانی**2006**، **2007**، **2009** دا بووە خاوەنی چەندین خەڵاتی جیاواز. یەکێك لەو خەڵاتانە بۆ ساڵی **2007** خەڵاتی "ئالا" یە وەك باشترین کتێبی گەنجان، هەروەها لە ساڵی **2006** دا خەڵاتی "ئاشتی دانییێڵ ئیلیوت"ی وەرگرتووە.



# سێ ژنی بەهێز

بەیان سەلمان

**ڕۆمان: نووسینی/ ماری ندییای**
**ساڵی چاپ:** 2009، **خانەی چاپی گالیمار**
**خەڵاتی گۆنکور بۆ هەمان ساڵ**

ماری ندییای **Marie Ndiaye** یەکێکە لە نووسەرە فەرەنسییە هەرە بەناوبانگەکانی فەرەنسا. لە ساڵی **1967** لە ناوچەی لورێە نزیك پاریس لە دایکبووە. لە ساڵی **2001** خەڵاتی فیمینەی لەسەر ڕۆمانی ڕۆزی کارپ **Rosie Carpe** وەرگرت. لە ساڵی **2009** خەڵاتی گۆنکوری لەسەر ڕۆمانی سێ ژنی بەهێز **Trois Femmes puissantes** وەرگرت.



ئەم ڕۆمانە لە سێ بەش پێکهاتووە، دەشتوانین بڵێین سێ چیرۆکە لە خاڵێکدا یەکدەگرنەوە، هەر چیرۆکەی باسی ژنێك دەکات: نۆرا، فانتا، کادی. ئەم سێ ژنە دەڵێن "نا" بۆ هەموو جۆرە سەرشۆڕی و دەستبەسەرییەك، دەشڵێن "بەڵێ" بۆ ژیان با بەشە زۆرەکەشی قورسایی و سەخت بێت.

لە یەکەم بەشدا نۆرا لە فەرەنسا لەدایکبوە، لە دایکێکی سپی پێست و باوکێکی ڕەش پێست، ئەم باوکە لە شەو و ڕۆژێکدا بڕیاری دێتە سەر ئەوەی بگەڕێتەوە ئەفریقا و تەنها کوڕەکەی، سۆنی دەڕفێنێ و لەگەڵ خۆیدا دەیبات. نۆرا و خوشکە بچووکەکەی لە فەرەنسا لەگەڵ دایکیان بەجێدەهەێڵێ. نۆرا گەورە دەبێ، دەبێتە پارێزەر و خێزان پێکدەهێنێ. ڕۆژێکیان باوکی تەلەفونێکی بۆ دەکات و داوای لێدەکات بچێتە لای بۆ ئەفریقا، لەوێ ئاگاداری دەکاتەوە ببێتە پارێزەری براکەی کە گوایە زڕدایکەکەی کوشتوە و ددانی بە کوشتنەکەدا ناوە. سەرجەمی ئەم پەشەی ڕۆمانەکە لە هێنان و بردنی لایەنی دەروونی کەسایەتی سەرەکی نۆرا دەدوێ. هەموو ڕووداوەکان لە ڕوانگەی نۆرا باسدەکرێن و لەو ساتەوە دەست پێدەکات کە نۆرا دەگاتە ماڵی باوکی لە ئەفریقا و بەرەو دواوە ڕابردووی دەگێڕێتەوە. چیرۆکی ناکۆکی نۆرا و باوکی لە نێوان ڕابردوو و ئێستا بەرە بەرە ڕوون دەبێتەوە و تا ڕادەیەك وردەکارییەکانی دروست دەکرێنەوە. ئەو جیابوونەوەی خێزانە لە ڕابردوودا، هەڵوەشانەوەی دەروونیی نۆرا و خوشك و براکەی لەو ڕابردووە لە ئێستادا دەرئەنجامی لێ دەکەوێتەوە. ئەو باوکەی لە رابردوودا کچەکانی جێهێشتوە و تەنها کوڕەکەی پەسەند کردوە، وێنەی باوکێکی ناتەواوە کە تەنها لە رستەیەکیدا لە گوێی نۆرا دەنگدەداتەوە کاتێ بەو و خوشکەکەی و دایکیانی وتووە کە شایەن بەو نین، ئەم کە دەوڵەمەندە و بەرگی گران بەها لەبەردەکات و بە فەرەنسییەکی باش قسەدەکات؛ لە ئێستادا نۆرا بە پیاوێکی پیری بێکەس دەیبینێ، پۆششی ناشرینە، کە باوێشك دەدات دەمی وەك سەگ زل

دەکاتەوە، وەختی نانخواردن پەلاماری خواردن دەدات و بێ ئوسوڵە. ئەم جۆرە تێبینییانە لە سەر دەمی نۆرا دەبیبستین کە شتەکان دەگێڕێتەوە.

لە چیرۆکی دووهەمدا ڕووداوەکان لە دەوری پیاوێکە بەناوی رۆدی لە تەمەنی 43 ساڵیدایە، وەلێ چیرۆکی ڕاستی ژنەکەیەتی فانتا کە مامۆستای زمانی فەرەنسییە لە سینیگال. ڕۆدی پیاوێکی سپی پێستە، سینیگال بەجێدەهێڵێ پاش ئەوەی جوێن بە خوێنکارێك دەدات و لەدوای ئەوە بە رەگەزپەرست تاوانبار دەکرێ. ئەم قوتابییە تاوانی باوکی وەبیر دەهێنێتەوە و کێشەی جێنەبوونەوەی خۆی لە کۆمەڵی ئەفریقی کە ناچاری کرد ئەوێ بەجێهێڵێ و قەناعەت بە ژنەکەی بکات بۆ فەرەنسا دوایکەوێ. فانتا و کوڕەکەی تەنها لە نێو گێرانەوەی رۆدی جێیان هەیە و تەنها لە دوا بەشی ڕۆمانەکە فانتا تۆزێك دەردەکەوێ. رۆدی لە ئاست هەردووکیاندا بێباکە و بگرە هەموو بوونی ئەو ژنەشی بە کێشەی دەروونی خۆیەوە سڕیوەتەوە. کۆی هەستی لە ڕستەیەکی ئەم بەشەدا کورت دەبێتەوە کاتێ بیر لەوە دەکاتەوە "چۆن جارێکی دی خۆشەویستی فانتا و کوڕەکەی بکڕێتەوە". فانتا، ئەو ژنە زۆر جوانە، لە نێوان بەزەیی و توڕەیی و شەرمی رۆدی بۆ ڕابردووی کە ڕاویدەنا، لە نێوان دوو هەستە کە لەت لەتی دەکات. لە لایەکەوە بەزەیی بە رۆدی دێت، لەلایەکیشەوە تێناگات لەوەی بەڕاستی رەگزپەرستە یان نا.





لە ڕێگای گێڕانەوەی رۆدی هەموو شتێکی ژیانی خۆی و ژنەکەی لە ڕابردوودا ئاشکرا دەبێت. بە هەمان شێوەی چیرۆکی نۆرا، ڕووداوەکان بەرە بەرە لە ڕێگای گێڕانەوەی ڕۆدی ئاشکرا دەبن. لەم بەشەدا بە چاکیی تەکنیکی شەپۆلی نوێی رۆمان بەدیدەکەین، لە شێوازی گێڕانەوە بە مۆنۆلۆگی ناوەکیی کە بە وردەکارییەکی زۆر بیرکردنەوەی کەسایەتییەکەی شیکردۆتەوە. ئەمەش بواری داوە بە چاکیی لە کەسایەتییەکە و مەبەستەکانی تێبگەین.




لە چیرۆکی سێهەم، جارێکی دی ئەفریقا دەبێتە سەکۆی ڕووداوەکان. ئەم بەشەیان بە زنجیرەکاتیی(کرۆنۆلۆژی) نووسراوە. کادی ژنێکی ئەفریقی نەریتییە، خزمەتکاری دوو منداڵەکەی نۆرایە. دیارە هەر لە چیرۆکی یەکەمەوە کە باسی نۆرایە ئەم ژنەش دەردەکەوێت. کادی بە پێچەوانەی دوو چیرۆکەکەی تریان هاوکێشەی سپی پێست و ڕەش پێستی نییە، بەڵکو خودی ژن لەبەرامبەر بە کۆمەڵی ئەفریقی بە تەنیایە، ژن تەنها بوونی لە ئۆرگانێکی منداڵبوون کورتدەکرێتەوە، چیرۆکی ئەم وەك ژنێکە کە نەزۆکە، واتە لەو کۆمەڵە نەریتییە هەموو مافی پێشێلکراوە، هەر بوونی نییە. لێرەوە بەهێزی ئەم ژنەیان لەوەوەیە کە بوونی خۆی دەسەلمێنێ، وەك مرۆڤێك مافی خۆی لەو کۆمەڵە دەسێنێتەوە. پەیوەندی ئەم بە دوو ژنەکەی ترەوە وەهایە کە کادی تەواو پێشێلدەکرێ لەلایەن مێرد و ماڵ خەسوی، بەری ئەوروپا دەگرێتە بەر و دێتە لای ئامۆزاکەی فانتا، واتە ژنی ڕۆدی لە چیرۆکی دووهەم و بە گەیشتنی بۆ ئەوروپا دواتر دەبێتە خزمەتکاری ماڵی نۆرا و ئاگای لە منداڵەکانی ئەو دەبێ. گرنگی ئەم چیرۆکەیان لەوەوەیە کە ژنێکی زۆر سادەیە و بڕیار بۆ ژیانی خۆی وەردەگرێ، تەحەمولی سەختی ژیانی ئەوروپا و هەلومەرجی خۆی دەکات. وەك ژنێکی نەریتیی ئەفریقیش بە یەکدادانی لە کۆمەڵی ئەوروپیدا سڵی پێناکات و گەڕانەوەی بۆ ناو کۆمەڵی ئەفریقی ڕەتدەکاتەوە.

بە بڕوای من دەقی ئەم ڕۆمانە یەکێکە لەو دەقانەی دەکرێ لە چەند ڕوانگەیەکەوە هەڵسەنگێندرێ. بۆ لایەنی تەکنیکی ڕۆمانەکە کە لە هەمانکاتدا سادەیە و ئاڵۆزە، بەوەی سێ چیرۆکی بە یەکەوە بەستۆتەوە، بەوەی سێ کەسایەتی جیاواز لە سێ چیرۆك بە تاڵێکی پەیوەندی نێوان کەسایەتییە ژنەکان بەیەکەوە بەستراون. پرسیاری ژن لەم ڕۆمانەدا پرسیارە لە گرنگی بوونیان لە نێو ژیانێکدا کە ئازادیشیان بۆ مسۆگەرکات هەستکردنیان بە بوونیان هەر ونە. گرنگی کەسایەتییە ژنەکان لەوەدایە کە هەرسێکیان بە جۆرەی پلەی خوێندن و کار فریا دەکەون بڕیاری گرنگ بۆ ژیانی داهاتوویان وەرگرن. لە چیرۆکی یەکەمدا نۆرا دەگاتە ئەوەی کە مێرد و منداڵ بەجێدەهێڵێ لە پاریس و بەرەو لای باوکی بچێت بۆ ئەفریقا،

هەنگاوێکی بەرەورووبوونەوەیە لە نێوان خۆی و باوکی، وەك بڵێی هەر دەبوو ئەمە بێتە پێشێ. نۆرا دێتە سەر ئەو قەناعەتەی دژ بە باوکی بوەستێت کە تاوانی کوشتنی ژنەکەی داوەتە ئەستۆی کوڕەکەی، نۆرا کە هەنوکە پارێزەرە هێزی زانستیی یاسایی دەخاتەگەڕ بۆ بەرگری لە پرۆسەی براکەی کە زڕدایکەکەی نەکوشتوە و باوکی پاڵی پێوە ناوە ئەمە بڵێت. بەم بەرگریکردنەی نۆرا بۆ براکەی هەستێکی نوێی لەلا دروستدەکات، بێ بەزیی و پەشیمانی بۆ باوکی، ویژدانی خۆی دەکڕێتەوە.



لە چیرۆکی فانتا کە بە هۆی مێردەکەی سینیگال بەجێدەهێڵێ و دێتە ناوچەیەکی فەرەنسا و ژیانێکی رۆتینی بێواتا بەسەر دەبات. دەبێ ئەوە بڵێین کە ئەم هەستانە دەکرێ هی ئەو بن کە مێردەکەی دەیانگێڕێتەوە و دەشکرێ هەستی رۆدی خۆشی بێت. رۆدی کە لە رێ دەربڕینی هەستی بۆ فانتا، بیگوازێتەوە بۆ ئێمەی خوێنەر. لە رێگای ئەو جۆرە گێرانەوەیە رۆدی پیاوێکی رەشبینە و پڕ پەشیمانییە، لە کاتێکدا بە پێچەوانەی خۆی ئازایەتی و زیرەکی و بەهێزی فانتا دەبینێ.

لە چیرۆکی کادی، کە زۆر بە ناوی خاتێ و خادی دێت، ئەمەش کورتکراوەی خەدیجەیە کە ئەفریقییەکان لەلایان باوە ناوی ژن بەو جۆرە کورتبکەنەوە. کادی پشت بە خۆی دەبەستێ، بڕیاری نەگەڕانەوەی بۆ ئەفریقا زۆر گرنگە، چونکو هەندەران دەبێتە جێی حەوانەوەی وەك ژنێك، ئەفریقا دەبێتە ئەو هەڕەشەیە لە شوناسی و بەو بڕیاری مانەوەیە لە فەرەنسا، وێڕای سەختی ژیان، هەنگاو بۆ شوناسی نوێی و بۆ بوونی دەنا.

وەرگرتنی رۆمانەکە وەك هەموو دەقێکی ئەدەبیی مشتومڕی زۆری لەسەرە هەتا ئێستاش، هەن زمانی نووسینەکەی بە هی نوخبە دادەنێن و بە قورس تەماشای دەکەن و دەڵێن ئەمە رۆمانی جەماوەری گەورە نییە، هەشن بە رۆمانێکی نوێی داهێنەر لە ستیلدا تەماشای دەکەن.

دواجار بەهێزی ئەم رۆمانە بە رای من لەوەوەیە کە بە وردی بیخوێنینەوە هەست بە بەرزبوونەوە دەکەین. لەگەڵ قۆناغی





گەشەکردنی ڕووداوەکان و گۆڕانی هەلومەرجی کەسایەتییەکان لە هەر چیرۆکێکیان، بەرە بەرە لەگەڵیاندا هۆشیاردەبینەوە، ئێمەش لە بارو دۆخی سەرەتاوە کە هەستکردنە بە شکستی و لاوازییان بەرەو ئاستی بەهێزبوون دەچین.

بڕیاره لەم ژمارەیەی ئەدەبی سەردەمەوە، هەموو ژمارەیەك نووسەرێك یان دوو نووسەری بەناوبانگی سویدی بە خوێنەرانی كورد بناسێنین، ئەمەش لە ڕێگای وەرگێڕانی بەرهەمێكی ئەو نووسەرە و  گفتوگۆیەك لەگەڵیدا.

# Kerstin Ekman

# شاشتین ئێكمان

## ئەدەبی سویدی ئەدەبی سەردەم

# شەشتین لیلەمور ئێکمان

**ئامادەکردن و وەرگێڕانی بابەت: باران**
**سازدەری گفتوگۆ: هاننا گلانشۆلم**
**دەربارەی ڕۆمان: ڤیۆلا کۆندراکی**

شەشتین ئێکمان، ساڵی ١٩٣٣ لەدایك بووە. ساڵی ١٩٥٩ دەستی بە ڕۆماننووسین کردووە. ساڵی ١٩٧٨ وەك ئەندامی (ئەکادیمیای سویدی) هەڵبژێردراوە بەڵام لە ساڵی ١٩٨٩ دا، ئەکادیمیای سویدی بەجێیهێشتووە.

یەکێك لە شاکارەکانی، زنجیرە ڕۆمانی (ژنان و شار)ە، کە ڕەنگدانەوەی سەروەختی دروستکارییە لە سوید. ئەو لە چوار ڕۆماندا وەسفی کاری ژن دەکات بە خۆشحاڵی و خۆبینینەوەیانەوە.

شەشتین زۆر جار لە ڕووداوی ڕۆژانەوە پێهەڵدەنێت. ڕەنگە ئەمە هۆکارێك بێت بۆ بوونی بە یەکێك لەو نووسەرە سویدییانەی کە زۆرترین خوێنەریان هەبێت.

ئێکمان زۆر خەڵاتی گەورەی ئەدەبیی وەرگرتووە. لەوانە: خەڵاتی ئاگوست لە ساڵانی ١٩٩٣ و ٢٠٠٣دا و هەروەها خەڵاتی پیلۆت لە ساڵی ١٩٩٥دا.

گفتوگۆ



گرنگترین هۆکاری نووسینی تۆ چییە؟
شەشتین ئێکمان: لە ڕاستییدا هەرگیز بیرم لە هۆ نەکردووەتەوە، نووسین بۆ من بە سرووشتیی دەبارێت، وەك چۆن مەلەکردنی بۆق سرووشتییە.

لە چیی نووسەرێتیت زۆر ڕازیت؟
شەشتین ئێکمان: لەوە زۆر ڕازیم کە خەریکی نووسینم. بۆ ئەمەش سوپاسی خوێنەرەکانم دەکەم، مرۆڤ دەبێت شتێکی هەبێت پێی بژی. کارەکانم تەنها هی خۆمن، کەس نابێت پێمبڵێت دەبێت چی بکەم. من لە وڵاتێکدا دەژیم کە کەس سنوور و هێڵی قەدەغەکردن بۆ نووسینەکانم دانانێت. تەنانەت پێویستم بە پەیوەستبوون بە حەقیقەتیشەوە نەبووە، بەڵکوو لە جیهانی وا دا خۆم نووسیوەتەوە کە هەر نەشمزانیووە هەن.

کام کتێبەت زۆرترین مانا و بایەخی هەیە لات؟

شەشتین ئێکمان: ئەو کتێبەیان کە خەریکی نووسینی دەبم. هەمیشە ئەو کتێبە زۆرترین نیگەرانی و دڵخۆشییم پێدەبەخشێت. ئەوەی کە پێشتر نووسیومە، زۆر گرنگ نییە لام لە کاتێکدا کە من کتێبێکی ترم هەیە بیری لێبکەمەوە و دەریبکەم.

چ نووسەرێکی تر، بۆ تۆ، زۆری گەیاندووە؟

شەشتین ئێکمان: دەتوانم ئەوە بەوە هەڵبسەنگێنم کە بە بەردەوامی دەچمەوە سەر کتێبی کێ لە کتێبخانەکەمدا. پێموابێت: تۆماس مان، یوهان وۆڵفگانگ، یالمار سوێدەربەری، یالمار باریمان ... بەڵێ ئەمانە و زۆری تر لە نووسەرانی خاوەن کتێبی باش و ئەستوور، کە وەك ئەستێرەکانی ئاسمان، بە نووسین، لە بەخشینی بێسنووردان.

ئەگەر بتوانیت تەنها سێ کتێب لە جیهانی ئەدەب ڕزگار بکەیت، چ کتێبێك ڕزگار دەکەیت؟

شەشتین ئێکمان: پێویست ناکات هیچ کتێبێکی جیهانی ئەدەب ڕزگار بکەم. ئەوان لەسەر (پرۆژەی گۆتنبێرگ*) هەن. سیانی ئامادە کە تازە دامبەزاندوون: (کتێبی جەنگەڵ / ڕودیار کلیپلینگس)، (درك / هەرمان بانگس)، (حیکایەتی زستان / ئێلین). هەفتەی داهاتوو ڕەنگە سێ کتێبی تر بێت.

ڕۆمانی "کۆتایی مەزن لە کەرتی گاڵتەجاڕیدا"

لەم ڕۆمانەی شەشتین ئێکماندا، کارەکتەری خەیاڵیی "لیلەمور ترۆی"، وەك نووسەرێکی بە توانا و ژێر ناسراوە و سەرنجی خوێنەرانی ڕاکێشاوە بەڵام لە پڕێکدا ئەم وێنە جوانەی تووشی هەڕەشەی

شێواندن دەبێت، ئەوەش بەوەی کە کەسێکی ناسیاوی، کتێبێك لەسەر چۆنێتی ژیانی ڕاستەقینەی "ترۆی" دەنووسێت.

بەسەرهاتەکانی چیرۆکەکە گێڕانەوەی شەست ساڵ و ئاوێنەی ژیانی دوو ژنی زۆر لە یەکتری جیاوازە لەگەڵ باسکردنی ویستگەکانی ڕاستی و درۆ و تەنهایی گشتی و بارودۆخی نووسەرێتی.

شەشتین ئێکمان لەم ڕۆمانەیدا دەمبات بۆ گەشتێکی نایاب، بە ناو دونیای چاپەمەنی و نووسەران و جیهانە بچکۆلەکەی ڕەخنەگراندا. ئەو خاوەنی مەملەکەتێك وشەیە کە من لە ئەدەبی ئاساییدا بەدیناکەم، ئەمەش خوێندنەوەی بابەتەکانی ئێجگار خۆش و پڕ چێژ کردووە.

هەموو شت لەوێوە دەستپێدەکات کە خاوەنی چاپخانەکە، نووسەری بەناوبانگ و ئەندامی ئەکادیمیای سویدی (لیلەمور ترۆی) بانگهێشت دەکات و لۆمەی ئەوەی دەکات کە دەستنووسەکەی لەژێر ناوێکی خوازراودا ناردووە بۆ چاپخانەیەکی دی.

خاوەنی چاپخانەکە دەستنووسەکەی بە پارەیەکی زۆر لە چاپخانەکەی تر کڕیوەتەوە و بە پەستی و نیگەرانی بە نووسەرەکە دەڵێت: تۆ نابێت ئەمە چاپ بکەیت.

خاتوونە نووسەرەکە، داوا دەکات، دەستنووسەکەی بداتێ بیخوێنێتەوە. پاش ناردنی بۆ ژوورێکی خوێندنەوە، بە توندی ئاگاداری دەکەن کە بۆی نییە نووسراوەکە بباتە دەرەوەی بیناکە. ئەو تێدەگات چی ڕوویداوە، بۆیە بە دزییەوە دەڕواتە دەرەوە. دەیەوێت بە هێمنی دەقەکە بخوێنێتەوە و بیربکاتەوە چۆن ڕێ لەو کارەساتە بگرێت.

لیلەمور ترۆی تەلەفۆن بۆ چاپخانەکە دەکات و دەڵێت کە سەفەری کردووە بەڵام

لە ڕاستیدا ئەو لە شوقەکەیدا، بە دەستنووسەکەوە خۆی حەشارداوە. ترۆی دەزانێت ئەوەی ئەو دەقەی نووسیووە (باڕبڕو ئاندەرسسۆن) ە. ئەو نووسەرەی زیاتر لە پەنجا ساڵ بە نووسینی کتێب، کاریان پێکەوە کرد. پێکەوە کارکردنێك بۆ سوودی هەردوو لا. دیارە بەبێ (لیلەمور) کە لە ڕۆشناییدا دەردەکەوت و هەڵدەستا بە پاکنووسکردن و چاککردنی نووسینەکان و بەبێ (باڕبڕو) ش کە دەقەکانی دەدۆزییەوە و چیرۆکەکانی کۆدەکردەوە، هیچ کتێبێك بەرهەم نەدەهات. ئەوان قەت هاوڕێ نەبوون و هەندێکجار بۆ ماوەی زۆریش لە یەك دوور دەکەوتنەوە بەڵام هەمیشە داهاتەکانیان بە یەکسانیی دابەش دەکرد.

لەو کاتەدا کە لیلەمور دەستنووسەکە دەخوێنێتەوە، سەرزەنشتی خۆی دەکات کە چۆن هەموو شتێکی تایبەتی خۆی باسکردووە و تێدەگات کە باڕبڕو چەند بە باشی گوێیگرتووە. باڕبڕو هەرگیز باسی هیچ شتێکی خۆی نەکردووە. لیلەمور بەردەوامە لە خوێندنەوە و دەروونی ژان دەکات.

سەروەختی چیرۆکەکە، لە ساڵانی پەنجاکانەوە تا هەنووکەیە و لەو ناوەندەشدا ڕەوتی ڕووداوە مێژووییەکانی ژیان دەبینینەوە. ئەم ڕۆمانە، بەرهەمێکی خەیاڵیی و پڕ ئەندێشە و تەنزئامێزە و گەنجینەی وشەکانی شەشتین ئێکمان وایکردووە لەم کارەدا چێژی تەواو لە زمانی نووسینەکەی ببینرێت.

لە سەردەمی ئەمڕۆدا نووسینی هاوبەش مۆدەیەکە. ئێستا زۆر نووسەر هەن حەز دەکەن دوو دوو بنووسن، بۆ نموونە (کامیلا گرێبی و ئۆسا ترێف)، (ئەلیکساندرا کۆیلۆ و ئەلیکساندەر ئەندۆریل)، (ئاندێش ڕوسلوند و بیۆرێ هێلستڕۆم). ڕەنگە زۆری تریش هەبن کە ئێمە دەربارەیان نازانین.

شەشتین ئێکمان، سوپاس بۆ ئەو ڕۆمانە پڕ چێژ و فرە جوانە.

## خەڵات و فیلم

شەشتین ئێکمان بۆ ڕۆمانی (کۆتایی مەزن لە کەرتی گاڵتەجاڕیدا)، ساڵی ٢٠١٢ (خەڵاتی کەسێتی ئیڤار لۆ یوهانسسۆن)ی پێبەخشرا. ئەم خەڵاتە ئەدەبییە سویدییە، لە ئاستێکی باڵادا، لە دوای خەڵاتی نۆبڵەوە دێت و نرخەکەی ٣٣٠٠٠٠ کرۆنە.

هەروەها بڕیاردراوە ئەم ڕۆمانە بکرێتە فیلم و (شەشتین ئێکمان) لەگەڵ (ئانیکا تور)ی نووسەردا، سیناریۆی فیلمەکە بنووسن، بەو نیازەی فیلمەکە لە ساڵی ٢٠١٤دا نمایش بکرێت.
پڕۆژەی گۆتنبێرگ* کتێبخانەیەکی ئەلەکترۆنی سەر تۆڕی ئینتەرنێتە.

سەرچاوە:
**litteraturmagazinet**



**سازکردنی: سوزانا هونوێڵ و ڕیکاردۆ ئۆگێستۆ سێتی**
**وەرگێڕانی لە ئیسپانییەوە بۆ ئینگلیزی: سوزانا هونوێڵ**
**وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی: ماردین ئیبراهیم**

- تۆ نووسەرێکی گەلەك ناسراویت و خوێنەران ئاشنای نووسینەکانتن. پێمان ناڵێیت تۆ چی دەخوێنیتەوە؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: لەو ساڵانەی دواییدا شتێکی سەرنجکێش ڕوویدا. تێبینم کردووە من تا دێت کەمتر و کەمتر کاری نووسەرانی هاوسەردەمی خۆم دەخوێنمەوە، و زیاتر و زیاتر نووسینی

نووسەرانی ڕابردوو دەخوێنمەوە. زۆرتر نووسینەکانی سەدەی نۆزدە دەخوێنمەوە و کەمتر هی سەدەی بیست. لەو ڕۆژانەدا، زیاتر مەیلم بەلای خوێندنەوەی وتار و بابەتی مێژووییە نەك بابەتی ئەدەبی. زۆر بیرم لەوە نەکردۆتەوە لەبەرچی فلان شت دەخوێنمەوە.... هەندێکجار پەیوەندی بە پرۆفێشناڵێتیمەوە هەیە. پرۆژە ئەدەبییەکانم پەیوەستییان بە سەدەی نۆزدەوە هەیە: وتارێك لەمەڕ 'بێنەوایان'ی ڤیکتۆر هۆگۆ، یاخود ڕۆمانێك کە ئیلهامەکەی لە ژیانی 'فلۆرا تریستان'وە هاتبێت کە ڕیفۆرمیستێکی کۆمەڵایەتی فرانکۆ- پیرۆیی و فیمینیست بوو. جگە لەوەش کە لە پانزە و شانزە سالانی تەمەنتدایت، هەست دەکەیت هەموو کاتی دنیا لەبەردەمتدایە. کاتێکیش دەگەیتە پەنجا، تێدەگەیت ڕۆژەکانت بە ئەژمارن و دەبێت بابەتی خوێندنەوەکانت گوڵچن بکەیت. زۆر پێدەچێت لەبەر ئەوە بێت من نووسینی هاوچەرخەکانی خۆم ناخوێنمەوە.

- بەڵام لەناو نووسەرانی هاوچەرخی خۆت کە کارەکانیان دەخوێنیتەوە، بە کارەکانی کێ بە دیاریکراوی سەرسامیت؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: ئەو دەمەی لاو بووم، خوێنەرێکی سەرگەرمی سارتەر بووم. ڕۆماننوسە ئەرمیکیەکانم خوێندەوە، بە دیاریکراوی نەوەی ونبوو - فۆکنەر، هەمەنگوای، فیتزجیراڵد، دۆس پاسۆس – بەتایبەتیش فۆکنەر. لە نووسەرانەی کە لاوبووم خوێندمنەوە، فۆکنەر یەکێکە لەو نووسەرە دەگمەنانەی تا ئێستاش مانای زۆرە بۆ من. من قەت لە فۆکنەر نائومێد نەبووم کاتێك دووبارە خوێندمەوە، بۆ نموونە وەك ئەوەی لە دووبارە خوێندنەوەی نووسەری دی، با بڵێین، هەمەنگوای، جاروبار نائومێد بووم. ئەمڕۆ جارێکی دی سارتەر ناخوێنمەوە. بەبەراورد بە هەموو ئەو شتانەی لەو کاتەوە خوێندوومەتەوە، ئەدەبی سارتەر بەسەرچووە و زۆر لە بەهای خۆی لەدەست داوە.. بۆ وتارەکانیشی، زۆربەیان بەلای منەوە کەمتر گرنگن، ڕەنگە یەك ئاوارتە هەبێت - " سانت جێنێت: کۆمێدی یان شەهید،" کە تا ئێستاش کەیفم پێی دێت. ئەوان پڕن لە هاودژی، لێڵیی، ناووردبینیی و فشوفۆڵیی،






شتگەلێك كە هەرگیز لە فۆكنەر رووناداتَ. فۆكنەر یەكەمین ڕۆماننووس بوو لە كاتی خوێندنەوەیدا قەڵەم و كاغەز لەبەردەستمدا بوو، چونكە تەكنیكەكەی حەپەساندمی. ئەو یەكەمین ڕۆماننووس بوو كە هۆشیارانە كۆششم كرد كارەكانی بنیاد بنێمەوە بە هەوڵدان بۆ شوێنپێهەڵگرتنی، بۆ نموونە ڕێكخستنی كات، یەكتربڕینی كات و شوێن، وەستان لە گێڕانەوەدا و توانای ئەو لە گێڕانەوەی چیرۆك لە گۆشەنیگای جیاوازەوە لە پێناو خولقاندنی ناڕۆشنییەكی دیاریكراو، بۆ ئەوەی قووڵاییەكی زیادەی بداتێ. بۆ من وەك نووسەرێكی ئەمریكای لاتین، پێم وایە زۆر بەسوود بوو كتێبەكانی بخوێنمەوە، چونكە سەرچاوەی بەنرخی تەكنیكی وەسفی بوون كە دەكرا بەسەر جیهانێكدا پراكتیزە بكرێت – جیهانی یۆسا و.ك- ، كە تا ڕادەیەك، زۆر جیاواز نەبوو لەو جیهانەی فۆكنەر باسی دەكات. دواتر، هەڵبەتە، ڕۆماننوسەكانی سەدەی نۆزدەم بە ئارەزوویەكی بێئەندازەوە خوێندەوە: فلۆبێر، بەلزاك، دوستۆیڤسكی، تۆڵستۆی، ستانداڵ، هاوسۆرن، دیكنز و مێلڤیل. من تا ئێستاش خوێنەرێكی دڵگەرمی نووسەرانی سەدەی نۆزدەم. هێندەی پەیوەندی بە ئەدەبی ئەمریكای لاتینەوە هەیە، مایەی سەرسوڕمانە، من تا لە ئەوروپا نەژیام كەشفم نەكرد و بە دڵگەرمییەكی زۆرەوە نەكەوتمە خوێندنەوەی. دەبوایە لە زانكۆی لەندەن وەك دەرس بیڵێمەوە كە ئەزموونێكی دەوڵەمەند بوو بۆ من، چونكە پاڵی بە منەوە نا بیر لە سەرجەمی ئەدەبی ئەمریكای لاتین بكەمەوە. لەوێ بەدواوە بۆرخیسم خوێندەوە، كە تاڕادەیەك ئاشنای بووم، كارپێنتیر، كۆرتازار، گویماریس ڕۆسا، لێزاما لیما ـ هەموو ئەو نەوەیە جگە لە ماركیز. دواتر ماركیزم دۆزییەوە و تەنانەت كتێبێكم دەربارەی نووسی: " گارسیا ماركیز: مێژووی بڕیارێك". هەروەسا دەستم كرد بە خوێندنەوەی ئەدەبی سەدەی نۆزدەی ئەمریكای لاتین، چونكە دەبووایە لە زانكۆ بیڵێمەوە. ئەوكات زانیم ئێمە نووسەری یەكجار سەرنجراكێشمان هەیە – ڕەنگە ڕۆماننوسمان كەمتر بێت لە وتارنووس و شاعیر- . سارمیانتۆ، بۆ نموونە، قەت ڕۆمانی نەنووسیوە، بەڕای

من یەکێکە لە گەورەترین ئەو چیرۆکبێژانەی ئەمریکای لاتین بەرهەمی هێناوە؛ ' فاکوندۆ' کە ئەو نووسیوویەتی شاکارێکە. بەلام ئەگەر ناچار بکرێم یەك ناو هەڵبێنم، ئەوا دەڵێم بۆرخیس، چونکە ئەو جیهانەی ئەو دەیخولقێنێت بەلای منەوە زۆر ڕەسەنە. بەجیا لە ڕەسەنایەتییە مەزنەکەی، هەروەها ئەو، بەهرەمەندە بە خەیاڵێکی نایاب و کلتوورێك کە خۆی خاوەنییەتی. هەروەها بێگومان زمانی بۆرخیس، کە بە مانایەك لە ترادیسیۆنی ئێمە جیابۆتەوە و ترادیسیۆنێکی دیکەی بەڕووماندا کردەوە. زمانی ئیسپانی زمانێکە مایلە بەرە و حەماسەت، تەقینەوە و داهێنان و دەوڵەمەندیی. گەورەنووسەرانمان هەموویان درێژنووس بوون، لە سێرڤانتسەوە بۆ ئۆرتیگا، گاسێت، ڤالیئینکلان، یاخود ئەلفۆنسۆ رێیس. بۆرخیس پێچەوانەیە – کورتبڕ، دەستپێوەگر و بەدیقەت. ئەو تاکە نووسەری زمانی ئیسپانییە کە بەئەندازەی ژمارەی ئایدیاکانی وشەی هەیە. ئەو یەکێك لە گەورەترین نووسەرانی سەردەمی ئێمەیە.

- پەیوەندیت لەگەل بۆرخیس چۆن بوو؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: یەکەمجار ئەوم لە پاریس بینی، ئەو دەمەی سەرەتای شەستەکان من لەوێ دەژیام. ئەو لە پاریس بوو تا سیمینارگەلێك دەربارەی ئەدەبی خەیاڵی و گۆچێسکا-ڕەوتێکی چیرۆکنووسینی ئەمریکای لاتین- پێشەکەش بکات. دواتر چاوپێکەوتنێکم لەگەڵدا سازدا بۆ ئۆفیسی ڕادیۆ و تەلەفیزیۆنی دووی فەڕەنسی کە ئەودەم من لەوێ کارم دەکرد. ئێستاش بە هەستوسۆزەوە بیر لەو چاوپێکەوتنە دەکەمەوە. دوای ئەوە، چەندان جاری دی لەشوێنی جیاوازی ئەم دنیایە یەکدیمان بینی، تەنانەت لە لیما بۆ خواردنی شێوان داوەتم کرد. لە پاشان داوای لێکردم بیبەم بۆ پێشاو – تەوالێت-. کاتێك میزی دەکرد لەپڕ وتی ، پێت وایە کاسۆلیکەکان خەڵکانی جددی بن؟ بەئەگەری زۆر، نەخێر.

دواجار کە بینیم لە ماڵەکەی خۆی بوو لە بۆینس ئایرس؛ دیدارم لەگەڵ کرد بۆ بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆن کە هەمبوو لە پیرۆ، وە





ئەو هەستەم بۆ پەیدا بوو کە خۆشی نەهات بە هەندێك لەو پرسیارانەی لێمکرد. مایەی سەرسوڕمان بوو، دوای چاوپێکەوتنەکە یەکجار پەست بوو - من بەدێژایی دیدارەکە، چاودێریم دەکرد، هەڵبەتە من بێئەندازە بایەخم هەبوو بۆی، نە هەر لەبەر ئەو ڕێز و ئیعجابەی هەمبوو بۆی، بەڵکو لەبەر ئەو عەشقەش کە بۆ ئەو پیاوە کەمەندکێش و نازکەوە هەمبوو- وتم من سەرم لە سادەیی و خاکێتیی خانووەکەی سوڕماوە، کە کاغەزی دیوارپۆشی ماڵەکەی دڕاوە و بنمیچەکەشی ئاوی لێدەچکێت. دیار بوو ئەوەی بە توندی بە سووکایەتی وەرگرتبوو. دوای ئەوجارە، جارێکی دی بینیمەوە بەڵام زۆر خۆی بەدوورگرت لێم. ئۆکتاڤیۆ پاز پێی گوتم کە بۆرخیس بە قسەکەی من دەربارەی خانووەکەی زۆر پەست بووە. ئەوە تاکە شتێك بوو ڕێی تێدەچوو ڕەنجاندبێتی، ئەگینا من لە ستایشی ئەو زیاتر هەرگیز هیچی دیکەم دەربارەی نەوتووە. پێم وایە کتێبەکانمی نەخوێندەوە. بە قسەی خۆی، لە تەمەنی چل ساڵییەوە، ئەو نووسینی نووسەرانێك ناخوێنێتەوە کە لە ژیاندا بن، هەندێك کتێب هەن، ئەو بەردەوام دەیانخوێنێتەوە و دەیانخوێنێتەوە.... ئەو نووسەرێکە من زۆر سەرسامم پێی. بەڵام ئەو تاکە نووسەرێك نییە من پێی سەرسام بم، بێگومان، پابلۆ نێرۆدا شاعیرێکی ناوازەیە. ئۆکتاڤیۆ پازیش – نەك هەر شاعیرێکی مەزنە، بەڵکو وتارنووسێکی گەورەشە، پیاوێکی تەڕدەستە لەبواری سیاسەت، هونەر و ئەدەب. کونجکۆڵی ئەو کونجکۆڵییەکی جیهانییە. من تا ئیستاش بە چێژێکی زۆرەوە دەیخوێنمەوە. هەروەسا، دیدگای سیاسی ئەو هاوشێوەی دیدگای سیاسی منە.

- لەناو ئەو نووسەرانەی سەرسامیت پێیان، ئاماژەت بۆ نێرۆدا کرد. تۆ هاوڕێی بوویت. ئەو چۆن بوو؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: نێرۆدا ژیاندۆست بوو. ئەو مەیلێکی کێویانەی هەبوو بۆ هەموو

شتێك ـ شێوەكاری، هونەر بە گشتی، كتێبەكان، چاپكراوی دەگمەن، خوواردن، خواردنەوە. خواردن و خواردنەوە بۆ ئەو تارادەیەك ئەزموونێكی ڕۆحانی بوو. پیاوێكی یەكجار دڵنشین، تژی بوو لە وزەی ژیان ـ بێگومان ئەگەر ئەو شیعرانەی فەرامۆش بكەین كە لە ستایشی ستالیندا نووسی. ئەو لە جیهانێكی نیمچە ـ فیوداڵی خۆیدا دەژیا؛ كە هەموو شتێك سەری دەكێشا بۆ كەیفوسەفای ئەو، سەری دەكێشا بۆ شیرینی و جۆشوخرۆشی ژیانی ئەو. من بەختی ئەوەم هەبوو پشوویەكی هەفتە لە وێندەر لە ئیزا نیگرا بەسەر بەرم. زۆر خۆش بوو! جۆرێك لە ماشێنی كۆمەڵایەتی لەدەوری ئەو لە تەڤگەڕدا بوو، یەك ڕەوە خەڵك خواردنیان لێدەنا و كاریان بۆ دەكرد – هەمیشە میوانگەلی زۆریش. گردبوونەوەیەكی زۆر سەیر بوو، بەشێوەیەكی ناوازە زیندوو، بەبێ بوونی بچووكترین شوێنپێی ڕۆشنبیرییگەریی. نێرۆدا تەواو پێچەوانەی بۆرخیس، پیاوێك كە وا دەردەكەوت كە قەت نان ناخووات، ناخواتەوە، جگەرە ناكێشێت، پیاوێك كە دەكرا بگووترێت قەتیش سێكسی نەكردووە، چون بۆ ئەو، هەموو ئەو شتانە بە پلە دوو دادەنران، ئەگەر كردبانیشی لەبەر ڕێز بوو نەك شتێكی دی. چونكە ئایدیاكان، خوێندنەوە، ڕامان و داهێنان ژیانی ئەو بوون، ژیانێكی تەواو عەقڵانی. نێرۆدا لە ترادیسیۆنی جۆرج ئەمادۆ و ڕافائیل ئەلبێرتێ وە كەوتبۆوە كە ئەدەبیاتیان وەك خولقێنراوی ئەزموونی جەستەیی ژیان دەبینی. ئەو ڕۆژەم لەبیرە كە یادی لەدایكبوونی نێرۆدامان لە لەندەن كردەوە. ئەو ویستی ئاهەنگەكە لەسەر بەلەمێك لە ڕووباری 'تامس'- ڕووبارێكە بەناو لەندەندا دەڕوات. و.ك- دا بەڕێوە بچێت. بەخۆشحاڵییەوە، یەكێك لە عاشقانی ئەدەبی ئەو، شاعیری ئینگلیز ئەلستەر ڕید، لەناو بەلەمێك لە ڕووباری تامسدا دەژیا، بەوەش توانیمان ئاهەنگەكەی بۆ ڕێكبخەین. كاتەكە هات و ئەو پێی ڕاگەیاندین كە كۆكتێلێك دروست دەكات. ئەوە هەرەگرانترین خوواردنەوە بوو لە جیهاندا كە نازانم پێكهاتبوو لەچەند بوتڵ دۆم پێریگنۆن، شەربەتی میوەكان، و خوا دەزانێت چی دیكەش. ئەنجامەكەش، بێگومان، زۆر نایاب بوو، وەلێ یەك پەرداخ بەس بوو بۆ ئەوەی سەرخۆشت بكات. ئیتر ئاوا، هەمووومان سەرخۆش بووین، هەر هەمووومان. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێستاش لەیادمە چی پێگووتم، شتێكی وت كە بەدیژایی ساڵان وەك ڕاستییەكی گەورە،



سەلما. وتارێك لەو كاتەدا ـ بيرم نەماوە دەربارەی چی بوو ـ زۆر منی پەست و بێتاقەت كردبوو، چونكە سووكايەتی پێكردبووم و درۆی بۆ هەڵبەستبووم. من پيشانی نێرۆدام دا. لەناوەڕاستی ئاهەنگەكەدا، نێرۆدا پێشگۆيی كرد: تۆ وا بەرەو بەناوبانگبوون دەڕۆيت. دەمەوێت ئەوە بزانيت كە چی چاوەڕێتە: تا پتر بەناوبانگ بيت، پتر بەو شێوەيە پەلامار دەدرێيت. بۆ هەر ستايشێك، دوو يان سێ سووكايەتی دەبێت. من بۆخۆم سينەم پڕە لە سووكايەتيپێكردنەكان، بەدگۆييەكان و بێڕێزييەكان كە مرۆڤێك بكرێت تەحەموليان بكات. نەمهێشت هيچ لەوانە سەغڵەتم بكەن: دز، بەدڕەفتار، ناپاك، سەرسەری، تەرەس...هەموو شتێك! ئەگەر بەناوبانگ بيت، دەبێت بەرگەی ئەوانە بگريت. نێرۆدا ڕاستی وت؛ پێشگۆييەكەی بەڕاست گەڕا. من نەك سينەيەك، بەڵكو چەند جانتايەكم لەو وتارانە هەيە كە تژين لەو جنێو و سووكايەتيانەی كە دەكرێت بە كەسێك بگووترێن.

ـ ئەدی دەربارەی ماركيز؟

ماريۆ ڤارگاس يۆسا: ئێمە هاوڕێ بووين؛ لە بەرشەلۆنە دوو ساڵ دراوسێ بووين، لە سەر هەمان شەقام دەژياين. دواتر، بەهۆی كەسی تايبەت و هەروەها بەهۆی سياسی لێكدی جيابووينەوە. بەڵام هۆی بنەڕەتی بۆ تێكچوونی نێوانمان گرفتی كەسيی تايبەت بوو كە هيچ پەيوەندی بە بڕوای ئايديۆلۆجی ئەوەوە نەبوو – كە بێگومان حەزم بە ديدگای ئايديۆلۆجی ئەو نەبوو. لە ڕوانگەی منەوە، نووسينی ئەو لەگەڵ ديدی سياسی ئەو هاوتا نيين. دەی، من زۆر سەرسامم بە تواناكانی ئەو وەك نووسەر. وەك پێشتر وتم، من كتێبێكی شەششەد لاپەڕەييم دەربارەی كارەكانی ئەو نووسی. بەڵام هێندە ڕێزم نييە بۆ خۆی و بۆ ديدگا سياسييەكانی، كە بەلای منەوە جددی نيين. ديدی سياسی ئەو هەلپەرستانە و



عەوامخووازانەیە.

ـ ئەو گرفتە کەسییەی ئاماژەت بۆ کرد پەیوەندی بەو ڕووداوەوە هەیە کە لە سینەمایەکی مەکسیك لە نێوانتاندا روویدا و لێکدی گیر بوون؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: ڕووداوێك لە مەکسیك قەوما. بەڵام ئەوە بابەتێکە بایەخی ئەوەی نییە لەبارەیەوە بدوێم؛ دیارە مەزەنە و مەزەنەکاری زۆری خستەوە و ئەز نامەوێت کاڵای زیاتر بدەمە شرۆڤەکاران. ئەگەر یادەوەرییەکانی خۆم بنووسمەوە، چیرۆکەکە وەکی خۆی باس دەکەم.

ـ تۆ بابەتی کتێبەکانت هەڵدەبژێریت یان ئەوان تۆ هەڵدەبژێرن؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: ئەوەندەی جێی بایەخی من بێت، من بڕوام وایە بابەتەکە نووسەرەکە هەڵدەبژێرێت. من هەمیشە ئەو هەستەم هەبووە کە چیرۆکگەلی تایبەت خۆیان بەسەر مندا دەسەپێنن؛ توانای فەرامۆشکردنیانم نییە، چون بە هەندێك ڕێگای سەیر، پەیوەندییان بە جۆرێك ئەزموونی فەندەمێنتاڵەوە هەیە ـ نازانم بڵێم چۆن. بۆ نموونە، ئەوکاتەی لە قوتابخانەی سەربازی لیۆنیسۆ پرادۆ لە لیما بەسەرم برد، ئەودەم هێشتا کوڕێژگەیەك بووم، پێویستییەکی ڕاستەقینەی دامێ، ئارەزوویەکی دەمارگیرانەی دامێ بۆ نووسین. ئەوە ئەزموونێکی شۆکئامێزی توند بوو کە لە زۆر لایەنەوە خەتوخاڵی بۆ کۆتایی منداڵیم نەخشاند – سەرلەنوێ کەشفکردنەوەی وڵاتەکەم وەك کۆمەڵگایەکی توونددوتیژ، تژی لە تفتوتاڵی، پێکهاتوو لە توێژگەلی ڕەگەزی، کلتووری و کۆمەڵایەتی کە لە ململانێی تەواودابوون، وە هەندێکجار گیرخواردوو لە پێکدادانی شەڕانگێزانە. پێم وایە ئەو ئەزموونە کاریگەری داناوە لەسەرم؛ شتێك لێی دڵنیام ئەوەیە کە پێداویستی منی هەڵکشاند بۆ داهێنان، بۆ خولقاندن.

ئێستاشی لەگەڵدا بێ، هەمان شێوەیە بۆ گشت کتێبەکانم.





هەرگیز ئەو هەستەم نەبووە کە خۆم بەشێوەیەکی عەقلانی و بەخوێنسارديیەوە بڕیارم دابێت چیرۆکێك بنووسم. بە پێچەوانەوە، خەڵکان یان ڕووداوی دیاریکراو، هەندێکجار خەونەکان یان خوێندنەوەکان کتوپڕ خۆیان سەپاندووە و داوای سەرنجیان کردووە. لەبەر هێندێیە ئەز گەلەك دەربارەی گرنگی توخمە ناعەقلانییە پەتییەکان لە داهێنانی ئەدەبیدا قسان دەکەم. ئەو ناعەقلانییەتە، پێم وایە، پێویستە لە ڕێگای خوێنەریشەوە بێت. پێم خۆشە بە هەمان ئەو ڕێگایەی من ڕۆمانێکی دڵنشین دەخوێنمەوە، ڕۆمانەکانی منیش بخوێنرێنەوە. ئەو ڕۆمانانەی منیان سەرسام کردووە، زۆرتر ئەو ڕۆمانانە بوون کە جادوویان لێکردووم، وە کەمتر ئەوانە بوون کە لە ڕێگەی کەناڵەکانی عەقڵ و ڕۆشنبیرییەوە گەیشتوونەتە من. ئەوانە ئەو چیرۆکانە بوون کە تووانای وێرانکردنی هەموو بەشەکانی منیان هەبووە و ئینجا لە شەوق‌وڕەوقدا جێیان هێشتووم. ئەوە ئەو جۆرەی ڕۆمانە حەزم لێیە بیخوێنمەوە و ئەو جۆرەی ڕۆمانە حەزم لێیە بینووسم. من وای دەبینم زۆر گرنگە کە توخمی ئینتیلیکتوال و عەقلانی کە بونی لە ڕۆمانێکدا نەتووانرێت خۆی لێ لابدرێت، لە کردارێکدا بتوێنرێتەوە، بخرێتە بۆتەی چیرۆکێکەوە کە خوێنەر کەمەندکێش بکات، نەك بە ئایدیاکانی، بەڵکو بە ڕەنگەکانی، بەو جۆشوخرۆشەی دەیجووڵێنن، بە توخمی سەرسامکەریان، و دواجار بەو شەوق‌وڕەوق ولوغز و ڕازەی بەرهەمی دەهێنن. بە دیدی من، تەکنیکی ڕۆمانێك بە زەروورەت بوونی هەیە بۆ بەرهەمهێنانی ئەو کاریگەرییە – بۆ کەمکردنەوە یاخود ئەگەر بکرێت بۆ نەهێشتنی مەودای نێوان چیرۆکەکە و خوێنەرەکە. بەو مانایە، من نووسەرێکی سەدەی نۆزدەم. ڕۆمان بۆ من تا ئێستاش ڕۆمانی سەرکێشییەکانە کە بەو ڕێگا





تایبەتییە دەخوێنرێتەوە کە باسم کرد.

ـ چی دەبێتە گاڵتەبازیی لە ڕۆمانەکانتدا؟ ئەو ڕۆمانەی هەرە دواییت زۆر دوورە لەو گاڵتەجاڕییەی لە ' پوورە جولیا و فیلمنامەنووسەکە' دا هەیە. ئایا سەختە لەمڕۆدا پراکتیزی گاڵتەجاڕیی بکەیت لە نووسیندا؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: قەت لەمن ڕووینەداوە پرسیار لەخۆم بکەم کە ئایا من ئەمڕۆ کتێبێکی گاڵتەئامێز دەنووسم یان کتێبێکی 'جددی'. بابەتی ئەو کتێبانەی لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا نووسیوومن کەمتر خۆیان لەقەرەی گاڵتەوگەپ داوە. پێم وانییە " جەنگی کۆتایی جیهان" و " ژیانی ڕاستەقینەی ئەلیاندرۆ مایتا"، یاخود ئەو شانۆنامانەی نووسیوومن لەسەر تێماگەلێك بنیادنرابن کە بکرێت گاڵتەئامێزانە مامەڵەیان لەتەکدا بکرێت. ئەدی دەربارەی " لە ستایشی زڕدایکدا"؟ گاڵتەوگەپێکی زۆری تێدایە، وانییە؟

من پێشتر حەساسییەتم هەبوو بە گاڵتەوگەپ، چونکە ساویلکانە وام دەبینی ئەدەبی جددی قەت پێناکەنێت؛ وام دەبینی گاڵتەوگەپ دەکرێت گەلەك مەترسیدار بێت ئەگەر من بمەوێت باسی گرفتە کۆمەڵایەتی، سیاسی و کلتوورییە جددییەکان بکەم لە ڕۆمانەکانمدا. وام دەبینی گاڵتەوگەپ وا لە چیرۆکەکانم دەکات تەنك و 'دەستکرد' دەربکەون، وە ئەو هەستە لای خوێنەر دروست دەکات کە چیرۆکەکانی من هیچ نیین جگە لە سەرگەرمکردنێکی سووکەڵە. لەبەر ئەوە بوو خۆم لە گاڵتەوگەپ بە دوور گرت، زۆر ڕێی تێدەچێت لەژێر کاریگەری سارتەر بووبێت کە هەمیشە زۆر شەڕانگێز بوو بەرامبەر گاڵتەوگەپ، بەلایەنی کەمەوە لە نووسینی خۆیدا. وەلێ ڕۆژێك، کەشفم کرد کە بۆ ئەوەی ئەزموونێکی دیاریکراوی ژیان لە ئەدەبدا ڕەنگبداتەوە، گاڵتەوگەپ دەکرێت ئامرازێکی بەنرخ بێت. ئەوە لە "کاپتن پانتۆیا و خزمەتی تایبەت" ڕوویدا. لەوە بەدواوە، من زۆر هۆشیار بووم بەرامبەر گاڵتەوگەپ وەك گەنجینەیەکی گەورە، وەك توخمێکی بنەڕەتی ژیان و ئینجا توخمێکی سەرەکی ئەدەبیش. وە ئەو ئەگەرە



لانادەم کە گاڵتەوگەپ دیسانەوە ڕۆڵی گرنگی دەبێت لە ڕۆمانەکانمدا. وەك ڕاستییەکیش، ڕۆڵیان هەبووە. ئەمە بۆ شانۆنامەکانیشم هەر ڕاستە، بە دیاریکراوی " کاسی و هیپۆپۆتامۆس".



ـ دەتوانی باسی خووی کارکردنی خۆتمان بۆ بکەیت؟ تۆ چۆن کار دەکەیت؟ چۆن ڕۆمانێك سەرهەڵدەدات؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: پێش هەموو شتێك، زیندەخەونێکە جۆرێك لە ڕامانە دەربارەی کەسێك، بارودۆخێك، شتێك کە تەنیا لە مێشکدا ڕوودەدات. ئینجا دەست دەکەم بە تێبینی نووسین، کورتکردنەوەی زنجیرەی گێڕانەوە: کەسێك لێرەوە دێتە ناو دیمەنەکەوە، لەوێوە دەڕواتە دەرەوە، ئەمە و ئەوە دەکات. کاتێك دەست بە خودی ڕۆمانەکە دەکەم، نەخشەیەکی گشتی بۆ گرێچنەکە دەکێشم ـ کە هەرگیز پێوەی پەیوەست نابم، لەگەڵ چوونە پێشەوەمدا بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا دێنم ـ بەڵام دەرفەتی دەستپێکردنم بۆ دەڕەخسێنێت. ئینجا دەست دەکەم بە پێکەوە لکاندنیان، بەبێ بچووکترین قەلەق دەربارەی ستایڵ، نووسین و سەرلەنوێ نووسینەوەی هەمان دیمەن، درووستکردنی هەلومەرجی خودان هاودژی تەواو.
کەرەسەی خاو هاوکاریم دەکات، دڵنەواییم دەکات. بەڵام ئەوە ئەو بەشەی نووسینە کە سەختترین کاتم هەیە لەگەڵیدا. کاتێك لەو قۆناغەدام، زۆر بە وریاییەوە هەنگاو هەڵدەگرم، و هەمیشە نادڵنیام دەربارەی ئەنجامەکە. دەستنووسی یەکەم لەناو دڵەڕاوکێیەکی ڕاستەقینەدا دەنووسرێت. ئینجا کە ئەو ڕەشنووسەم تەواو کرد، هەموو شتێك گۆڕانی بەسەردا دێت ـ کە هەندێکجار دەکرێت زۆر بخایەنێت؛ بۆ " جەنگی کۆتایی جیهان"، قۆناغی یەکەم نزیکەی دوو ساڵی خایاند- . ئینجا دەزانم کە چیرۆکەکە لەوێیە، خۆی لەناو ئەو شوێنەدا حەشارداوە کە من پێی دەڵێم شلەی بورکانیی من. ئەوە فەوزایەکی تەواوە بەڵام ڕۆمانەکە لەوێندەرە، لەناو دنیایەك توخمی مردوودا وێڵە، لەگەڵ دیمەنگەلی

ناپێویست کە ون دەبن، یاخود دیمەنگەلێك کە چەندانجار و لەگۆشەنیگای جیاوازەوە چەندبارە دەبنەوە، لەگەڵ کاراکتەری جیاواز. زۆر فەوزایە کە تەنیا بۆ من مانای هەیە. بەڵام چیرۆکەکە لەوێندەر لەدایك دەبێت. دەبێت چیرۆکەکە لەسەرجەم ئەو شتانە هەڵاوێریت، پاکی بکەیتەوە، وە ئەوەش خۆشترین بەشی کارەکەیە. لەوێ بەدواوە من دەتووانم کاژێرگەلی درێژتر کار بکەم، بەبێ ئەو گرژی و دڵەڕاوکێیەی یاوەری نووسینی ڕەشنووسی یەکەمە. پێم وایە ئەوەی خۆشم دەوێت خودی نووسین نییە، بەڵکو سەرلەنوێ نووسینەوەیە، دەستکاریکردنە، چاککردنە....... پێم وایە ئەوە داهێنەرانەترین بەشی نووسینە. ئەز قەت نازانم کەنگێ چیرۆکێك تەواو دەکەم. بەش هەبووە پێم وابووە بە چەند مانگێك تەواوی دەکەم، کەچی چەند ساڵێکی لێبردووم تا تەواوم کردووە. ڕۆمانێك وا دەردەکەوێت بۆ من تەواو بووە، کاتێك کە هەست دەکەم ئیتر نابێت بەو زووانە کۆتایی پێبهێنم. کاتێك تێر بووم، کاتێك گەیشتمە ئەوەی بڵێم بەسە، کاتێك ئیتر چیدی ناتوانم ئارام بگرم، ئیتر چیرۆکەکە تەواو بووە.

- تۆ بە دەست دەنووسیت، یان بە ئامێری نووسین؟ یاخود جاروبار بە دەست و جاروباری دیش بە ئامێری نووسین؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: من یەکەمجار بەدەست دەنووسم. ئەز هەمیشە سەر لەبەیانیان دەنووسم، لە کاتژمێرەکانی بەرایی سبەینان، هەمیشە بەدەست دەنووسم. ئەو کاتژمێرانە، کاتژمێرگەلی داهێنەرانەن. قەت لە دوو کاتژمێر پتر بەو شێوەیە کار ناکەم - دەستەکانم کەشەنگ دەبن. ئینجا دەست دەکەم بە تایپکردنی ئەوەی بەدەست نووسیوومە، کە لەگەڵیا دەڕۆم گۆڕانکاری تیادا دەکەم ؛ ئەمە ڕەنگە قۆناغی یەکەمی سەرلەنوێ نووسینەوە بێت. بەڵام هەمیشە چەند دێڕێك بە تایپنەکراوی جێدەهێڵم، بەوەش ڕۆژی دواتر دەتووانم بە تایپکردنی بەشی کۆتایی ئەوەی ڕۆژی پێشتر نووسیوومە دەستپێبکەمەوە. وەگەڕخستنی ئامیری نووسین - تایپڕایتەر- دینامیکێکی دیاریکراو دەخولقێنێت - وەك ئەو جووڵەو بزاوتەیە کە پێش



دەستپێکردنی وەرزش، بۆ گەرمکردنی لەش دەکرێت.

- هەمەنگوای هەمان ئەو تەکنیکەی بەکارهێناوە کە هەمیشە ڕستەیەکی بە نیوەیی جێدەهێشت بۆ ئەوەی کە ڕۆژی دواتر دەستی بە نووسین کردەوە بتوانێت کلافەی نووسینەکە بە ئاسانی بگرێتەوە دەست....

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: بەڵێ، ئەو پێی وابوو قەت نابێت هەموو ئەو شتە بنووسێت کە لە مێشکیدایە، بۆ ئەوەی بتوانێت بۆ ڕۆژی دواتر بە ئاسانی دەست پێبکاتەوە. سەختترین بەش بەلای منەوە دەستپێکردنە. لە سەرلەبەیانیدا، دروستکردنی پەیوەندی سەرلەنوێ، خەم و قەلەقییەکەی.... بەڵام ئەگەر شتێکی میکانیکیت هەبێت بیکەیت، کارەکە خۆی دەستی پێکردووە. ماشینەکە دەست بەکار دەکات. بەهەرحاڵ، من بەرنامەیەکی کارکردنی وردم هەیە. هەموو سپێدەیەك تا دووی دوای نیوەڕۆ لە ئۆفیسەکەمدا دەمێنمەوە. ئەو کاتژمێرانەی ڕۆژ بۆ من پیرۆزن. ئەوە مانای ئەوە نییە کە من بەردەوام دەنووسم؛ هەندێکجار من پێداچوونەوە دەکەم، یان تێبینی دەنووسم. بەڵام سیستەماتیکیانە لەناو کارەکەمدا دەمێنمەوە. بێگومان، ڕۆژانی باش و ڕۆژانی خراپیش هەن. بەڵام من هەموو ڕۆژێك کاردەکەم تەنانەت ئەگەر هیچ ئایدیای تازەشم نەبێت، دەتوانم کاتەکە بە ڕاستکردنەوە، پێداچوونەوە و نووسینی تێبینی و هتد... بەسەر بەرم، هەندێکجار بڕیاردەدەم ، تەنیا بۆ گۆڕینی خاڵبەندیەکە، پارچەیەکی تەواوکراو سەرلەنوێ بنووسمەوە.

دووشەممە بۆ شەممە، من کار لە ڕۆماننووسیندا دەکەم، و سبەینانی یەکشەممە تەرخاندەکەم بۆ کاری ڕۆژنامەگەری – بابەت و وتارەکان. هەوڵدەدەم ئەو کارانە لە هەمان کاتی تەرخانکراوی یەکشەممەدا بکەم بۆ ئەوەی گرفت بۆ کاری داهێنەرانەی سەرتاپای هەفتەکە دروست نەکات. هەندێکجار لەکاتی نووسینی تێبینیدا گوێ لە مۆسیقای

کلاسیك دەگرم، بەڵام نابێت گۆرانی لەگەڵدا بێت. ئەوە شتێکە دەستم پێکردووە لەو دەمەی لە خانوویەکی زۆر پڕ ژاوەژاودا دەژیام. . سبەینان، بەتەنیا کاردەکەم، کەس نایەتە ئۆفیسەکەم. تەنانەت تەلەفۆنیش وەڵام نادەمەوە. ئەگەر وەڵام بدەمەوە، ژیانم دەبێتە دۆزەخ. تۆ ناتوانیت بیهێنیتە بەرچاوت چەند تەلەفۆنم بۆ دێت و چەند میوانم دێت. هەموو خەڵك ئەمماڵە دەزانێت. بە ناخۆشحاڵییەوە ناونیشانەکەم کەوتۆتە بەردەمی خەڵکی.

ـ تۆ قەت دەستبەرداری ئەو ڕۆتینە توونده نابیت؟
ماریۆ ڤارگاس یۆسا: پێناچێت بتوانم، بەو شێوەیە نەبێت، نازانم چۆن کار بکەم. ئەگەر چاوەڕوانی ساتەکانی ئیلهام بکەم، قەت کتێبێکم بۆ تەواو ناکرێت. ئیلهام بۆ من، لە ڕێگەی کۆششی بەردەوامەوە دێت.
ئەم ڕۆتینە وام لێدەکات کار بکەم، ئینجا بە کەیفسازییەکی گەورە بێت یان بەبێ کەیفی، ئەوە بە ڕۆژ کەوتووە.



ـ ڤیکتۆر هۆگۆ، لەپاڵ نووسەرانی دیکەدا، باوەڕی بە هێزی جادوویی ئیلهام هەبوو. گابریل گارسیا مارکیز وتبووی دوای ساڵانێك ملبەملە لەگەڵ ڕۆمانی ' سەد ساڵ تەنیایی'، لە سەفەرێکیدا بە سەیارە بۆ ئەکاپولکۆ، ڕۆمانەکە لەناو سەریدا خۆی نووسیوە. تۆ هەر ئێستا وتت ئیلهام بۆ تۆ بەرهەمی دیسپلینە، بەڵام تۆ قەت تووشی 'ڕۆشنبوونەوە یاخود جیلوەی ناوەکی' نەبوویت ؟
ماریۆ ڤارگسا یۆسا: قەت لەمن ڕووینەداوە. پرۆسێسێکی زۆر لەوە هێواشترە. لەسەرەتادا شتێك هەیە زۆر تەمومژاوی، بزێو، جێگومان. شتێك، من لە ناو لێڵی و تەموومژەکەدا بەدیدەکەم و خولیام، کونجکۆڵیم و جۆشوخرۆشم دەجوڵێنێت، ئینجا پاشتر خۆی وەردەگێڕێت بۆ کار، پارچەی نووسراوی تێبینی و کورتەی گرێچنێك. ئینجا کاتێك نەخشەکەم دەست دەکەوێت و دەستدەکەم بە دانانی شتەکان بە ڕیز، شتێکی زۆر پەرت، زۆر لێڵ هێشتا

پێدادەگرێت. ڕۆشنبوونەوەی ناوەکی تەنێ لەکاتی کاردا ڕوودەدات. کاری سەختە دەتوانێت لەکاتی دیاریکراودا ئەو – مەبەستی ڕۆشنبوونەوەی ناوەکییە، و.ك- ئازاد بکات ..... حەزەرێکی نازك، ئەو جۆشوخرۆشەیە کە دەتوانێت شۆك، چارەسەر و ڕووناکی بێنێت. کاتێك دەگەمە دڵی ئەو چیرۆکەی ماوەیەکە خەریکیم، ئینجا، بەڵێ، شتێك ڕوودەدات. چیرۆکەکە بەرەو ئەوە دەچێت بمەیێت و پەیوەندی بە منەوە نەمێنێت. بە پێچەوانەوە، زۆر زیندوو دەبێت، زۆر گرنگ دەبێت کە هەموو شتێك کە ئەزموونی دەکەم بوونی تەنیا پەیوەندیدار دەبێت بەوەی دەینووسم. هەر شتێك کە دەیبیستم، دەیبینم و دەیخوێنمەوە بەم ڕێگا یان بەوی دی، وادەردەکەوێت یارمەتی کارەکەم دەدات. من دەبم بە جۆرێك لە مرۆڤخۆری واقیع. بەڵام بۆ گەیشتن بەم قۆناغە، دەبێت بەناو پرۆسەی پاکژبوونەوەی کاردا برۆم. من جۆرێك لە جووتژیانی بەردەوام دەژیم. ئەز هەزاران شتی جیاواز دەکەم بەڵام هەمیشە مێشکم لای کارەکەمە. ڕوونوئاشکرایە، هەندێکجار دەبێتە خووپێوەگرتن، دەمارگریی. لەو دەمانەدا، بینینی فیلمێك هێورم دەکاتەوە. لە کۆتایی ڕۆژێکی کاری چڕوپڕ، کاتێك خۆم لە بارودۆخێکی شڵەژانی ناوەکی گەورەدا دەبینمەوە، فیلمێك یارمەتییەکی گەورەم دەدات




- پابلۆ نیرۆدا، ئەو 'یادەوەرگەر'ە، تا ئەو شوێنە ڕۆیشت نیگاری کارەکتەرە ئەدەبییەکانی خۆی- وێنەی سیمایان، قژیان و جلەکانیان- بکێشێت. تۆ قەت وا دەکەیت؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: نەخێر، بەڵام لە هەندێك دۆخی تایبەتیدا، پەڕاوگەلی بایۆگرافی دروست دەکەم. ئەوە دەکەوێتە سەر ئەو شێوازەی هەست بە کاراکتەرەکە دەکەم. هەندێکجاریش کاراکتەرەکان دێنە بەر دیدەم، هەروەها من بەو ڕێگەیەی گوزارشتی پێ لە خۆیان دەکەن یاخود لە پەیوەند بەو فاکتانەی دەوری داون، دەیانناسمەوە. بەڵام

ڕوودەدات کە کاراکتەرێك بە خەسڵەتگەلی فیزیکی پێناسکراوە، کە منیش دەبێت لەسەر پەڕە بیاننووسم. وەلێ سەرەڕای هەموو ئەو تێبینییانەی بۆ ڕۆمانێك لەبەرچاویان دەگریت، پێم وایە لە کۆتاییدا ئەوەی دێتە ئەژمار هەر ئەو شتانەیە کە یادەوەری هەڵیاندەبژێرێت. ئەوەی دەمێنێتەوە گرنگترینەکەیانە. هەر لەبەر هێندێیە من هەرگیز کامێرام لەگەڵ خۆم نەبردووە بۆ سەفەر و توێژینەوەکانم.

ـ کەواتە، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، کاراکتەرەکانت پەیوەندیان پێکەوە نییە؟ ئایا هەر یەکەیان مێژووی تایبەتیی خۆیان هەیە؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: لە بەراییدا، هەموو شتێك زۆر ساردە، زۆر دەستکرد ـ سناعی- و مردووە! کەم کەم هەمووی دەست دەکات بە زیندووبوون، بەوەی هەر کاراکتەرێك بەرەو پەیوەستی و پەیوەندی دەچێت. ئەوەیە کە زۆر نایاب و کەمەندکێشە: کاتێك تۆ دەستدەکەیت بە کەشفکردنی هێڵەکانی دەسەڵاتێك کە پێشتر بە سروشتی لە چیرۆکەکەدا هەیە. بەڵام پێش گەیشتن بەو خاڵە، هیچ شتێك نییە جگە لە کارکردن، کارکردن، و کارکردنی زیاتر. لە ژیانی ڕۆژانەدا، خەڵکێکی دیاریکراو هەن، ڕووداوگەلی دیاریکراو هەن، وا دەردەکەون بۆشاییەك پڕدەکەنەوە یان پێداویستییەك تێر دەکەن. کتوپڕ تۆ هۆشیار دەبیت دەربارەی ئەوەی تۆ پێویستە بۆ ئەو بەشەی کاری تێدا دەکەیت، چی بزانیت. نوێنەرایەتی قەت ڕاست نابێت بۆ کەسی ڕاستەقینە، دەبێتە شتێکی شێواو، هەڵەوگێڕ. بەڵام ئەو دەرگیربوونە تەنێ کاتێك ڕوودەدات ئەو دەمەی چیرۆکەکە گەیشتۆتە قۆناغێکی پێشکەوتوو، ئەو دەمەی هەموو شتێك وادەردەکەوێت زیاتر ببوژێتەوە. هەندێکجار، جۆرێکە لە پێزانین: ئۆە، ئەوە ئەو دەموچاوەیە کە من بۆی دەگەڕام، ئەو تۆنەیە، ئەو شێوازی قسەکردنەیە.... لەلایەکی دیکەوە، دەکرێت کۆنترۆڵی کاراکتەرەکانت لەدەست بدەیت، کە ئەوە شتێکە بەبەردەوامی لە من ڕوودەدات، چونکە کاراکتەرەکانی من هەرگیز



لە حیساباتی عەقڵانی ڕووتەوە لەدایك نابن. ئەوان گوزارشتن لە هێزگەلی غەریزی لە کارکردن. لەبەر هێندێیە هەندێکیان لەپڕ شوێنگەیەکی گرنگ دەگرن و وادەردەکەون کە بۆ خۆیان گەشە دەکەن. ئەوانی دی دەچنە پاشەوە، هەرچەندە لە سەرەتاشەوە مەبەستیان نەبووبێت. ئەوە سەرنجکێشترین بەشی کارەکەیە، کاتێك بۆت دەردەکەوێت کاراکتەرگەلی دیاریکراو داوات لێدەکەن گرنگی زیاتریان پێبدەیت، کاتێك دەزانیت چیرۆکەکە بەپێی ڕێساکانی خۆی بەڕێوە دەچێت کە تۆ ناتوانیت پێشێلیان بکەیت. ئیتر ڕووندەبێتەوە کە نووسەر ناتوانێت کاراکتەرەکان بنەخشێنێت وەك ئەوەی دەیەوێت، چون ئەوان ئۆتۆنۆمی خۆیان هەیە. ئەوە پڕخرۆشترین ساتەوەختی نووسینە، کاتێك کەشفی ژیانێك دەکەیت کە خۆت خولقاندووتە، ژیانێك کە دەبێت ڕێزی بگریت.



- بەشی زۆری کارەکانت لە دەرەوەی پیرۆ نووسراون، لە شوێنێك کە دەکرێت پێی بگووترێت مەنفای ئارەزوومەندانە. تۆ جارێکیان وتووتە ئەوەی کە ڤیکتۆر هۆگۆ لە دەرەوەی وڵاتی خۆی نووسیوویەتی، بەشداری کردووە لەوەی ڕۆمانێکی وەك بێنەوایان بەو مەزنییە بنووسرێت. دووری کەسێك لە 'بەشەوارەکەوتنی واقیع' خۆی بەشێوەیەك خاڵێکە بە قازانجی سەرلەنوێ بنیادنانەوەی ئەو واقیعە. تۆ پێت وایە واقیع سەرچاوەیەك بێت بۆ بەشەوارەکەوتن؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: بەڵێ، بە مانایەك من هەرگیز نەمتوانیوە دەربارەی ئەو شتە بنووسم کە نزیکە لێمەوە. نزیکیی ڕێگەم لێدەگرێت بە ئازادی بنووسم. زۆر گرنگە بتوانیت بە ئازادی تەواوەوە کاربکەیت بۆ ئەوەی دەرفەت بەخۆت بدەیت واقیع بگۆڕیت، خەڵك بگۆڕیت، وایان لێبکەیت بەشێوەیەکی جیاواز کردار بنوێنن، یاخود توخمی کەسی تێکەڵی گێڕانەوە بکەیت، هەندێك شتی تەواو ڕەمەکی و نالۆجیکی. ئەوە تەواو پێویستە. ئیتر

داهێنان ئەوەیە. ئەگەر واقیع لەبەرچاوت بێت، وای دەبینم کە جووڵەت سنووردار دەکات. هەمیشە پێویستم بە مەسافەیەکی دیاریکراو، کاتێکی مەعقوول و مانەوە هەیە لە کات و شوێندا. بەو مانایە، مەنفا زۆر سوودی هەبووە. بەهۆی مەنفاوە من دیسپلینم دۆزیەوە. ئەوەم دۆزیەوە کە نووسین کارکردنە، وە بەشێکی زۆریشی بەرپرسیارێتییە. مەوداش زۆر سوودی هەبووە، چون من بڕوام بە گرنگی نۆستالیژیا هەیە بۆ نووسەر. بە گشتی قسە بکەین، لەبەرچاونەبوونی بابەتی لەسەرنووسراو یادەوەری پڕ دەکات لە پیتوبەرەکەت. بۆ نموونە، پیرۆ لە 'ماڵی سەوز'دا بەتەنیا هێڵکارییەك نییە بۆ واقیع، بەڵکو بابەتی نۆستالیژیایە بۆ پیاوێك کە لێی مەحرووممە، وە ئارەزوویەکی ئازاراوی بەرامبەری هەست پێدەکات. لەهەمان کاتدا، پێم وایە دووریی دیدگایەکی پڕسوود دەخولقێنێت. واقیع ڕووندەکاتەوە، واقیعێك کە شتەکان ئاڵۆز دەکات و بەشەوارەمان دەخات. گەلەك سەختە هەلبژێرین یاخود جیاوازی بکەین لە نێوان ئەوەی چی گرنگە و چی پلەدووە. دووریی ئەو جوداکارییە دەکات بە کارێکی کردەنی ـ مومکین- . پلەبەندییەکی پێویست جێدەخات لەنێوان ئەوەی چی بنەڕەتییە و چی تێپەڕ و ڕاگوزەرە.

ـ لە وتارێکدا کە چەند ساڵ بەر لە ئێستا بلاوت کردەوە، نووسیت ئەدەب جۆشوخرۆشە، وە ئەو جۆشوخرۆشە هیچ شتێك جێی ناگرێتەوە و هەموو قوربانیدانێکی دەوێت و

ئەو قوربانیدانەش هیچی بۆ خۆی نییە. " ئەرکی سەرەکی ژیان نییە، بەڵکو نووسینە،" ئەوەش شتێکم بیردێنێتەوە کە شاعیری پورتوگالی، فێرناندۆ پیسوا نووسیویەتی: " گەڕان و عەوداڵبوون پێویستە، ژیان پێویست نییە."

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: دەتووانیت بڵێیت نووسین پێویستە و ژیان پێویست نییە..... ڕەنگە پێویست بێت شتێکت دەربارەی خۆم پێ بڵێم، ئینجا خەڵك باشتر من دەناسن. هەر لە منداڵییەوە ئەدەب بۆ من گەلەك گرنگ بووە. لەگەڵ ئەوەشدا کە من لە ساڵانی قوتابخانەمدا زۆر دەمخوێندەوە و دەمنووسی، قەت وێنای ئەوەم نەکردووە



ڕۆژێك خۆم بە تایبەتی بۆ ئەدەب تەرخان بکەم، چونکە ئەوکات خۆتەرخانکردن بە تایبەت بۆ ئەدەب وەك ژیانێکی زۆر پڕ کەیفوسەفا دەهاتە بەرچاو بۆ کەسێکی ئەمەریکای لاتین، بەتایبەتی بۆ کەسێکی پیرۆیی. من بەشوێن شتی تردا دەگەڕام: پلانم دانا بچم بۆ یاسا، ببم بە پرۆفیسۆر یان ببم بە ڕۆژنامەنووس. ئەوەم قبووڵ کردبوو کە ئەوەی پێویست بوو بۆ من دەگەڕایەوە بۆ پاشخانی من. وەلێ دوای تەواکردنی زانکۆ، کاتێك بە- سکۆلارشیپ – یکەوە {ڕێگەدان و ناردنی قوتابییەك بۆ خوێندنی باڵا و یارمەتیدانی ئەو خوێندنە بە پارەی حکومەتێك یان کەس و لایەنێك و.ك} گەیشتمە ئەوروپا، بۆم دەرکەوت ئەگەر لەسەر ئەو بیرکردنەوەیەم بەردەوامبم، قەت نابم بە نووسەر، کە ئەوە تاکە ڕێگەیەك دەبێت بۆ بە فەرمی بڕیاردان لەوەی ئەدەب نەك تەنیا پیشەی سەرەکیم دەبێت، بەڵکو پیشەم دەبێت. ئەوە ئەوکاتە بوو بڕیارمدا خۆم بەتەواوی بۆ ئەدەب تەرخان بکەم. لەو کاتەوە نەمتووانی بە ئەدەب بژیم، بڕیارمدا بۆ کاری دی بگەڕێم کە کاتم بۆ بمێنێتەوە بۆ نووسین و قەت ئەو کارە نەبێتە خەمی سەرەکیم. بە مانایەکی تر، بەپێی کارەکەم وەك نووسەر، من ئەو کارانە هەڵدەبژێرم. پێم وایە ئەو بڕیارە بوو بە خاڵی وەرچەرخان لە ژیانمدا، چون لەوکاتەوە دەسەڵاتی ئەوەم هەبوو بنووسم. ئەوە گۆڕانێکی سایکۆلۆجی بوو. لەبەر ئەوەیە ئەدەب بۆ من وەك جۆشوخرۆشێکە نەك پیشەیەك. بێگومان، پیشەیەکە بۆ من، چونکە من ژیانم لەسەر ئەدەبە. بەڵام ئەگەر ژیانیشم دەرنەهێنێت، هێشتا هەر لەسەر نووسین بەردەوام دەبم. ئەدەب زۆر لەوە زیاترە شێوازێکی ژیان[ لایف ستایڵ] بێت. پێم وایە ئەو بژارەیەی نووسەر هەڵیدەبژێرێت بەوەی بەتەواوەتی خۆی بداتە دەست کارەکەی، دانانی هەمو شتێك لە خزمەتی ئەدەبدا لەبری بایەخدان بە غەمی دی، زۆر گرنگە. خەڵکانێك هەن وا بیر لە ئەدەب دەکەنەوە وەك ئەوەی جۆرێك لە چالاکی دیکۆریی یان چالاکییەك بێت بۆ هاوسەنگی وەرگرتن لە ژیانێکدا کە تەرخانکرابێت بۆ شتی دی یاخود ڕێگایەك بێت بۆ دەستخستنی دەسەڵات و جێومەقام.



لەو حاڵەتانەدا، بەستنێک ڕوودەدات، ئەدەب تۆڵەی خۆی دەکاتەوە، ڕێت نادات بە ئازادی، بە چاونەترسی و بە ڕەسەنی بنووسیت. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە لە حاڵەتی مندا، کاتێک کە ئەو بڕیارەم دا، وام بیرکردەوە کە ژیانێکی سەخت هەڵدەبژێرم، چون هەرگیز وێنای ئەوەم نەکرد ئەدەب بتوانێت بژێویشم دابین بکات، با باسی ژیانێکی باش هەر نەکەین. وەک جۆرێک لە پەرجوو دێتە بەرچاو. هێشتا ناتوانم بەسەریا تێپەڕم. هیچ پێویست نەبوو خۆم لە هیچ شتێکی گرنگ مەحرووم بکەم بۆ ئەوەی بنووسم. لە یادمە زۆر زۆر هەستم بە نائومێدی و دڵتەنگی دەکرد کاتێک کە نەمدەتوانی بنووسم، ئەوە پێش ئەوەی پیرۆ بەجێبهێڵم و بچم بۆ ئەورووپا. هێشتا گەلەک گەنج بووم کە ژنم هێنا و دەبووایە هەر کارێکم دەستبکەوتایە، کردبام. جاروابوو حەوت ئیشم دەکرد لە یەک ماوەی زەمەنیدا! دیارە، بێگومان لە ڕووی پراکتیکییەوە مومکین نەبوو بنووسم. لە یەکشەمماندا نووسیم، لە پشووەکاندا، وەلێ زۆربەی کاتم لەو کارە بێزارکەرانەدا سەرف کرد کە دوورونزیک پەیوەندییان بە ئەدەبەوە نەبوو، و بەوە زۆر دڵتەنگ بووم. ئێستا، کاتێک سپێدان خەبەرم دەبێتەوە، سەرحاڵم بەو بیرەی کە دەتوانم ژیانم بۆ شتێک تەرخان بکەم کە چێژێکی گەورەم دەداتێ، لەوەش واوەتر بژێوی ژیانیشمی لەسەرە، و وە باشیش دەژیم.

- ئەدەب تۆی کرد بە پیاوێکی ساماندار؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا:
نەخێر، من پیاوێکی زەنگین نیم. تۆ ئەگەر بەراوردی داهاتی نووسەرێک بکەیت بە داهاتی سەرۆکی کۆمپانیایەک، یاخود بەراوردی بکەیت بە داهاتی پیاوێک کە ناوێکی بۆ خۆی پەیدا کردووە لە یەکێک لە پیشەکاندا، یاخود لە پیرۆ، بەراوردی بکە بە داهاتی گابازێک یان وەرزشوانێک، بۆت دەردەکەوێت ئەدەب پیشەیەکە بە مووچەیەکی کەمەوە.

- تۆ جارێکیان هێمنگوایت هێنابۆوە یاد کە دوای ئەوەی کتێبێکی تەواو کردووە هەستی کردووە خاڵی، خەمبار و لەهەمان کاتیشدا بەختیارە. تۆ هەست بەچی دەکەیت لەو بارودۆخانەدا؟



ماریۆ ڤارگاس یۆسا: کتومت هەمان شتە، کاتێك کتێبێك تەواو دەکەم، هەست بە بەتاڵی دەکەم، هەست بە خەمۆکی دەکەم، چونکە ڕۆمانەکە بۆتە بەشێك لە من. لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژی دواتر، خۆم وا دەبینم کە لێی بێبەشم – وەك چۆن کەسێکی ئەلکهولی واز لە خواردنەوە دێنێت. ئەوە شتێکی سادە نیە وەك کەمالیات؛ وەك ئەوە وایە ژیان لەپڕ لێم داماڵرابێت. تاکە هەتوان ئەوەیە یەکسەر خۆم فڕێدەمە ناو کارێکی تر، کە هیچ گران نییە چون هەزاران پرۆژەم هەیە بچمە ناویان. بەڵام من هەمیشە دەبێت یەکسەر بگەڕێمەوە بۆ ناو کار، بەبێ هیچ جۆرە لادانێك، بەوەش ڕێگە لە هەر بۆشاییەك دەگرم خۆی بخزێنێتە نێوان کتێبی پێشووم و ئەو کتێبەی کە دواتر دێت.



ـ ئاماژەمان بەو نووسەرانەدا کە تۆ سەرسامیت بە کارەکانیان. ئێستا با قسە دەربارەی کارەکانی خۆت بکەین. تۆ چەند جارێك وتووتە "جەنگی کۆتایی جیهان" باشترین کتێبی تۆیە. تۆ ئێستاش هەر وا بیر دەکەیتەوە؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: ئەوە ئەو کتێبەیە زۆرترین کارم تیا کردووە، کارێکە هەموو خۆمم پێبەخشیوە. چوار ساڵی لێبردم بۆ نووسینی. دەبوایە توێژینەوەی زۆری بۆ بکەم، شتگەلی فرەی بۆ بخوێنمەوە، و ڕووبەڕووی سەختیی زۆر ببمەوە چونکە یەکەمجار بوو دەربارەی وڵاتێکی جیاواز لە وڵاتی خۆم بنووسم، دەربارەی سەردەمێك کە سەردەمی من نەبوو، وە ئیشکردن لەگەڵ کاراکتەرگەلێك کە بە زمانێك قسەیان دەکرد کە زمانی کتێبەکە نەبوو. وەلێ هیچ چیرۆکێك هێندەی ئەو چیرۆکە نەیخستمە جۆشوخرۆش. هەموو شتێك دەربارەی ئەو کتێبە گوشادی کردم، لەو شتانەوەی خوێندمەوە تا سەفەر بەناو خۆرهەڵاتی باکووردا. لەبەر ئەوەیە هەست بە سۆزێکی ناوازە دەکەم بۆ ئەو کتێبە. هەروەها، بابەتەکە ڕێگەیدام جۆرێك لە ڕۆمان بنووسم کە هەمیشە ویستوومە بینووسم، ڕۆمانێکی سەرکێشیی، لە جێگایەکدا کە سەرکێشیی پێویستە – سەرکێشییەکی

ئەندێشەیی ڕووت نا، بەڵکو سەرکێشییەك کە بە توندی بەستراوە بە گرفتئامێزییە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانەوە. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوە بێت کە من ' جەنگی کۆتایی جیهان' بە گرنگترین کتێبی خۆم دەزانم. بێگومان. ئەو جۆرە حوکمدانانە هەمیشە زۆر خودین. نووسەرێك توانای ئەوەی نییە بابەتییانەی تەواو سەیری کتێبەکانی خۆی بکات بۆ ئەوەی ئەو جۆرە پلەبەندییانە جێگیر بکات. ڕۆمانەکە بوو بە تەحەدایەکی ترسناك کە ویستم بەسەریا زاڵبم، لە سەرەتادا، ئەز گەلەك قەلەق بووم. ئەو ڕێژە زۆرە لە کەرەسەی توێژینەوە تووشی سەرەسوڕێی کردم. ڕەشنووسی یەکەم زۆر گەورە بوو، بە دڵنیاییەوە دووهێندەی قەبارەی ئێستای ڕۆمانەکە بوو. پرسیارم لەخۆم کرد چۆن دەتوانم هەماهەنگی لەنێوان ئەو هەموو دیمەنگەلەدا، لەنێوان هەزاران وردە چیرۆکدا دروست بکەم. بۆ ماوەی دوو ساڵ، ئەز تژی بووم لە قەلەقیی. ئینجا، سەفەرێکم بەناو خۆرهەڵاتی باکووردا کرد، بەناو هەموو سیراتۆدا، و ئەوە خاڵی وەرچەرخان بوو. من پێشتر هێڵکارییەکەم کێشابوو. من ویستبووم لە سەرەتادا و لەسەر بنەمای کەرەسەی توێژینەوەکەم ئەندێشەی چیرۆکەکە بکەم، ئینجا سەفەرەکە بکەم. سەفەرەکە جەختی کردەوە سەر کۆمەڵێك شت و سەرنجی تازەی خستە سەر سەرنجەکانم. خەڵکانێکی زۆریش یارمەتییاندام. لە بنەڕەتدا، بابەتەکە بۆ نووسینی کتێبێك نەبوو بەڵکو بۆ فیلمێك بوو کە دەرهێنەرەکەی 'ڕوی گوێرا' بوو. ئەوکاتە، پاراماونت لە پاریس لەلایەن کەسێکی ناسیاومەوە بەڕێوە دەبرا کە ڕۆژێك تەلەفۆنی بۆ کردم و پرسیاری لێکردم کە ئایا دەمەوێت فیلمنامەیەك بۆ فیلمێك بنووسم کە بۆ گوێرا بەرهەمی دەهێنن. من فیلمێکی ئەوم بینیبوو " جەنگاوەرانی پڕسۆز"، کە زۆرم حەز پێی بوو؛ ئیتر ڕۆیشتم بۆ پاریس و بینیم. بۆی ڕوونکردمەوە گەرەکییەتی چی بکات. پێیوتم ئەوەی لە خەیاڵیایەتی چیرۆکێکە کە بەشێوەیەك لە شێوەکان پەیوەندی بە جەنگەوە هەیە لە کانودۆس . نەمانتوانی فیلمێك دەربارەی کانودۆس دروست بکەین، بابەتەکە زۆر فراوان بوو، بەڵام لەباتی ئەوە دەربارەی شتێك بوو کە پەیوەندی بەوەوە هەبوو.





من هیچم نەدەزانی دەربارەی جەنگ لە کانودۆس، تەنانەت هەر نەشم بیستبوو. ئەوە بوو دەستم کرد بە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوە دەربارەی، و وە یەکەمین شتێك کە بە پورتوگالی خوێندمەوە 'سیراتۆ'ی "ئیوکلیدیس دا کونها' بوو. ئەوە یەکێك لە هێدمە گەورەکانی ژیانم بوو وەك خوێنەر، هەر بە هەمان شێوەی خوێندنەوەی ' سێ سوارچاکەکە' لە کاتی منداڵیمدا، یاخود خوێندنەوەی 'جەنگ و ئاشتی'، 'مادام بۆڤاری' و 'مۆبی دیك' لە کاتی گەورەییمدا. بەڕاستی کتێبێکی ڕاستەقینە بوو، ئەزموونێکی بنەڕەتی بوو. من بە تەواوی پێی سەرسام بووم؛ ئەوە یەکێك لە گەورەترینی ئەو کارانە بوو کە ئەمریکای لاتین بەرهەمی هێنابوو. کتێبێکی گرنگ بوو بەزۆر هۆ بەڵام لەپێش هەموو شتێکدا ڕێنمایەك بوو بۆ "ئەمریکای لاتینیزم" – تۆ بۆ یەکەمجار کەشفی ئەوە دەکەیت کە ئەمریکای لاتین چی نییە. ئەو کیشوەرە بڕێك هاوردە نییە. ئەوروپا نییە، نە ئەفریقایە و نە 'ئەمریکای پێش ئیسپانیکە'، یاخود کۆمەڵگا خۆولاتییەکان – بەڵام لە هەمان کاتیشدا، تێکەڵەیەکە لە هەموو ئەو توخمانەش کە لە دۆخێکی سەخت و هەندێکجار بە ڕێگایەکی توندوتیژ هاوژیانی دەکەن. هەموو ئەوانە جیهانێکیان خولقاندووە کە چەند کارێکی کەم نەبێت هیچیان نەیانتوانیوە وەك سیراتۆ ڕووناکبیریی و ناوازەیی ئەدەبی بگرنە خۆ. بە مانایەکی دی، ئەو پیاوەی کە من بەڕاستی خۆم بە قەرزاری دەزانم بۆ بوونی " جەنگی کۆتایی جیهان" ، 'ئیوکلیدس دا کونها' یە.

پێم وایە هەر شتێك تا ئەوکاتە دەربارەی جەنگ لە کانودۆس بڵاوکرابۆوە خوێندمەوە. یەکەمجار، فیلمنامەیەکم نووسی بۆ ئەو فیلمەی بەهۆی گرفتگەلی ڕەگداکوتاو لە پیشەسازی فیلمەکەدا هەرگیز بەرهەمنەهێنرا. پرۆژەکە گەیشتە قۆناغێکی باڵا، بەرهەمهێنان هەر پێشتر دەستی پێکردبوو، بەڵام ڕۆژێك پاراماونت بڕیاریدا کە فیلمەکە نەکرێت، نەشکرا. ئەوە نائومێدی بوو بۆ ڕوی گوێرا، بەڵام من توانام هەبوو کار لە بابەتێکدا بکەم کە ماوەیەکی زۆر کەمەندکێشی کردبووم بۆ ئەنجامێکی ناچیزە ـ دواجار

فیلمنامەیەك شتێكی وا نەبوو. ئیتر من دووبارە دەستم بە خوێندنەوە و لێكۆڵینەوە كردەوە، و گەیشتمە لوتكەی خوێنگەرمییەك كە كەم كتێب توانیویانە بەو ئەندازەیە ئیلهامبەخش بن بۆم. لە ڕۆژێكدا دە تا دوانزە كاتژمێر كارم دەكرد. هێشتا، لە كاردانەوەی بەرازیل دەترسام دەربارەی. ترسام وەك لووتژەنین لە كاروباری ناوخۆ لێكبدرێتەوە.. بەتایبەت كە هەر پێشتر نووسەرێكی كلاسیكی بەرازیل ئەو بابەتەی باسكردبوو. هەندێك خوێندنەوەی نادڵخواز بۆ كتێبەكە هەبوو، بەڵام بە گشتی، بە سنگوالآیی و خوێنگەرمییەوە وەرگیرا – دیارە لەلایەن خەڵكیشەوە – ئەوەش دڵخۆشی كردم. هەستم كرد بۆ ئەو ڕەنجەی دام، پاداشتم دراوەتەوە.

ـ تۆ چۆن ئەو هەموو بەدحاڵیبوونە یەكبەدواییەكە دەبینیت كە كانودۆسی پێدەناسرێتەوە: لایەنگرانی كۆماریخوازیی وەك مقاشی دەستی بنەماڵەی پاشایی و ئیمپریالیزمی بەریتانی سەیری یاخیبووەكان دەكەن، لە كاتێكدا یاخیبووەكان وا لەخۆیان دەڕوانن كە ئەوان شەڕ دژی شەیتان دەكەن. دەكرێت كەسێك بەوە بڵێت میتافۆڕی جۆرە جیاوازەكانی ئایدیۆلۆجیا؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: ڕەنگە بەهای كانودۆس لێرەدا بێت بۆ كەسێكی ئەمریكای لاتین، چونكە كوێرییەكی دووسەرە بەهۆی دیدێكی فەناتیكانە بۆ واقیع بەرهەمهاتووە، هەر ئەوەشە وامان لێدەكات هاودژییەكانی نێوان واقیع و دیدە تیۆرییەكان نەبینین. تراژیدیای ئەمریكای لاتین ئەوەیە، لەچەندان ساتەوەختی مێژوودا هەر بەهۆی ئەو كوێرییە دوولایەنەوە وڵاتەكانمان كەوتوونەتە جەرگەی دابەشبوون و جەنگی ناوخۆ، سەركوتكاریی زەبەلاح، كۆمەڵكوژی وەك ئەوەی كانودۆس. وێدەچێت یەكێك لەو هۆیانەی وای كرد من سەرسامبم بە كانودۆس ئەوە بێت كە دیاردەكە دەكرێت لە دۆخی زۆ روردا چاودێری بكرێت، لە تاقیگەدا سەیربكرێت. بەڵام بێگومان، ئەوە دیاردەیەكی گشتییە: فەناتیزم و لێكنەبووردن قورسایی لەسەر مێژووی ئێمە داناوە. ئینجا یاخیبوونی مەسیحایی بووبێت، یاخیبوونی سۆشیالیستەكان یان یۆتۆپییەكان بووبێت، یاخود ململانێی نێوان كۆنزەرڤاتیڤ و لیبراڵەكان بووبێت. ئینجا ئەگەر ئینگلیز لەگۆڕێ نەبێت،



ئیمپریالیزمی یانکی لەگۆڕێیە، یان فەرمەسۆنەکان لە گۆڕێن، یان شەیتان. مێژووی ئێمە بە بێتوانایی ئێمە لە قبووڵکردنی جیاوازی بیروڕاکانمان نەخشاوە.

ـ تۆ جارێك نووسیوتە هیچ کام لە کارەکانی ترت، وەك ئەم کتێبەت، خۆیان نەداوەتە دەست فانتازیای ئایدیاڵ و دوورەدەست. مەبەستت لەوە چی بوو؟
ماریۆ ڤارگاس یۆسا: پێم وایە ڕۆمانەکە وەك ژانرێك مەیلی بەلای زیادەڕۆییەوە هەیە. مەیلی بەلای تەشەنەسەندنەوە هەیە؛ گرێچنەکە وەك شێرپەنجە پەرەدەسێنێت. ئەگەر نووسەر ڕەدووی هەموو ڕێنمایەکی ڕۆمانێك بکەوێت، ئیتر ڕۆمانەکە دەبێت بە جەنگەڵ. تمووح بۆ وتنی سەرجەمی چیرۆکەکە بە سروشتی لەناو ژانرەکەدایە. لەگەڵ ئەوەشدا من هەمیشە هەستم بەوە کردووە کە ساتەوەختێك دێت کە تۆ دەبێت چیرۆکەکە ببڕیتەوە بۆ ئەوەی تا ناکۆتا درێژ نەبێتەوە، هەروەسا پێم وایە حیکایەتگێڕانەوە هەوڵێکە بۆ گەیشتن بە ئایدیاڵی ڕۆمانی 'تەواو'. ڕۆمانێك کە بێگومان من تا دوا ئەندازە لەو بارەیەوە لەگەڵیا ڕۆیشتم " جەنگی کۆتایی جیهان" بوو.



ـ لە 'مایتا' و ' جەنگی کۆتایی جیهان' دا، وتووتە، تۆ ویستووتە لە زانینی تەواوەتی ڕاستیدا، درۆ بکەیت. دەتوانیت ئەوە ڕوون بکەیتەوە؟
ماریۆ ڤارگاس یۆسا: بۆ بنیادنان، من دەبێت هەمیشە لە واقیعێکی کۆنکریتییەوە دەست پێبکەم. نازانم ئەوە بۆ هەموو ڕۆماننووسان ڕاستە، بەڵام من هەمیشە پێویستم بە ترامپۆلاین – بنکە ئیسپرینگی- واقیع هەیە. بۆیە من دەگەڕێم و توێژینەوە دەکەم لەو شوێنانەی کرداری لێیە، نەك ئەوەی من بە سادەیی واقیع بەرهەم بهێنمەوە. دەزانم ئەوە مەحاڵە. هەرچەندە من بمەوێت، ئەنجامەکەی ئەو باشە نابێت. بەڵکو شتێك دەبێت تەواو

جیاواز.

ـ لە کۆتایی 'مایتا'دا، گێڕەرەوەکە پێمان دەڵێت کە کاراکتەری سەرەکی، کە خاوەنی بارێکە، کێشەی هەیە لە بیرکەوتنەوەی ئەو ڕووداوانەی کە بۆ گێڕەرەوەکە زۆر گرنگن. بەڕاست ئەوە ڕوویدا؟ ئەو پیاوە بەڕاست بوونی هەبوو؟

ماریۆ ڤارگسا یۆسا: بەڵێ، بوونی هەیە، بەڵام کتومت وەك ئەوە نییە کە کتێبەکە باسی دەکات. گۆڕین و ئیزافەم زۆر تێدا کردووە. بەڵام بەشی زۆری، کاراکتەرەکە ڕەنگدانەوەی کەسێکە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان شەڕڤانێکی ترۆتسکیست بوو و چەندان جار لە زیندان ئاخنرابوو. ئایدیای بەشی کۆتاییم ئەو کاتە بۆ هات کە قسەم لەگەڵدا دەکرد و سەرسام بووم بەوەی ئەو شتانەی ژیانی ئەو کە من زۆر بە بنەڕەتیم دەزانی ـ سەرکێشییەك لەناو سەرکێشییەکانی دیکەدا لە ژیانێکی پڕ هەڵبەزودابەزدا- لای ئەو ببوون بە شتی لاوەکی. ئەوە منی شۆك کرد کاتێك بۆم دەرکەوت لە ماوەی وتووێژەکەماندا من زیاتر دەربارەی مەسەلەکە دەمزانی لەو. هەر پێشتر فاکتگەلی دیاریکراوی لەیاد کردبوو و زۆر شت هەبوو ئەو هەر لە بنەڕەتەوە نەیزانیبوو. وابزانم بەشی کۆتایی زۆر گرنگە چونکە سەرجەمی دیمەنی کتێبەکە دەگۆڕێت.



دەربارەی پیدرۆ چاماچۆ قسەمان بۆ بکە، ئەوەی لە ڕۆمانی " پووره جولیا و فیلمنامەنووس'دا زنجیرە دراما بۆ رادیۆ دەنووسێت و دەست دەکات بە تێکەڵ و پێکەڵکردنی گرێچنەکانی خۆی.

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: پیدرۆ چاماچۆ هەرگیز نەژیاوە. کاتێك لەسەرەتای پەنجاکاندا لە ڕادیۆ دەستم بەکارکرد، پیاوێکم دەناسی زنجیرە درامای بۆ رادیۆی ناوەندی دەنووسی لە لیما. ئەو کاراکتەرێکی ڕاستەقینە بوو کە وەك مەکینەی نووسین کاری دەکرد: بەسانایییەکی بڕوانەکردە، بێشومار سەربوردەگەلی نووسی، زۆر بە کەمی دووبارە ئەو شتەی دەخوێندەوە کە نووسیبووی. منی بێئەندازە سەرسام کرد، ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە ئەوە یەکەم نووسەری پیشەیی بوو کە لە ژیانمدا دەمبینی. بەڵام ئەوەی

حەپەساندمی ئەو جیهانە مەزنە بوو کە وەك بۆنێك لێی هەڵدەستا؛ و بەتەواوی شەیدای کردم کاتێك دەستی کرد بەو شتەی کە پیدرۆ چاماچۆ لە کتێبەکەدا دەیکات. ڕۆژێکیان، ئەو چیرۆکانەی نووسیبووی دەستیان کرد بە یەکتربڕین و تێکەڵبوون و ئێستگەی ڕادیۆکە چەندان نامەی لەلایەن بیسەرانییەوە پێگەیشت و هۆشداریان دابوو کە گرفتگەلی لە بابەت هاتوچوونی کاراکتەرەکانیان لە چیرۆکێکەوە بۆ یەکێکی دی، تێبینی کردووە. ئەوە بوو ئایدیای "پوورە جولیا و فیلمنامەنووس"ی دامێ. بەڵام بە دڵنیاییەوە، کاراکتەرەکە لە ڕۆمانەکەدا بەناو جێگۆڕکێی جیاوازدا دەڕوات؛ ئەو زۆر کەم گوێ دەداتە 'مۆدل'ەکەی ـ ئەو کەسەی ڕۆمانەکەی دەربارە نووسراوە- ، کە قەت دێوانە نابێت، پێم وایە وێستگەی ڕادیۆکەی جێهێشت، پشوویەکی وەرگرت.... کۆتاییەکەی کەمتر دراماتیکییە لە خودی ڕۆمانەکە.



ـ ئەدی جۆرێك لە میتا- زمان لە ڕۆمانەکەدا نییە، لەو ڕووەوەی ڤارگیتاس، کە خۆت مۆدڵەکەیت، ژیانێکی بێمانا دەکات وەك ژیانی کاراکتەرەکانی زنجیرە دراماکانی چاماچۆ؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: ئەوە تاڕادەیەك ڕاستە. کاتێك پوورە جولیام نووسی، پێم وابوو من تەنیا چیرۆکی پیدرۆ چاماچۆ دەگێڕمەوە. من تەواو چووبوومە ناو ڕۆمانەکەوە کاتێك بۆم دەرکەوت وەرچەرخاوم بۆ ناو گەمەی خەیاڵێك کە زۆر بڕواپێنەکردە دەبێت. ئینجا وەك پێشتر وتم، من جۆرێك لە عەشقم هەیە بۆ ڕیالیزم، ئینجا وەك دژڕەوییەك بەرامبەر سەیروسەمەرەیی چیرۆکی پیدرۆ چاماچۆ، بڕیارمدا گرێچنێکی دیکەی واقیعیتر بخولقێنم بۆ ئەوەی ڕۆمانەکە وەرچەرخێنێتەوە بۆ واقیع. ئەزیش لەوکاتەدا لە جۆرێك ژیانی زنجیرە ئۆپێرادا دەژیام- هاوسەرگیریی یەکەمم- . من ئەو چیرۆکە کەسییەی خۆمم زیاتر تێئاخنی و لەگەڵ چیرۆکی دی تێکەڵم کرد بەو ئومێدەی دژبەرییەك لە نێوان جیهانی فەنتازیا و ئەو جیهانەی وەك دۆکیومێنتاری وایە، جێگیر بکەم. لە پرۆسەی هەوڵدان بۆ

وەدەستهێنانی ئەوە، بۆم دەرکەوت ئەوە مەحاڵە بکرێت کاتێك تۆ دەتەوێت ڕۆمان بنووسیت، چون بە پێچەوانەی ئیرادەی نووسەر، ڕایەڵێك لە ناواقیعیبوون هەر خۆی دەخزێنێتە ناوی. چیرۆکە کەسییەکە گەرمتر بوو لەوەی دیکە. زمان خۆی توانای گۆڕین و گواستنەوەی واقیعی هەیە. کەواتە چیرۆکی ڤارگیتاس خۆی هەڵگری توخمی ئەوتۆبایۆگرافییە کە بە قووڵی لە جێگۆڕکێدایە، وەك ئەوەی ئەو جێگۆڕکێیە بەهۆی لێگرتنەوە و تەشەنەسەندن – نیسبەت بە لێگرتنەوەی نەخۆشی .و.ك- بێت

ـ لە چەند وتارێکدا کە لەو ساڵانەی دواییدا نووسیوتە، هەندێك پێداگیریت کردووە کە زۆر ڕەشبینانە دەردەکەون. بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٨٢، نووسیوتە: " ئەدەب لە سیاسەت گرنگترە. نووسەران تەنیا لە کاتێکدا پێویستە تێکەڵی سیاسەت بن بۆ ئەوەی دژایەتی میتۆدە ترسناکەکانی سیاسەت بکەن و بیخەنەوە سەر ڕاستەڕێ." ئایا ئەوە دیدێکی ڕەشبینانە نییە دەربارەی ئەو توانایەی سیاسەت هەیەتی بۆ پێشکەوتن؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: نەخێر. مەبەستم ئەوەبوو ئەدەب زۆرتر دەرگیرە لەگەڵ ئەو شتانەدا کە زۆرتر دەمێننەوە، وەك لە سیاسەت، ئەمەش مانای وایە نووسەر ناتوانێت ئەدەب و سیاسەت لە یەك تای تەرازوودا دابنێت بەبێ ئەوەی شکست نەهێنێت وەك نووسەرێك، وە هەروەها ڕەنگە شکست بهێنێت وەك سیاسەتمەدارێکیش. ئێمە دەبێت لەبیرمان بێت کرداری سیاسی زۆرتر کورتخایەنە لەکاتێکدا ئەدەب بۆ درێژماوەیە. تۆ کتێبێك بۆ ئەمڕۆ نانووسیت؛ بۆ ئەوەی کاریگەری کتێبێك بۆ ئایندە درێژببێتەوە، کات دەبێت ڕۆڵی خۆی بگێڕێت، کە ئەوە بۆ کرداری سیاسی هەرگیز یاخود زۆر کەم ڕاستە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچەندە وا دەڵێم، من قەت لە حوکمدانی خۆم دەربارەی کەشوهەوای سیاسی ناوەستم یاخود لەوەش ناوەستم بەو شتانەی دەینووسم و بەو کارانەی دەیکەم خۆم تێوە بگلێنم. بڕوای من وایە نووسەر ناتوانێت خۆی لە تێوەگلانی سیاسی ببوێرێت، بەتایبەت لە وڵاتانی هاوشێوەی وڵاتی من کە گرفتەکان سەختن





و بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی زۆرجار دیوی زۆر دراماتیکی هەیە. زۆر گرنگە نووسەران بەم ڕێگە یان بەویدی کردار بنوێنن، بە ڕەخنەگرتن، بە ئایدیاکان، بە بەکارهێنانی ئەندێشە بۆ چارەسەری ئەو گرفتانە. پێم وایە زێدەگرنگە نووسەران - چون وەك هەموو هونەرکاران، نووسەرانیش لە کەسانی دیکە زیاتر هەستەوەرن - گرنگی ئازادی پێشان بدەن بۆ کۆمەڵگا و بۆ تاکەکەس. دادپەروەری، ئەوەی کە ئێمە هەموومان هیوای بۆ دەخوازین، زۆر گرنگە قەت لە ئازادی جیانەبێتەوە؛ هەروەها دەبێت ئێمە بەناوی دادپەروەری کۆمەڵایەتی یاخود ئاسایشی نەتەوەیی قەت ڕێگە بە بیرۆکەی قوربانیدان بە ئازادی نەدەین، وەك ئەوەی تۆتالیتاریەکان لەوپەڕی چەپ و کۆنەپەرستەکان لەوپەڕی ڕاست دەیانەوێت. نووسەران ئەوە دەزانن چونکە ئەوان هەموو ڕۆژێك هەست بەڕادەی ئەو ئازادیە دەکەن کە بۆ خولقان پێویستە، بۆ خودی ژیان پێویستە. نووسەران دەبێت بەرگری لە ئازادی خۆیان بکەن وەك بەرگریکردن لە هەر پێویستییەکی تری لەبابەت مووچەیەکی ڕەواو یاخود مافی کارکردن.

- بەڵام من قسەکانی تۆم وەرگرت کە تیایدا دیدێکی ڕەشبینانەت هەیە بەرامبەر ئەوەی کە سیاسەت دەتوانێت بیکات. ئایا نووسەران دەکرێت یان دەتوانن خۆیان تەنیا بە ئۆپۆزیسیۆنبوون سنووردار بکەن؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: پێموایە گرنگە نووسەران بەشداری بکەن، حوکمبدەن و بچنە ناوەوە ـتەدەخول بکەن-، بەڵام هەروەها گرنگە نەهێڵن سیاسەت بواری ئەدەبی – مەملەکەتی داهێنانی نووسەران- داگیر و وێران بکات. ئەگەر ئەوە ڕوویدا، نووسەرەکە دەکوژێت و جگە لە پڕوپەگەندەچییەك هیچی تر بۆخۆی ناهێڵێتەوە. لەبەر ئەوە گرنگە سنوور بۆ چالاکی سیاسی خۆی دابنێت، بەبێ ئەوەی خۆی ببەستێتەوە یان دەستبەرداری ڕاگەیاندنی ڕای خۆی بێت.

- ئەوە چۆن بوو نووسەرێك كە هەمیشە بێمتمانەیی خۆی بەرامبەر سیاسەت پیشانداوە بوو بە كاندیدی سەرۆكایەتی پیرۆ لە ساڵی ١٩٩٠ ؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: هەندێكجار دەكرێت وڵاتێك خۆی لە بارودۆخێكی ناكاو و ئاوارتەدا ببینێتەوە، بۆ نموونە، لە شەڕدا، لەو دۆخەدا هیچ ئەڵتەرناتیڤ نییە. هەلومەرجی پیرۆ لەمڕۆدا كارەساتبارە. ئابووری دادەڕمێت. هەڵاوسانی نرخ گەیشتۆتە ئاستێكی زۆر بەرز. لەماوەی دە مانگی یەكەمی ساڵی ١٩٨٩ دانیشتووان نیوەی توانای كڕینی خۆیان لە دەستدا. توندووتیژی سیاسی ڕووی لە گرژبوونەوە كرد. پارادۆكسەكە- هاودژییەكە- ئەوەبوو لە گەرمەی ئەو قەیرانە زەبەلاحەدا، وا دەردەكەوێت كە ئەگەری ئەوە هەیە گۆڕانی گەورە دروست بكرێت ڕووەو دیموكراسی و ئازادی ئابووری. دەكرێت دووبارە بیر لەو مۆدێلی كۆلێكتیڤیست - كۆمەڵگەرایی- و سۆشیالیستییە بكەینەوە – ئەو مۆدێلەی لە ساڵی ١٩٦٨ وە لە پیرۆ پەیڕەو كراوە- بۆ دەوڵەت. نابێت ئەو دەرفەتە لەدەست بدەین بۆ گێڕانەوەی ئەوەی ئەو چەند ساڵانەی دوایی خەباتمان بۆ كردووە: ڕیفۆرمی لیبراڵ و خولقاندنی بازاڕێكی ئابووری. با باسی تازەكردنەوەی ئەو كلتووره سیاسیەی پیرۆش نەكەین كە بەرپرس بوو لەو قەیرانانەی وڵاتی ڕادەماڵی.



هەموو ئەو هۆیانە وایلێكردم ئەو خۆپارێزیانەی هەمبوو وەلای بنێم و بچمە ناو خەباتی سیاسییەوە – دواجار وەهمێكی ساویلكانە بوو.

- وەك نووسەرێك، پێت وایە باشترین كوالیتی تۆ چییە و وەهەروەها گەورەترین خەوشی تۆ چییە؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: باشترین كوالیتی من عەزم و ئیرادە و پێداگیریی منە: ئەز دەكارم بە سەختی كاربكەم و زۆر زیاتر لەوەی كە خۆم پێم وابووە مومكینە. گەورەترین خەوشی من كەمی متمانەیە بە خۆم، كە بە توندی دەمهاڕێت. سێ یان چوار ساڵم گەرەكە بۆ نووسینی ڕۆمانێك- وە بەشێكی زۆری ئەو كاتە بۆ گومانكردن لە

خۆم سەرف دەکەم. ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە من بێهوودە نیم: هۆشیاریم زۆر کارایە. بەڵام دەزانم، من تا ئەو ڕۆژەی دەمرم، هەر دەنووسم. نووسین لە سروشتی مندایە. من پێبەپێی کارەکەم، زیندەگی دەکەم. ئەگەر نەنووسم، بەبێ دوودڵی مێشکی خۆم دەتەقێنم. دەمەوێت کتێبی دی زۆر بنووسم، وە کتێبی باشتر بنووسم. دەمەوێت سەرکێشیگەلی کەمەندکێشتر و نایابترم هەبێت لەوانەی پێشتر هەمبووە. من ڕەتیدەکەمەوە دان بەو ئەگەرەدا بنێم کە ساڵانی پڕ بەرەکەت ئەو ساڵانەمن کە تێپەڕیون، ئەگەر بە بەڵگەش بۆم بسەلمێنرێت هێشتا دانی پیا نانێم.

- تۆ بۆ دەنووسیت؟

ماریۆ ڤارگاس یۆسا: من دەنووسم چونکە بەختیار نیم. دەنووسم چونکە نووسین شەڕێکە دژ بە نابەختیاری.



سەرچاوە

http://www.theparisreview.org/interviews/2280/the_art_of_fiction_no_120_mario_vargas_llosa

ماریۆ بارگاس یۆسا

# ژیانی ڕاستەقینەی ئالیخاندرۆ مایتا

لە فارسییەوە عەتا نەهایی





# تێکشکانی ڕوانگەی فەلسەفی لە تێکستی شیعریدا

## " لێکۆڵینەوە لە قەسیدەی (هەژاریی بەهێز )ی (فریدریك نیتشە)"

بڵند باجەلان

**(دەستی گەرم بخە نێو دەستم ،، دڵێکم پێبدە مەکۆی ئاگر بێت ، )**
**( تەنیا ئەوە تۆی ئەی زەردەشت ، لە تواناتدا هەیە دەوروپشتت تەژی بکەی لە وزە و سەفا، )**
**(دەمەویَ بمرم ، وەک چۆن پێشتر ئەوم بینی کە مرد،)**
**(فریدریک  نیتشە)**

قسەکردن لە بازنەی ئەدەبیاتدا لەسەر شیعری فەیلەسوفێك لە ڕوانگەی ژیان و ئەزمونی فەلسەفی

ئەو فەیلەسوفە خۆیەوە، ئەو هەوڵەیە دەیدەین لەو لێکۆڵینەوەیەماندا ، باسی ئەو ناکۆکییانە دەکەین لەنێوان (دیدی فەلسەفی ) و (دیدی شیعری )دا هەن لە فەزای تێکستێکی شیعریدا ( دەشێ ئەو ناکۆکیانە گەمەیەکی شیعری بن )  ئەمە سەرەڕای شیکردنەوەی شیعرەکە و باسکردنی ڕوانگە شاراوەکانی دەقەکە و ئاشکراکردنی چەند تێڕوانینی خۆمان بۆ هەندێ چەمك و بابەت ، ئایا بۆ نووسەریك کە خاوەنی فەلسەفەی خۆیەتی و فەلسەفەکارێکی ئەدیبە، ڕەوایە ئەوەی دەیگوازێتەوە نێو دەقەکەیەوە دژ بێت لەگەڵ ئەو فەلسەفەیەی بانگەشەی بۆ دەکا ؟ ، لە ڕوانگەی قەسیدەی (هەژاریی بەهێز)ی (نیتشە)وە کە یەکێکە لە شیعرەکانی (زەردەشت) وەڵامی ئەو پرسیارە و چەند پرسیاری تر دەدەینەوە، لە ئێستاوە دەڵێم وەڵامی ئەو پرسیارە ( بەڵێ)یە  وەلێ مەرجێکیش هەیە لەپاڵ ئەو (بەڵێ) یەدا کە بریتییە لە بوونی گەمەیەکی شیعری،خودی قەسیدەکە پەیوەستە بە مانا پەنهانەکانەوە، بۆ شاردنەوەی ماناکان پێویستیمان بە کەرەستەی ئاشکرا هەیە، شاردنەوەی ماناکان لە بەرگی بێماناییدا پێویستی بە تێگەیشتنی تەواو هەیە لە بابەتی مانا و بێمانایی،  ئەوەی ئەو تێگەیشتنەش دەسەلمێنێ  خودی تێکستە نووسراوەکەیە، تێکست هەیە لەدوای خۆی دۆزەخێکمان پێدەبەخشێ کە سووتێنەری بەهەشتە، سووتانی بەهەشت بە ئاگری دۆزەخێکی سووتاو و کردەی تریش کە دەق دەیانخولٌقێنێ،  مایەی ئەوەن بە وردییەکی زیاترەوە مامەڵە لەگەڵ تێکستدا بکەین و دەستی پێوە بگرین ،



مانا هەیە لەبەرئەوەی بێماناییەکی ڕووتە،  وەکو مانایەکی تۆقێنەر دەردەکەوێ، تۆقاندن کردەیەکە مانای بێمانا هێنایە پێشەوە،  خودی تۆقاندنەکەش زادەی بێماناییەکە مانا تەحەکومی پێوە دەکا،(مانا) هەیە هەوڵی بەخشینی خۆی بە بێمانایی دەدا (بەخشینی مانا بە بێمانایی) وەلێ بێگومان لەپشت هەموو مانا و هەموو بێماناییەکیەوە تەنانەت ئەگەر

بەرهەمی ماناش بێت  نووسەرێك هەیە لە ئانی بەرکەوتن بە تێکست ،
(نیتشە) زیاتر وەکو فەیلەسوفێك باسی دەکرێ تا وەکو  ئەدیبێك،  بە پێچەوانەی (گۆتە)ەوە کە وەکو ئەدیبێك باسی دەکرا تا وەکو فەیلەسوفێك، پێموایە (گۆتە) فەیلەسوف نەبوو،  تەنها خاوەنی ئەدەبێکی ئاوێتەکراو بە پنتی فەلسەفی بوو،  ئەمەش بەس نییە بۆ بوون بە فەیلەسوف، لە لێکۆڵینەوەیەکی ترمدا لەسەر چیرۆکی (پەیکەری ست ڕافۆن)ی (کاروان کاکەسوور)  باسی ئەو بابەتەم کردووە: (گۆتە)  فەیلەسوف نەبوو، ئەو لە هیچ زانکۆیەکدا کاری وانەبێژی نەکردووە و قوتابخانەی فیکری سەربەخۆی نەبووە  گەرچی هزری ئەو کاریگەری هەبوو لەسەر فەلسەفە، بەتایبەتی هزری (گۆتە) لە هۆنراوە دراماتیکییەکانی نێو (فاوست)دا کە بە فەلسەفەی ژیان ناودەبردران(**1**)،
 شیعریەتی (نیتشە) بۆ (نیتشە) خۆی دەگەڕێتەوە ، ئەوکاتەی فەیلەسوف بڕیار دەدا شیعر بنووسێ و ئەو بڕیارەش جێبەجێدەکا،  نابێت فەلسەفەکەی خۆی لە یاد بکا،  گواستنەوەی فەلسەفەکە بە ڕووتی بۆ نێو بازنەی شیعرەکە داواکراو نییە  خودی فەلسەفەکە پێویستی بەوە هەیە بەشیعری بکرێ (بەشیعریکردنی فەلسەفە)  پێچەوانەکەشی دروستە (بەفەلسەفیکردنی شیعر)  بۆیە ئێمە لە خوارەوەدا کە باسی ناکۆکییەکە دەکەین  مەبەستمان نییە باسی دیوێکی خراپی شیعری (نیتشە) بکەین   گەرەکمانە باسی خودی ناکۆکییەکە بکەین  ناکۆکییەك  لە هەندێك ئاستدا بوونی پێویستە لە ئانی نووسرانی شیعردا،  دەشێ ئەدیبیش خاوەنی فەلسەفەی خۆی بێت لە فەزا ئەدەبییەکەدا،  ئەوەتا (کافکا ) وەکو نموونەیەك چاویلێدەکرێ، فەلسەفەکاری ئەدیبیشمان هەن،  (سارتەر) و (جان جاك ڕۆسۆ ) وەکو دوو نموونە ، بە کورتی فەلسەفە تایبەت نییە بە فەیلەسوفان و هەموو ئەوانەشی فەلسەفەی خۆیانیان هەیە فەیلەسوف نین،
(نیتشە) مەبەستی بوو شۆڕش بکات لە ئاکار و هونەر و بەهاکانی تردا،  تەنانەت لەو ئاستەدا (خود) دیدی خۆی هەبووە بۆ (ئەویتر)،  ئەگەر ئەو



خودە (نیتشە) بێت و ئەویترەکە (واگنەر) بێت، (نیتشە) لە کتێبی (وەهای گوت زەردەشت)دا دژی (واگنەر) دەوەستێتەوە، ئەو کتێبەی مەرگ مەودای (واگنەر)ی نەدا بیخوێنێتەوە ، ئاهەنگەکانی (واگنەر) لە (بەیروت) (نیتشە)یان تووشی نائومێدی کرد، دواتر ئەو نائومێدییە گەشە دەکا لە شوێنێکی تردا، کەواتە (نیتشە) هەوڵی گۆڕینی دونیای داوە لە فەلسەفەدا و ئەویتریش نەیتوانیوە ساردی بکاتەوە، جا ئەو ئەویترە (واگنەر) بێت یان هەر کەسێکی تر، بەڵام ئایا خودی شیعری (نیتشە) دەکەوێتە کوێی فەلسەفەی (نیتشە)وە کە فەلسەفەیەکە بانگەشەی گۆڕان دەکا ؟ ئەوا لە خوارەوە قەسیدەی ( هەژاریی بەهێز)ی (نیتشە) دەخەینە بەر باس و خواس:



((ئەوا دە ساڵ گوزەریکردووە
وەلێ تاقە دڵۆپە بارانێك تەڕنەکردووم
شنەبایەکی فێنك بەرم نەکەوتووە
شەونمێکی عیشق نەنیشتۆتە سەر دڵم
چونکە لەو شوێنە وشکەدا باران قاتییە ,,,))

(دوورکەوتنەوە) لەو پارچە شیعرەی سەرەوەدا پێچەوانە دەبێتەوە، ئەگەر تا ئێستا خود دوورکەوتبێتەوە لە ئەویتر، ئەمجارەیان ئەویتر دووردەکەوێتەوە لە خود و پەراوێزی دەخا، دڵۆپە باران کە ڕۆڵی ئەویتر دەبینێت، دووردەکەوێتەوە لە خود و کەرەستەی دوورکەوتنەوەکەش بریتییە لە (تەڕنەکردن) تەڕنەکردنی خود و دانەکردن بەسەر سەحرای ڕۆحی (خود)دا و هێشتنەوەی خود لە سەحرادا ، وا دەکەن دوا جار شاعیر بارودۆخەکە (فەزا گشتییەکە) بە فەزایەکی داخراو و بەد ناوزەد بکا : (لێرە باران قاتییە) هەمان شتیش بۆ شنەبای فێنك و شەونمی عیشق، ئەوکاتەی لە شاعیر دووردەکەونەوە، شاعیر نزیك دەکەوێتەوە لە بابەتی بڕیاردان لەسەر ئەو فەزایەی دڵۆپە باران و شنەبای فێنك و شەونمی عیشقی لە خۆ گرتووە، فەزای گشتیش لەو ئانەدا وەکو فەزایەکی داخراو

دەردەکەوێ کە ژیان تیایدا بریتییە لە جۆرێك لە گاڵتەکردن بە مانەوە، خود لە شیعرەکەدا هەوڵی گۆڕین دەدا، هەوڵدەدا لە تراژیدیا دووربکەوێتەوە، وەلێ گەرەکی نییە بەرەو خۆشبەختی ڕووت بڕوا، هەر بە تەنها دەیەوێ دووربکەوێتەوە لەو تراژیدیایەی فەزای گشتی تووشی کردووە و هەوڵی گۆڕینی قەدەر بدا، ئەمەش دژە لەگەڵ دیدی (سۆفۆکلیس) لە (ئۆدیبی پاشا)دا کە پێیوایە گۆڕینی تراژیدیا مەحاڵە و تراژیدیا چارەنووسی بوونە، ئەوەتا (ئۆدیب) هەوڵی گۆڕینی چارەنووسی دەدا و هەمان چارەنووسیش چاوەڕێیەتی نەك چارەنووسێکی تر، لای (نیتشە) بۆچوونێکی میتافیزیکی گەڕاوە بۆ (شۆپنهاوەر) هەیە، ڕاستی بوون یەکسانە بە (ویست) و (هۆش)یش وەکو جەوهەری بیرەکان، ڕووخسار و بەرگی ئەو ڕاستییەی بوونە، (لەدایکبوونی تراژیدیا) بەرهەمی یەکەمی (نیتشە) بوو کە بووە فاکتەری هاوڕێیەتی (نیتشە) و (واگنەر)، ئەوکاتەی (نیتشە) لە تراژیدیا دەدوێ، پشت دەبەستێ بە تێگەیشتنی بۆ واتای بوونی مرۆڤ، بەبێ ئەوەی بوونی خۆی کردبێتە سەنتەر، ئەوەتا لە خوارەوە خود هەوڵی گۆڕینی تراژیدیا دەدا، بەوەی ڕووی خۆی بۆ لای ( هۆش) وەردەگێڕێ :

((ئەی هۆشی من
ئێستا ڕووم بۆ لای تۆ وەردەگێڕم
هەر بۆ ئەوەی گەرەکمە لێتبپارێمەوە
لەو مەوسیمە وشەکەدا
پیشەت وشکی نەبێت .))

دوای ئەوەی (نیتشە) لە قەسیدەکەیدا بەر تراژیدیا دەکەوێ و بێئومێد دەبێت لەو فەزا گشتییەی هەمووان دەخنکێنێ و خۆی بە زیندوویی دەمێنێتەوە ، کوتاڵی خۆی دەکاتە کفن بۆ هەمووان و خۆی گۆڕستانە ، هەموو درەختەکان دەبڕێتەوە و خۆی باخچەیە ، هەموو ئەستێرەکان دەکوژێ و خۆی ئاسمانە ، ئەو فەزا گشتییە کە هەموو شتێکە و هیچیش نییە ، وا لە (نیتشە) دەکا لە شیعرەکەیدا نائومێدبێت و هەوڵی گۆڕینی بارودۆخەکە (تراژیدیایەکە) بدا و



بگەڕێتەوە بۆ  هۆشی خود : ((ئێستا ڕووم بۆ لای تۆ وەردەگێڕم)) ، یانی تا ئێستا شاعیر پشتی لە هۆش کردووە و لە بازنەی جۆرێك لە ناخودئاگایدا ژیاوە ، وەلێ ئەوە بێئومێدییە وا لە شاعیر دەکا بگەڕێتەوە بۆ هۆشی خۆی و پشت لە ناخودئاگاییەك بکا کە بەسترابوویەوە بە فەزای گشتییەوە ، ئینجا لەوێوە شاعیر دەتوانێ جوانتر شتەکان ببینێ و پێناسیان بکا و قسەی خۆی بکا لە ئاستیاندا ، هەڵبەت ئەوکاتەی مرۆڤ ڕوو لە  هۆشی خۆی دەکا ، زیاتر هۆشیارە و ئەو هۆشیارییەش وا دەکا بڕیارەکانی دروستتر بن ، هەر ئەمەش دەبینرێ لە شیعرەکەدا ، شاعیر دوای ئەوەی بێئومێد دەبێت و دەگەڕێتەوە بۆ خۆی (بۆ  هۆش ) ، هاوکات بڕیاری گۆڕانکاریش لەگەڵ خۆی دەهێنێتە پێشەوە ، ئەوەتا داوا لە خۆی (لە هۆش) دەکا چیتر پیشەی وشکی نەبێت ، ئەمەش سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە کە شاعیر لە ئانی خۆبەستنەوە بە ناخودئاگاییەوە ، جۆرێك لە وشکی ڕووی تێکردووە کە پەیوەندی بە نەبارینی باران و هەڵنەکردنی با و نەنیشتنەوەی شەونمی عیشقەوە هەیە ، لێرەوەیە شاعیر پێیوایە نابێت چیتر ئەو خودە بێئاگایە حاڵەتی خۆی نەگۆڕێ و دەبێت بڕیاری گۆڕان بدا ، هەر خود (خودی شاعیر) خۆی ئەو بڕیاری گۆڕانە بەسەر خۆیدا دەسەپێنێ ،ئەوەی لێرەدا هەستی پێدەکرێ ، کەوتنە بەر سێبەری ئازارەکانە ، مرۆڤ لە سێبەری ئازاردا بیر لە ئازار دەکاتەوە و پۆلێنی دەکا بۆ باش و خراپ ، (شۆپنهاوەر) ئازاری بە خراپ دادەنا و (نیتشە)ش بە باش(2) ، دیدی دیونیزوسی (نیتشە) بۆ ژیان سەرچاوەکەی فەلسەفەی (شۆپنهاوەر)ە ، چونکە نۆرینگی یەکەمی ڕۆحی دیونیزوسی و وجودی ژیان لە ئازاردایە ، (شۆپنهاوەر) ئەو ئازارەی بە سەرچاوەی نەهامەتی دادەنا و لای ئەو پێویستی نەبوو بۆ مرۆڤ و مرۆڤ بە بێ ئازار دەتوانێ باشتر بژی ، لای (نیتشە) ئازار مرۆڤ بەهێز دەکا و ژیان جوانتر دەکا و مرۆڤ پێویستی بە ئازارە ، ئەمەش دژە لەگەڵ بۆچونی (شۆپنهاوەر) لە مەسەلەی ئازاردا ،



((من لە تۆ داوادەکەم  هەر خۆت ببیتە
شنەی گیانپەروەر و شەونمی سەرەنجڕاکێش و
بارانی ژیانهێنەری من ،
کاتی خۆی فەرمانم بە هەورەکان دەکرد
لە کوێستانەکانی من دووربکەونەوە
من دەمگوت :
((ئەی سێبەرە تاریکەکان ، دوورکەونەوە ، دەمەوێ زیاتر خۆر لێمبدا! ))
کەچی ئەمڕۆ
بە پێچەوانەوە کەمینیان بۆ دادەنێمەوە
بەڵکو بۆ مودەتێك بێنە لام و
تۆزێك سێبەربن بە دەورمەوە ،))

پاش ئەوەی شاعیر دڵنیادەبێتەوە لەوەی پشتی لە نائاگاییەکەی کردووە و ڕووی لە هۆشی خۆی کردووە، بڕیارەکانی خۆی دەدا و داواکارییەکانی خۆی ئاڕاستەی خۆی دەکا (ئاڕاستەی هۆش) وەکو دەریایەك بیەوێ شەپۆڵەکانی ڕابێنێ لەسەر ئەوەی ئازاری ئەوانیتر نەدەن، چون مەیتەرێك بیەوێ ئەسپەکانی ڕابێنێ زیان بە ئەسپسوارەکان نەگەیەنن ، چون دارستانێك دارەکانی ڕابێنێ سێبەربن بەسەر ئەو ڕێبوارانەی ڕووی تێدەکەن، بەو واتایەی، خود دوای ئەوەی پشت لە ناخودئاگاییەکەی دەکا، دەبێتە (خودێکی چاکەخواز ) ئەگەر بۆ زەمەنێکی کورتیش بێت، دەکرێ ئەو زەمەنەش گۆڕان بە خۆیەوە ببینێ، خود لە خۆی (لە هۆشەکەی) داوا دەکا ببێتە شنەی گیانپەروەر و شەونمی سەرەنجڕاکێش و بارانی ژیانهێنەر، داوای لێناکا ببێتە پڵینگی بریندار و نێچیر ڕاوبکا، داوای لێناکا ببێتە ورچی خەواڵوو و هەموو شتێك بێ نرخ بکا، داوای لێناکا ببێتە زێوانێك و مردووەکان بخوا و بانگەشەی بینینی مردووێك بکا





که ڕقی له چاکه‌یه‌، ئه‌و داوا له خود ده‌کا ئه‌گه‌ر بوو به هه‌ر شتێك ، ڕۆحێکی چاکه‌خواز بێت، بۆ نموونه (نموونه‌یه‌ك له دیدی خۆمانه‌وه) ئه‌گه‌ر قه‌راره ببێته زێوان، ئه‌وا ده‌بێت بانگه‌شه‌ی بینینی مردووێك بکا که چاکه‌ی خۆشده‌وێ، مردووه‌کان نه‌خوا، به‌ڵکو خۆراکی خۆی له‌گه‌ڵیان دابه‌ش بکا، به‌ڵام پرسیاره جه‌وهه‌رییه‌که لێره‌دا ئه‌وه‌یه : شاعیر داوا له هۆشی خۆی ده‌کا چاکه له‌گه‌ڵ کێدا بکا ؟ هه‌ڵبه‌ت چاکه‌کردن له‌گه‌ڵ خود له‌و ئانه‌دا ناکه‌وێته بازنه‌ی ئه‌ویتره‌وه، بۆیه ده‌کرێ له‌و ئانه‌دا خود ئه‌ویتر و ئه‌ویتر خود بێت، شاعیر هه‌ر خۆی وه‌ڵام ده‌داته‌وه :

((من له تۆ داواده‌که‌م هه‌ر خۆت ببیته

شنه‌ی گیانپه‌روه‌ر و شه‌ونمی سه‌ره‌نجڕاکێش و

بارانی ژیانهێنه‌ری من)) ده‌رکه‌وت شاعیر داوا له هۆش ده‌کا به‌ر له هه‌ر که‌سێك چاکه له‌گه‌ڵ (خود)دا بکا ، خودێك وه‌ك له سه‌ره‌وه باسمان کرد چۆن بۆته قوربانی فه‌زایه‌کی گشتی که وای له وه‌سیله‌کان کردووه جانه‌وه‌ری دڕه‌نده بن بۆ شاعیر ، بۆیه وه‌کو ئه‌لته‌رناتیڤێك بۆ ئه‌وه‌ی که‌س نییه چاکه له‌گه‌ڵ (خود)دا بکا، شاعیر داوا له هۆشی خود ده‌کا چاکه له‌گه‌ڵ (خود)دا بکا، شاعیر هه‌ر به ته‌نها فرمان به هۆش ناکا و هه‌ڵبێت، به‌ڵکو بۆشی ده‌سه‌لمێنێ هه‌ر به ڕاست شایسته‌ی ئه‌و یارمه‌تیدانه‌یه و که‌سێکه هه‌مووان پشتیان تێکردووه و ئیتر نابێت خود ( هۆشی خود) پشتی تێبکا، ئه‌گه‌رچی شاعیر له سه‌ره‌تادا خۆی پشتی له هۆشی خۆی کردبوو و بێئومێدی وایلێکرد ڕووی وه‌رگێڕێ، شاعیر بۆ ئه‌و ئاگاییه‌ی خۆی باسی ئێستا و ڕابردوو ده‌کا ، بۆی باسده‌کا چۆن له ڕابردوودا ئه‌وه‌نده بێمنه‌ت بووه، داوای له هه‌وه‌کان کردووه لێی دووربکه‌ونه‌وه، وه‌لێ ئێستا دوای دوورکه‌وتنه‌وه‌ی ئه‌وان، پێویستی به دووباره گه‌ڕانه‌وه‌یان هه‌یه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌وان ناگه‌ڕێته‌وه، ناچاره که‌مینیان بۆ دابنێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی بگه‌ڕێنه‌وه خاڵی سه‌ره‌تا (بۆ لای شاعیر) ، ئه‌مه‌ش ڕووبه‌ڕووی دوو ئاماژه‌مان

دەکاتەوە، ئاماژەی یەکەم ئەوەیە کە خود هەڵەی کردووە بەرامبەر هەورەکان و ئێستا لە پێناوی خود خۆیدا نەك لە پێناوی هەورەکان ، هەوڵی گەڕاندنەوەی هەورەکان دەدا، ئاماژەی دووەم ئەوەیە کە هەورەکان فرە مانان و دەکرێ گوزارشت بن لە شتگەلی تریش ، بۆ نموونە لە کۆمەڵێك مرۆڤی سپی، یان لە کۆمەڵێك کەشتی کە هەڵگری مرۆڤی سپین، بۆیە دەکرێ بڵێن: لەنێو هەورەکانی (نیتشە)دا مرۆڤی سپی هەن، دواتر گەمەکە فراوانتر دەبێت و شاعیر باسی ئەوە دەکا بۆ داوای لە هەورەکان کردووە دووربکەونەوە، وەڵامەکەش ئەوەیە کە پێشتر حەزی لە خۆر بووە و ئێستا بێزارە لەو خۆرەی خۆر نییە و فانۆسێکی بێکەڵکە ، بۆیە دوای ئاشکرابوونی بچمی ڕاستەقینەی خۆر، شاعیر کار بۆ گەڕاندنەوەی ئەوانە دەکا ئەنتی خۆر بوونە و ڕێگربوونە لە بەردەم گەیشتنی خۆری زیاتر بە خود.

هەست بە جۆرێك لە خۆ پەرستی کرا ، شاعیر لە پێناوی خۆی داوا لە هەورەکان دەکا بگەڕێنەوە، ئەو بەرژەوەندییە خودییەی دەبینرێ لە شیعرەکەدا، لە ژیانی (نیتشە) خۆیدا هەستی پێناکرێ، ئەمەش واتای ئەوەیە (نیتشە) ویستوویەتی گەمەیەکی شیعری بخوڵقێنێ ، ئەگینا (نیتشە) تا کۆتایی خۆی نەبەستەوە بە نازییەکانەوە و دیدی خۆی نەشاردەوە لەژێر تەمتومانی ئایدۆلۆژی ئەوانەوە، ئەگەرچی (ئەلیزابێت)ی خوشکی دوای مردنی (نیتشە) خیانەتی لە فیکری (نیتشە) کرد و (هیتلەر)ی بۆ کردنەوەی ئەرشیفەکەی بانگ کرد ، وەلێ دیدی (نیتشە) تا ئێستاش لە زۆر ئاستدا جێگای بایەخە، پێشتریش هەر ئاوابوو، ئەوەتا (هایدگەر) وەکو بیرمەندێك کە لە ڕوانگەی دیدە فەلسەفییەکانیەوە هەوڵیداوە بیر و دیرۆکی بیر بۆ بەڵگە و شیکاری ڕاستەقینەی پرۆژە ئەنتۆلۆجییەکەی خۆی بخاتە گڕ، وانەی نرخداری هەیە لە بارەی فەلسەفەی (نیتشە)وە، ئەگەرچی دواتر نازییەکان دژی (هایدگەر) دەوەستنەوە، فەلەسەفەی (نیتشە) گرینگی خۆی هەیە ئەوکاتەی قسە دێتە سەر (کامۆ) و (سارتەر) و بیرمەندانی بوونخوازی و پاش بوونخوازی و هتد.

((کاتی خۆی دوای حەقیقەتی تاڵ کەوتبووم





وەلێ ئێستا دەستم بۆ ئەڵقەکانی زوڵفی ڕێکەوتە بردووە
وەك دەستخەرۆدانی منداڵێك و بردنی
هەر ئاواش ڕێکەوت هاوڕێم بێت و دەستخەرۆشی بکەم
دەمەوێ ئەمڕۆ میواندار بم
بگرە نسیب لە خۆم تەرە نەکەم و چزووی پیا نەکەم ،))

(حەقیقەتی تاڵ ) ئەو دەربڕینەیە دەکرێ لە ئاستیدا بوەستین، هەر بەڕاست حەقیقەتێك هەیە تاڵ بێت؟ ئێمە پێویستیمان بە حەقیقەت هەیە، کەواتە حەقیقەتی تاڵ واتای چییە؟ بوونی ئەو حەقیقەتە تاڵە سەلمێنراوە و شاعیر ئەوەندە دڵنیایە لە بوونی، دوای کەوتووە لە ڕابردوودا، وەك چۆن دایك دڵنیایە لە پارچەکانی ڕۆحی خۆی کە ڕۆڵەکانیەتی، وەك چۆن کوێرێك دڵنیایە لەوەی ئەگەر گۆچانەکەی لی بسەنن ناتوانێ ڕێ بکا، ئاواش شاعیر لە شیعرەکەدا دڵنیایە لەوەی لە ڕابردوودا حەقیقەتی تاڵ بەشێك بووە لە ژیانی و بێ ئەو لەو کوێرە چووە ناتوانێ ڕێ بکا، وەلێ ئەوکاتەی ئێستا جێگای ڕابردوو دەگرێتەوە، هاوکێشەکان گەڵا دەگرن و گەڵاکانیش قسەیەکی تر دەکەن (هاوکێشەکان دەگۆڕێن )

هەمیشە مرۆڤ دوای گۆڕانە گەورەکان کە ڕوو لە ژیانی دەکەن، ژیانی لەنێوان دوو بەرەی دۆزەخ و بەهەشتدا ، باش و خراپدا، پیرۆز و نەفرەتلێکراودا دابەش دەبێ، ئەوەتا شاعیر بارگەی خۆی لە سەرزەمینە یەکەمییەکەیەوە کە هەر خۆی خوڵقاندویەتی، دەگوازێتەوە بۆ سەرزەمینە دووەمییەکە و فەزا دووەمییەکە کە هەمان فەزا یەکەمییەکەیە و گۆڕاوە، گۆڕانی فەزاکەش بەستراوەتەوە بە گۆڕانی خودەکەوە، ئەوکاتەی خود چیتر دوای حەقیقەتی تاڵ ناکەوێ و دەبێتە هاوڕێی ڕێکەوتە و کار بۆ دەستخەرۆدانی ڕێکەوتە دەکا ، گۆڕانی فەزاکە تۆماتیکی دەبێت

دەربڕینێکی سەرەنجڕاکێشتر ئەمەیە: (وەك دەستخەرۆدانی منداڵێك و بردنی) ئەو پەیوەندییە چییە لەنێوان دەستخەرۆدانی ڕێکەوتە و دەستخەرۆدانی منداڵدا هەیە؟ ڕاستییەکە ئەوەیە منداڵ ئاسانتر دەستخەرۆ دەدرێ بەبەراورد لەگەڵ مرۆڤێکی کامڵ (مرۆڤی کامڵ لە ئاستی تەمەندا، ئەگینا منداڵیش مەخلوقێکی ناکامڵ نییە) بۆیە شاعیر هەوڵدەدا ڕێکەوتە بکاتە منداڵ و سیفەتەکانی نزیك بکاتەوە لە سیفەتی منداڵ (ئەو سیفەتانەی دوا جار دەستخەرۆدان ئاسان دەکەن ) ئینجا دەستخەرۆی بدا، شاعیر هەستی بەوە کردووە کە مرۆڤی کامڵ دەستخەرۆدانی قورسە، بۆیە ئەویش دەیەوێ ڕێکەوتە بچوێنێت بە منداڵ و ئینجا دەستخەرۆی بدا (ئەمە ڕێگاکەی بۆ کورت دەکاتەوە ) لە سەرەوەدا چەند جارێك وشەی (هێز) مانیفێست بوو، کردەی دەستخەرۆدان هێزێکی لە پشتەوەیە، فەلسەفەی هێزی (نیتشە) باسی ئەوە دەکا کە ڕەگەزی چێژخوازی وەکو ڕەگەزێکی ئەخلاقی شیاوی ڕەتکردنەوەیە( 2) ، بەهای کرداری مرۆ دەبێت لە ڕووی ئەندازەی یارمەتییەك چاوی لێ بکرێ، کە ئەوان بۆ گەیشتن بە هێز بە کاری دەبەن، چێژ ئامانج نییە و شتێك نییە مرۆڤ هەوڵی دۆزینەوەی بدا، لە بازنەیەکدا کە خواستی هێز باڵادەستە، چێژ بێ مانایە و ئەو شتەی بوونێك بۆ هێزێك دروست دەکا، هەر ئەو شتە مانادار و نرخدارە ، هێز و چێژ گرێدراون بە یەکترەوە، چێژ بە بێ هێز هیچە و هێزیش بە بێ چێژ هیچتر، مرۆڤ بۆ ئەوە هێز بە کار دەبا، تا بگاتە چێژ ، چێژێك کە دەرەنجامی هێزە، ئەو کاتەی شاعیر هێز دەکاتە کەرەستەی دەستخەرۆدان ، چاویشی بڕیوەتە چێژێك لە گۆشە دوورەکەدا چاوەڕێی دەکا

((ئێستا چیتر زەردەشت سەرسەخت نییە
چون بایەکی گەرم و توێنەرەوەی سەهۆڵبەندان
بۆتە جیلوەی هێمنی و ئارامی ،
ئەو ئێستاش لە کوێستانەکەیدا لە چاوەڕوانیدایە
تەنها جیاوازی ئەوەیە
کە ئێستا لە دوندەکان دابەزیوە ،
لە بەستەڵەکە زیندووەکان زۆرتر چۆتە پێش
ماندوو و خۆشحاڵە





خوڵقێنەرێکە

خەریکە حەوتەمین رۆژی ئافراندن  تێدەپەڕێنێ ،))

(زەردەشت) وەکو کارەکتەرێك  ئاوێتەی  فەلسەفە و شیعری ( نیتشە ) بووە، هەڵبەت شیعر ناکەوێتە دەرەوەی  فیکرەوە، بەڵام هەندێك تایبەتمەندی خۆی هەیە کە ڕەنگە فیکر و فەلسەفە نەتوانن کەشفی بکەن، ئەوەی دەتوانێ کەشفیان بکا خوێنەرێکە بە بەلەمی (شیعریەت) گەشتی ئاسۆ دوورەکانی شیعر و قوڵاییە سەختەکانی شیعری کردبێت.

قسەکردن لەسەر ئەویتر کە (زەردەشت)ە  جۆرێکە لە قسەکردنە لەسەر خود، بەو واتایەی وێنەی (زەردەشت) لەو پارچە شیعرەی سەرەوەدا نزیك کراوەتەوە لە وێنەی خود (لە پارچەکانی خوارەوەدا ئەمە دەگۆڕێ ) ئەوەتا وەك چۆن خود لە سەرەتادا کەسێکی سەرسەخت بووە و پشتی لە ئاگایی خۆی کردووە  و هەورەکانی لە خۆی دوورخستونەتەوە،  (زەردەشت)یش کەسێکی سەرسەخت بووە و ئێستا بۆتە  جیلوەی هێمنی و ئارامی،  گۆڕانی (زەردەشت) هۆکاری بۆ هێنراوەتەوە، وەك چۆن لە بابەتی گۆڕانی (خود)دا هۆکارەکان دیاریکرابوون،  گۆڕانی (زەردەشت) بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە ، هۆکارێکیان ناڕاستەوخۆیە و (نیتشە) ئاماژەی پێنەداوە لە شیعرەکەدا ، بەڵام  ئەوەی  لە پشتی وشەکانەوە هەستی پێدەکەین ئەوەیە کە:( گۆڕانی زەردەشت بەرهەمی گۆڕانی خودە) هۆکارەکەی تر ڕاستەوخۆیە و (نیتشە) خۆی ئاماژەی پێداوە، ئەویش خۆی لە دابەزینی (زەردەشت) لە دوندەکان و  چوونە پێشەوەی  لە بەستەڵەکە زیندووەکاندا  دەبینێتەوە (زەردەشت) وەکو خوڵقێنەر ،،،

(زەردەشت )ی خوڵقێنەر جیاوازە لەگەڵ خوڵقێنەرانی تر  (زەردەشت) خەریکی تێپەڕاندنی حەوتەمین ڕۆژی ئافراندنە، خوڵقێنەر خەریکی تێپەڕاندنە نەك خەریکی جێگیرکردن و جەقبەستوویی، ئەمەش خاسیەتە

جەوهەرییەکەیە لە کەسایەتی (زەردەشتی خوڵقێنەر)دا ئەگەر قەراربێت (زەردەشت) لەو شیعرەدا چەند کارەکتەرێك بێت لەنێو یەك کارەکتەردا، فرە بچمی (زەردەشت) بۆ چەند ئاڕاستەیی فیکری (نیتشە) دەگەڕێتەوە. (نیتشە) لە شیعرەکەیدا زوو زوو ئاڕاستەی فیکری خۆی گۆڕیوە بە بێ ئەوەی بهێڵێ پەرتبوون و پەرشوبڵاوی ڕووبدا زیاتر مەبەستی گەمەیەکی شیعری بووە ،

(( خامۆش!

ڕاستییەك هاوشێوەی هەورە ڕەشەکان

لەژوور سەرم هاموشۆ دەکا

لە دڵی هەورەوە

بروسکەیەکی ون شریخە دەدا

ڕاستی یاغر یاغر لە قاڵدرمە فراوانەکانەوە ڕووە و من دێت :

وەرە ! ئەی حەقیقەتی ئازیز

وەرە ! ئەمە حەقیقەتی منە ،))

شاعیر داوای خامۆشی دەکا لە (ئەوانیتری نادیار) ، چونکە ڕاستییەك بوونی هەیە دەبێت لە ئاستیدا بێدەنگ بین و لێبگەڕێن ڕاستییەکە قسەی خۆی بکا، ڕاستییەك لە ژوور سەری شاعیرەوە هاموشۆ دەکا (لە ژوور سەرم) ئەو دەربڕینەیە دەکرێ وەکو بەهای ڕاستی چاوی لێ بکەین، ئەمەش ناکۆکە لەگەڵ دیدی فەلسەفی (نیتشە) بۆ ڕاستی کە ڕاستی بە ئازار بەخش دادەنا ، ئەو ناکۆکییە جوانی بەخشیوە بە شیعرەکە.

ئەوەی زیاتر وا دەکا دڵنیابینەوە لەوەی ناکۆکی هەیە لەنێوان فیکری فەلسەفی (نیتشە) و فیکری نێو دەقە شیعرییەکەی، ئەوەیە کە (نیتشە) حەقیقەت بە ئازیز ناوزەد دەکا (وەرە ئەی حەقیقەتی ئازیز)) وەلێ ئەگەر لە ڕابردوودا شاعیر خۆی دوای (حەقیقەتی تاڵ) کەوتبێ ، ئیستا (حەقیقەتی ئازیز )خۆی لە قاڵدرمە فراوانەکانەوە ڕووە و ئەو دێت، ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستییەیە






که گۆڕانی (زەردەشت ) و گۆڕانی خود، گۆڕانی حەقیقەتیان بەدوای خۆیاندا هێناوە و لە (حەقیقەتی تاڵ)ەوە بوو بە (حەقیقەتی ئازیز ) ئەو گۆڕانە دوا جار دەبێتە پەراوێزی بابەتێکی گرینگتر کە بابەتی (گۆڕینەکانی خود)ە خود دەتوانێ بگۆڕێ و ئاڕاستەی شتەکان بەو جۆرەی دەیەوێ دیاری بکا، ئەگەر لە سەرەوە باسی (خودی خوڵقێنەرمان) کردبێ، ئەوا لێرەدا باسی (خودی گۆڕەر)مان کرد، کە خودێك بوو توانی شتەکان بگۆڕێ و لێنەگەڕێ بێدەنگ دابنیشن ، خودێك (حەقیقەتی تاڵ)ی گۆڕی بۆ ( حەقیقەتی ئازیز )

((بە دوو چاوی غەمگین
دڵگیرانە نیگام دەکا و
نیگاکانی هەست بزوێن و سەرەنجڕاکێشن
دەڵێی نیگای کچە لاوەکانن ،
پێموایە هەستی بە نهێنی بەختەوەربوونی من کردووە
هەستی بەوە کردووە
وەك بڵێی من لە دوندەوە دابەزیوم
بۆیە ئاوا هێمن و لەسەرەخۆم
دەڵێی لەودیو بینینەکانی دەعبایەکی گوڵ ڕەنگ
لە هەمبەر مندا دەمی لێکردۆتەوە .))

(حەقیقەتی ئازیز) وێنای کێشراوە و بۆ خوێنەر وازی لێ نەهێنراوە بە ئارەزووی خۆی وێنای بکا، یان بە گوێرەی ئاستی تێگەیشتنی وێنای بکێشێ، (حەقیقەتی ئازیز) وەکو حەقیقەتێکی غەمگین خۆی مانیفێست دەکا، بەڵام غەمگینێك نیگاکانی هەست بزوێن و سەرەنجڕاکێشن ( غەمگینەکە غەمگینێکی ئاسایی نییە ) شاعیر نیگاکانی ئەو حەقیقەتە دەچوێنێ بە نیگای کچە لاوەکان، ڕەنگە ئەمەش تا ڕاددەیەك ناکۆك بێت لەگەڵ ئەو دیدە فەلسەفییەی (نیتشە) بۆ ژنی هەیە.

پێویستە سێکس و جێندەر تێکەڵ نەکەین ، یەکەمیان بایۆلۆژییە و دووەمیان دەرونیی – کۆمەڵایەتییە ، (نیتشە) ڕاستەوخۆ باسی ئەو جیاوازییە ناکا، وەلێ لە جیاوازی نێوان (مێبوون ) و (ژنبوون) تێدەگا ، لای (نیتشە) نەمانی غەریزەی ژنانە، فەوتانی ژنە، باسی ئەو تایبەتمەندییە بایۆلۆژییەی ژن دەکا کە دەبێتە هێزێك بۆ ژن خۆی ( دیسانەوە بەر بابەتی هێز دەکەوینەوە) ،(سیمون دو بۆڤوار) لەو ئاستەدا قابیلی بەراوردکردنە لەگەڵ (نیتشە) (نیتشە) جیاوازی نێوان (ژن) و (پیاوی) بەستۆتەوە بە ڕوانگەی جیاواز و بەهای جیاوازەوە، ڕەخنە دەگرێ لە دوالیزمی فەلسەفی یان میتافیزیکی (دوالیزمی جنسی) چەند میتۆدێك دەخاتە ڕوو کە گرینگن و گرینگییەکەیان دەتوانێ بگاتە چەندین و کون و ئاست و لەوێوە ئیش لەسەر چەندین ڕاستی بکا، لە (ئەرکیۆلۆژیای ئاکار)دا (نیتشە) قسە لەسەر ئەو بەهایانە دەکا کە زیهن بە بەرزتر دادەنێن بە بەراورد لەگەڵ لەش ، لەوێدا ژنان بە لەشیان جیادەکرێنەوە، لای (نیتشە) ئەو بەهایانە وا دەکەن توشی گوناهبین (3)

( حەقیقەتی ئازیز) حەقیقەتێکی هەستیارە و توانای ئەوەی هەیە دەرك بە نهێنییەکان بکا ، ئەوەتا دەرکی بە نهێنیی بەختەوەربوونی شاعیر کردووە، وەلێ ئەو پرسیارەی بەیان دەبێت ئەمەیە: حەقیقەت بۆ غەمگینە کە دەبینێ خود بەختەوەرە؟ دواتر دەکرێ بپرسین: ئایا ئەوەی حەقیقەتی ئازیزی غەمگین کردووە بەختەوەری خودە؟ ئایا حەقیقەتی ئازیز گەرەکیەتی خود بەختەوەر بێت ؟ (زەردەشت) وەکو خود

ئەمجارەیان (زەردەشت) دەبێتە خود، خودی (نیتشە) لەنێو (زەردەشت)دا دەتوێتەوە، ئەوەی لە دوندەکانەوە دابەزیبوو ، (زەردەشت) بوو نەك خود، وەلێ کرداری (لەنێویەکتری توانەوە) ئەوەندە قووڵە (زەردەشت) دەبێتە خود و خودیش دەبێتە (زەردەشت) بە ڕاددەیەك ئەو دووانەت بۆ لە یەکتری جیاناکرێتەوە.

(دووانەیی) قسەی زۆر هەڵدەگرێ لە بابەتێکی سەربەخۆدا ، یان لە دەقێکی ئەدەبیدا کە (دووانەیی ) بەشێکی گەورەی داگیرکردووە، وەلێ بابەتی (دووانەیی ) لە شیعرەکەدا بۆ چەند چرکەیەکی



دیاریکراوە و خێرا دەگۆڕێ، بۆیە ئێمەش زیاتر لەسەری ناوەستین و لێیدەگەڕێین
(( خامۆش ! ، چونکە ڕاستیی من لە دوواندایە :
- ماڵت خرا بێت زەردەشت!
دەڵێی ئەو مرۆڤەی  کە (زەرناب)ی قووت داوە
لە کۆتایدا ورگت هەڵدەدڕن  بۆ دەرهێنانی زێڕ ! ،
زەردەشت! ، تۆ زیاد لە پێویست بە توانای
بێ ئەندازە خەڵك سەرسام دەکەی و  وایان لێدەکەی  حەسوودیت  پێببەن،
من لە بەرامبەر شەوقی دڵگیرتدا  خۆم  ناگرم
هاوار بۆ سێبەر دەبەم و  هەڵدەلەرزم
دە تۆ بڕۆ بە توانا ، بڕۆ
ئەی زەردەشت!  ، لە  خۆری خۆت  دوورکەوە! ،،،))
دیسانەوە (نیتشە) داوای  خامۆشی دەکا لە ئەوانیتری نادیار، دیسانەوە ڕاستی قسە دەکا، وەلێ ئەمجارە ڕاستییەکی نەناسراو نییە ، بەڵکو (ڕاستی خود)ە: (( خامۆش ! ، چونکە ڕاستیی من لە دوواندایە)) هەر لەبەر ئەوەی (ڕاستی خود) لە دوواندایە، ئیتر بەلای  خودەوە  دەبێت هەمووان بێدەنگ بن و قسە نەکەن (ڕاستی  خود  قسە دەکا ) دەکرێ  (ئەوانیتری نادیار)  تاقە کەسێك بووبێت، ئەویش خودی (زەردەشت)ە  شاعیر داوای لە (زەردەشت) کردبێت  بێدەنگ بێت، وەلێ ئەمە تێگەیشتنە دووەمییەکەی منە لەو پارچە شیعرە و تێگەیشتنە یەکەمییەکەم هەر ئەوەیە لە سەرەتادا باسمکرد ، شاعیر داوا لە کۆمەڵێك کەسی نادیار دەکا  خامۆش بن، ئێمە ئەو کەسانە نابینین ، خود لە ڕێگەی ئەو بێدەنگ کردنەوە، ئەوان مەحکوم  دەکا  بەوەی گوێ لە (ڕاستی خود) بگرن
ئەو مەحکومکردنەی  خود دەکەوێتە کوێی فیکری فەلسەفی (نیتشە)وە؟ من دەزانم لای (نیتشە) هەمووان مەحکومن بە ژیان و بەڵگەش بۆ ئەمە،



دیالۆگەکەی نێوان (نیتشە) و دکتۆرەکەیەتی لە کۆتاییەکانی ژیانی (نیتشە)دا، ئەو کاتەی دکتۆر دەیەوێ وەکو نەخۆشێك مامەڵە لەگەڵ (نیتشە) بکات،

ئینجا وەسفە گشتییەکەی (زەردەشت) دەستپێدەکا و شاعیر بە تەواوی وەسفی ئەو (زەردەشت)ە دەکا لە شیعرەکەیدا لەپاڵ وشە و ڕستە و دەربڕینەکانیدا وجودی هەیە، ئەو کەسێکە تا ئاستی ئیرەیی پێبردن بەهێز و سەرسامکەرە، بە ئاشکرا هەست بەوە دەکەین خود (حەقیقەتی خود ) ئیرەیی دەبا بە (زەردەشت) ، ئەمە جگە لەو ئیرەییە گەورەیەی ئەوانیتر بە (زەردەشت)ی دەبەن ، بە گەڕانەوە بۆ دیدی (نیتشە) لە بابەتی (بەزەیی)دا ، دەکرێ قسە لەسەر دیدی ئەو بۆ (ئیرەیی) بکرێ (نیتشە بەزەیی بە خراپ دادەنا ) ، (نیتشە) بانگەشەی (مرۆڤی باڵا – سوپەرمان) دەکا، هەڵبەت (گۆتە)ش لەنێو هۆنراوە دراماتیکییەکانی نێو (فاوست) دا وێنای وەها مرۆڤێکی کێشاوە بەڵام دەبینین خود وەکو کەسێکی بێدەسەڵات کە هەڵدەلەرزێ لە سێبەردا دەردەکەوێ، ئەمەش دژە لەگەڵ دیدی فەلسەفی (نیتشە) بۆ مرۆڤ و خود ، کە پێیوایە تەنانەت خودی بەزەیش بۆ مرۆڤ خراپە و پێویستی نییە

((دەتەوێ نووری زیادەت ببەخشیە ئەوانیتر بە مشتان

وەلێ ئەوەی زیادە خودی تۆیە!

ئەی بە توانا وریابە

ئەگەر مەیلی بەخشینت هەبوو

لە خۆتەوە دەستپێبکە

زەردەشت

خۆت ببەخشە !،))



وەك گوتمان ناکۆکی هەیە لەنێوان دیدی فەلسەفی (نیتشە) و ئەو دیدە شیعرییەی (نیتشە) لە قەسیدەکەیدا دەیخاتەڕوو ، ئەوەشمان گوت کە ئەو ناکۆکییانە گەمەیەکی شیعرین و جوانییان بەخشیوە بە شیعرەکە ، گریمان ئەگەر ئەو ڕوانگە بێکەڵکە بۆ

شیعر دروست بێت کە پێیوایە شیعر دەکەوێتە دەرەوەی فەلسەفەوە (من قەت لەگەڵ ئەو دیدەدا نیم) ئەوا دیسانەوە (ناکۆکی) و هەموو ئەو چەمکانەی پەیوەستن بە ناکۆکییەوە، یەقەمان بەرنادەن لە بازنەی شیعرەکەدا، یانی ئەگەر حاشامان لە بوونی بازنەی فەلسەفی (نیتشە) کرد کە ئەمە تاوانێکی کۆمیدییە، دیسانەوە ڕووبەڕووی چەندین ناجێگیری فیکری دەبینەوە لە بازنەی قەسیدەکەی (نیتشە) دا ، وەك بینیمان شاعیر (زەردەشت) ئەوەندە بەرزدەکاتەوە دەیگەیەنێتە ئاستێك هەمووان بەخیلی پێدەبەن، وەلێ دواتر (خودی خود) ئەو مرۆڤە بەرزکراوەیە بە بێکەڵك دادەنێ و داوای لێ دەکا ئەگەر مەیلی بەخشینی هەیە، لە بەخشینی خۆیەوە دەستپێبکا ، کەواتە یانی چی تۆ کەسێك بەرزبکەیتەوە و پێشتوابێت بێ کەڵك و زیادەیە ؟ ئەو ناکۆکییانەی لە ئەزمونی شیعری (نیتشە)دا هەن، قابیلی ئەوەن لە چەندین گۆشە نیگای جیاوازەوە قسەیان لەبارەوە بکرێ، بە داخەوە تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی یان بابەتێکی ڕەخنەیم نەبینیوە تیایدا ڕەخنەگرانی کورد بەو زمانەی کە پێویستە قسە لەسەر ئەزموونی شیعری (نیتشە) بکەن.



سەرەنج : دوای وەرگێڕانی دەقی شیعرەکەی (نیتشە) دەستکاری فۆڕمی نووسرانەکەیم کردووە بە مەبەستی ڕوونبوونەوەی زیاتری ئەو دێرانەی لێکۆڵینەوەکەمان قسەیان لەسەر دەکا ،،،

پەراوێزەکان :

**(1)** بگەڕێوە بۆ : (پەیکەری ست ڕافۆن ) وەکو دوا پەیکەری نێو کۆنە باخچەکەی فیکر ، بڵند باجەلان ، گۆڤاری (نوێ ) ژمارە (**2**) ، **2013** ،،،

2ـ 2001 ، Milano ، Alessandro Spie Gar، Introduzione di ، LI tre mine IAfr Ase

(3) زن در تفکر نیچه ، نوشین شاهنده ، چاپ اول ، 1382 ، انتشارات قصیده سرا ،،،

سەرچاوەکان :


1ـ بهترین اشعار نیچه سرودەهای زرتشت، ت : شجاع الدین شفا ،،،

2ـ تاریخ فلسفه غرب ، برتراند راسل ، ت: دریا بندری ،،،

3ـ 2008 ، Milano ، Alessandro nero، Introduzione di ، Nietzche

4ـ 2001 ، Milano ، Alessandro Spie Gar، Introduzione di ، LI tre mine IAfr Ase

5ـ نیتشه و پاش تازەگەری ، د، محەمەد کەمال ، چاپی یەکەم ، دەزگای حەمدی ، سلێمانی ، 2006

6ـ ایتن جلسون ، روح الفلسفه الأوروبیه فی العصر الوسیگ ، ترجمه : امام عبدالفتاح امام ، دار الپقافه للگباعه والنشر ، الگبعه الپانیه ، القاهره ، 1982

7ـ هەژاریی بەهێز ، فریریك نیتشه ، و : بڵند باجەلان ، ڕۆژنامەی هەواڵ ، کەرکوك ، 2013




ئانا ئاخماتۆڤا .. کلایس ئاندرسن .. جوویل .. یانیس ئیوفانتس

# دوو ژن و دوو پیاو

وەرگێڕانی

شێرزاد حەسەن





محەمەد ڕەزا سەفەری

# ئەدەبی فارسی و ئەدەبی سەردەم



# محەمەدڕەزا سەفدەری

## وەرگێڕان و ئامادەکردنی: بەڕۆژ ئاکرەیی

محەمەدڕەزا سەفدەری، لە شاری "خورموج"ی سەر بە باشووری ئێران و لە ساڵی ١٩٥٤دا چاوی بە ژین هەڵێناوە. لە تەمەنی بیستوسێ ساڵیدا و بە مەبەستی خوێندن، لە "ئەنەستیتۆی هونەر" ڕووی لە تاران کردووە. دوای دوو ساڵ، واتا پاش شۆڕشی گەلانی ئێران، لە بەشی درامای زانکۆی هونەری تاراندا، پەرەی بە خوێندن داوە. چیرۆکەکانی سەفدەری لەو سەردەمەدا و بۆ یەکەمین جار، لە گۆڤاری "کتاب جمعە"ی ئەحمەد شاملوودا بڵاو کراونەتەوە. ئەم چیرۆکانە، لەو سەردەمەدا و لەنێو نووسەرە جددییەکانی ئێراندا، وەك ڕووداوێکی ئەدەبی خراونەتە بەر باس و مشتومڕە ئەدەبییەکان.

سەفدەری: کەمدوو، ماندوو، دوورەپەرێز، جدی، تووڕە و... میهرەبانە.
لە بەیانییەوە کە لە خەو هەستابووین، هەر بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە. دەچووە مەتبەخ، تاوێك نازانم لەوێ چیی دەکرد و دەهاتەوە ژووری.
هاتەوە ژووری: «هیچت پێویست نییە؟»
کتێبەکەم داخست و سەیرێکم کرد: «نا.»
لێی دەڕوانیم.
سەرم بادا: «سوپاس.»
گوتی: «چی دەخوێنییەوە؟» سەیرێکی کتێبەکەی ناو دەستمی کرد: «ئاها... چیخۆف! دوو چیرۆك لەو کتێبەدا هەن، هیی ئەوەن پاش خوێندنەوەیان، بچی پەتێك هەڵخەی و لە داخان خۆت هەڵبواسی، کە من بۆچی نەمنووسیون. ئەرێ من بە تەما بووم چی بکەم؟» چووە بەر پەنجەرە و لە دەرەوەی ڕوانی.
***
هاوینی ١٩٨٤ بوو. تاران گەرم بوو. سەفدەری دوو ژووری بچووکی لە نهۆمی سەرەوەی دایك و باوکی شاعیرێکی چەپ بە کرێ گرتبوو، کە خۆی هەڵاتبوو. ناوی چ بوو؟ قەت نەمبیستەوە. ئەو شاعیرە بە خۆی و دوو برادەری دیکەی، کۆمەڵە شیعرێکیان پێکەوە و لە بەرگێکدا بڵاو کردبووەوە، کە من نەمدیبوو. سەفدەری هەیبوو: دڵە بچووکەکان لە شاری گەورەدا: عەبدۆی گەمییەوان/ چۆتە دوبەی/ تاکو لەیلای نۆساڵانە بفرۆشی و/ قیستی گەمییەکەی بدا.
من ماوەیەك بوو لە وەرگێڕانی چیرۆکێکی سەفدەری
"چەتر و



بارانی" (بە کوردییەکەی ئەو کاتمەوە، کە بە زەبری نووسین و وەرگێڕان خەریك بووم فێری دەبووم) بووبوومەوە. سیامەك تەقیپوور (کە نووسەر بوو و برای برادەرێکم بوو و لەگەڵ سەفدەری و لە زانکۆدا، درامایان پێکەوە خوێندبوو) پێشەکییەکی لە بارەی سەفدەرییەوە بۆ نووسیبووم، کە دەرەقەتی وەرگێڕانی نەدەهاتم. هەر خەریك بووم و تەواو نەدەبوو. پاشان سیامەك بە براکەی گوتبوو سەفدەری لە تارانە و فلانەکەس ئەگەر بییەوێ دەتوانێ بیبینێ.
چووبووم و دیتبووم.
- سیامەك نووسیویە؟... باسی ئۆتۆمبێلەکەیشمی کردووە؟
- ئۆتۆمبێل؟
- ئادی ئەوکات ڕینۆیەکم هەبوو.
چیرۆکەکانی سەفدەریم، (کە هێشتا نەبووبوونە کتێب) هەر هەموویان لە گۆڤارەکاندا خوێندبوونەوە.
"بەردی ڕەش" تازە لە کتێبی "هەشت چیرۆك"دا، کە گوڵشیری هەڵیبژاردبوو پێشەکیی بۆ نووسیبوو، بڵاو کرابووەوە. هەشت چیرۆکی هەشت نووسەری نوێ. هەمووشیان شاگردی گوڵشیری.
یەکەمین جار لە سەفدەریم بیست: پێنج شەموان لە ماڵی گوڵشیری کۆ دەبینەوە، چیرۆك دەخوێنینەوە، لەسەر دەقەکان دەدوێین و مشتوومڕ دەکەین.
نەموێرابوو قەت ڕۆژێك بپرسم: دەکرێ منیش بێم؟
"قازی ڕەبیحاوی"م بە هۆی سەفدەرییەوە ناسی. شەوێك چووینە ماڵەکەی، کە لە کۆڵانێکی پشت زانکۆی تاران بوو. قەت ژووری وا پڕ لە کتێبم نەدیبوو، تا ئەو کاتە. سۆبایەکی عەلادین لە ناوەندی ژوورەکە بوو، کە کتری و چاپەزێکی لەسەر بوو.
لەسەر کتێبەکان دانیشتین و من
بەس سەیری کتێبەکانم
دەکردن. قازی
نازانم لە



چی تووڕە بوو و بە مینگەمینگەوە بەس جنێوی دەدا و چای دەخواردەوە. تازە لە زیندان بەر درابوو. چیرۆکە هەرە چاك و بەناوبانگەکەی "چاڵ"، لە هەمان "هەشت چیرۆك"دا بڵاو بووبووەوە بڵاو کرابووەوە.

- خوێندتەوە؟

دەمم کردەوە و هێشتا وشەیەکم لە زار نەهاتبووە دەر، زەنگی تێلیفۆن لە پشت کتێبەکان بەرز بووەوە، قازی بیستۆکی تەلەفۆنەکەی هەڵگرت.

بەس جنێوی دا.

سەفدەری گوتی: با بڕۆین!

کە هاتینە ماڵەوە، براکەی سەفدەری هاتبووە سەردانی. ناویم لە بیر نییە، بەڵام سەرباز بوو.

- تۆ عیراقییت؟

سەرێکم لەقاند.

گوتی: «شەڕ، شتێکی زۆر ناخۆشە» و تەماشای جگەرەی نێوان پەنجەکانی خۆی کرد.

پاشان ڕۆژێك سەفدەری گوتی براکەی هەڵاتووە و لەسەر سنووری نازانم کوێ گیراوە.

- ئەدی ئێستا؟

- لە زیندانە. نازانم چی بەسەر دێ؟

پاشان سەفدەری ڕۆیشت.

پاشان گوتیان: گەڕاوەتەوە باشوور.

پاشان گوتیان: بۆتە مامۆستا، لە شارەکەی خۆی، یان دەوروبەری.

پاشان "سیازەندووق" چاپ کرا. سپەیسێك پێویستەساڵی ٨٩ بوو.

سەفدەری لە تاران نەبوو و کتێبەکەی دەنگێکی چاکی دایەوە و خێرا نایاب بوو.



پاشان "هەڵماتی شین"ـم دوای نۆ ساڵ لە ستۆکهۆڵم کڕی.
نەمدەزانی لە کوێیە.
لەم بیستونۆ ساڵەدا بەس جارێك بە تێلیفۆن قسەمان کردووە. ئەویش بە هەڵکەوت لە ماڵی برادەرێك بوو، کە من بە هەڵکەوت لە ستۆکهۆڵمەوە تێلیفۆنم بۆی کردبوو. "من بەور نیم، تێکئالاو بە باڵای خۆمدا، مێوم" تازە چاپ کرابوو. ڕۆمانێکی قورس و سەخت و چەتوون، بە زمانێکی شاعیرانە و گەلێك ئاڵۆز. وەك ناوەکەی. هەمان ساڵ "خەڵاتی باشترین ڕۆمانی ڕەخنەگران و نووسەران"ـی وەرگرت.

هاتەوە ژووری. دەستی بە چەنەیدا هێنا: «ئاها... وابزانم دەمویست ڕیشم بتاشم.»
تاشی و گوتی: «بڕۆین پیاسەیەك بکەین و کەمێك تەماشای خەڵك بکەین...»
چووینە دەرێ. هەینی بوو. تا لای نیوەڕۆ بە شەقامەکاندا خولاینەوە. پیرەمێردێك، کە چاکەتێکی درێژی لەبەر بوو، لە بن دیوارێك، کتێبی هەڵڕشتبوون. بە دوو تمەن. ڕاوەستاین. کتێبەکان زۆرتریان ئایینی بوون. سەفدەری دانیشت، کتێبێکی هەڵگرت. هەستایەوە. شهادت امام حسین. پارەکەی دا و... ڕۆیشتین.
گوتم: «ئەو کتێبەت بەڕاستی کڕی؟ دەیخوێنییەوە؟»
گوتی: «ئەمەیان بزانم چۆنی گێڕاوەتەوە.»
لە دڵی خۆیدا گوتی، بەڵام بە دەنگی بەرز.



# به تەما نیم هیچ بڵێم

گوتوبێژێك لەگەڵ محەمەدڕەزا سەفدەری

محەمەدڕەزا سەفدەری، نووسەرێکی دوورەپەرێز و خەڵوەتنشینە. ئەهلی قسەوباس و گفتوگۆ نییە. بەڵام بەرهەمەکانی وەکو خۆی لە خەڵوەتدا نامێننەوە.. سەفدەری تا ئێستا دوو کۆمەڵەچیرۆکی بڵاو کردوونەتەوە. "سیازەندووق" لە ساڵی ١٩٩٨دا بڵاوکرایەوە و گەلێك بۆچوون و هەڵسەنگاندنی جیاوازی بە دوای خۆیدا هێنان. هێندێك کەس پێیان وابوو بەهێزبوونی ئەم بەرهەمە تەنیا هەڵکەوت بووە و ناکرێ توانایی نووسەرێك بە لەبەرچاوگرتنی تاقە کتێبێك هەڵسەنگێندرێ. بەڵام دووهەمین کۆمەڵەچیرۆکی سەفدەری "هەڵماتی شین"، سەرلەنوێ مشتومڕە ئەدەبییەکان و هەڵسەنگاندنە جۆراوجۆرەکانی بە دوای خۆیدا هێنانەوە.

کە لە سەفدەری دەپرسم: بۆچی کۆمەڵەچیرۆکی یەکەم و دووهەمت نۆ ساڵ مەودایان کەوتۆتە نێوانەوە؟

دەڵێ: نۆ ساڵ خراپ نییە! "من لە ١٩٨١ یان ١٩٨٢دا "سیازەندووق"م ڕادەستی دەزگایەکی بڵاوکردنەوە کرد، کە گوایە نەیانهێشت بڵاو ببێتەوە، یان ونیان کرد! کابرای خاوەندەزگایشم قەت نەدیتەوە. لە



ساڵی ١٩٨٤دا ئەم کتێبەم سەرلەنوێ ڕادەستی دەزگایەکی دیکە کرد، ئەویش تا ١٩٨٩ بڵاوی نەکردەوە. پاشان لەلایەن دەزگایەکی دیکەوە بڵاو کرایەوە و تا ئێستایش مۆڵەتی چاپی دووهەمی نەدراوەتێ. جارێك گوتبوویان گوایە من لەم کتێبەدا ستایشی "ڕەزاشا"م کردووە (!)، چەند جارێکیش بردیانمە دادگا و پێیان گوتم: تۆ ئەم کتێبەت نووسیوە تا گەنجەکان هەڵخەڵەتێنی و بە لاڕێیاندا ببەیت. کەواتە پێم وایە باشترە لێم بپرسی لەم حەڤدەساڵەدا چیم کردووە؟ منیش لە وەڵامتدا دەڵێم ژیاوم. هەڵبەت ئەگەر بەم خەریکبوونەم بگوترێ ژیان. لە پاڵ ئەوەیشدا خەریکی نووسین بووم و نووسیومە. هەرکەس توانایەکی هەیە و لەوە زیاتری پێ ناکرێ. منیش سەرەڕای هەموو ئەم گرفتانەی لەم ڕۆژگارەدا هەن، هێندەی لە توانامدا بووە نووسیومە. ئێستایش "هەڵماتی شین"م بڵاو کراوەتەوە تا بزانین و ببینین چیی دیکەم پێ دەکرێ.

سەفدەری بە تەمایە بەم زووانە، چەند ئەفسانەیەکی باشووری ئێران ڕادەستی دەزگایەکی بڵاوکردنەوە بکا، جگە لەوەیش یەك- دوو شانۆنامەی هەیە.

- تۆ لە "سیازەندووق"دا نووسەرێکی کۆمەڵایەتی و مولتەزیمیت، بەڵام لە "هەڵماتی شین"دا، نا. لە کۆمەڵەچیرۆکە نوێیەکەتدا دوو جۆرە چیرۆك بەرچاو دەکەون: بەشێکیان ئەفسانەن و بەشەکەی دیکەیان گەڕانن بەدوای سەردەمی منداڵێتیدا. خۆت لە کۆمەڵگە دوور خستۆتەوە، بۆ؟

- بەر لە هەموو شتێك، با ئاماژە بەوە بکەم، کە من نامەوێ خۆم بەس لە شتێکدا قەتیس بکەم. هەر شتێکم بەلاوە سرنجڕاکێش بێت، لام دەبێتە چیرۆك. هەڵبەت من لە نووسیندا گەلێك دەربەستی زمانم و لە ئاستیدا هەستیارم. بە بڕوای من، دوو شت لە داهێنان و نووسیندا گرنگن: ژینگە و هەلومەرجی نووسەر لەو



ژینگەیەدا. لە سەردەمی نووسینی چیرۆکەکانی "سیازەندووق"دا، کۆمەڵگە لە قەیران و ئاڵوگۆڕە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا بوو، کە ئاکامەکەی شۆڕش بوو و دواتریش شەڕی عیراق و ئێران. من لەو سەروبەندەدا خوێندکاری زانکۆ بووم و لە تاران دەژیام. ڕێك لە جەرگەی ڕووداوەکاندا بووم، تاران و زانکۆ. بەڵام پاشان بووم بە مامۆستایەکی دوورەپەرێز و کۆمەڵگەیش ئاشکرایە لە هەلومەرجی وادا چیی لێ دێ و بەرەو کوێ دەڕوا. شەڕ بوو و لە بارەی شەڕیشەوە نووسیومە.

- حەوت چیرۆکەکەی "هەڵماتی شین"ت بە پێی کام پێودانگ لە کتێبێکدا کۆ کردنەوە؟

- پێودانگی تایبەتیم بۆ هەڵبژاردنیان نەبوو. لەوانەیە مێژوو و سەردەمی نووسینیانم لەبەر چاو گرتبن. بەڵام ئێستا کە پێکەوە و لە کتێبێکدا کۆبوونەتەوە، دەبینم (جگە لە چیرۆکی "کڕووزانەوە") پێوەندیی نێوان ژن و پیاو لە هەموو چیرۆکەکاندا بەرباس دراوە. لەیەکەمین چیرۆکەوە تا دوایینیان.

- بۆچی لە نووسیندا کورتەچیرۆکت هەڵبژارد؟

- نازانم. لە دواساڵەکانی خوێندنی ئامادەییدا، شتایەکم دەنووسین کە زۆرتر لە ڕۆمان دەچوون. هێشتا بەشێك لەو نووسراوانەم هەن. بەڵام گەلێك زووتر لەوە، لە ڕۆژگارێکدا، کە بەردم بەرەو ئاسمان هەڵدەدان و سەرم لە ژێریاندا ڕادەگرت و نەمدەزانی چی لە خۆم بکەم، بچووکترین قاڵبی زەمەنم هەڵبژارد. لەو ڕۆژانەدا بەس من بووم و زەوی و کێوی "بەیرەمی" و ئاسمانی بانسەرم. زۆری خایاند تا بۆم دەرکەوت جگە لەمانە، ڕابردووی بەردەوام لە پەنامدایە. یەکێك لە باشییەکانی کورتەچیرۆك بۆ من ئەوەیە کە بەردەوام دەمگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی منداڵییم: گێلەکردن بە تۆپێك لە بازنەیەکی نیو مەتریدا، کە زیرەکییەکی زۆری دەوێ. ئەگەر توانیت تۆپەکە لەم بازنەیەدا بخولێنییەوە و دەربازی بکەیت، دەبینی هەموو ئەندامەکانی لەشت دێنە گۆ. وشە



لە لای هەموو کەسێك هەمان وشەیە. بەڵام دەبێ بزانی وشە لە کوێ دەست پێ دەکا و تۆ چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەی. من پێم وایە، کورتەچیرۆك هێندێك هەوێنی سەمای تێدایە. ڕێك لە یەکەمین ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ١٩٨١دا، من و "سەمەد تاهیری" برادەرم لە گۆڕستانێکی "ئەهواز"دا و لەسەر گۆڕێك دانیشتین، کە نەمان دەزانی گۆڕی کێیە و دەبێ چی بکەین. ژنە باشوورییەکان، لەسەر گۆڕی مردووان سەمایان دەکرد، لە بازنەیەکی بچووکدا. خولانەوەی دەست و باسك و پێیەکان هەر بە قەرا جەستەی یارێك بوو،کە لەژێر خاکدا خەوتبوو. تێکڕای ئەمەیە. لە شوێنێکی بچووکدا، زۆرتر یاری دەکەین. کە دەچینە شوێنە گەورەکان، سەدانسەد شتگەلێك لە خودی یارییەکە کەم دەبنەوە. بەڵام لە شوێنی بچووکدا، تێکڕای لەش سەرڕێژی یاری دەبێ. هەڵبەت دەبێ ئەوەیش بڵێم، کە شانۆنامە و ڕۆمانیشم نووسیون.

- لەم نموونەیەدا کە تۆ هێناتەوە، پێوەندیی خوێنەر لەگەڵ کورتەچیرۆکدا زۆر دیار و بەرچاو نییە.

- هیچ ئاگایەکم لە پێوەندیی خوێنەر و کورتەچیرۆك نییە و بۆچوونێکی تایبەتیشم لەو بارەوە نییە. بەس دەمەوێ یەك شت بڵێم. لەم سەردەمەدا کە دەبێ ساتەکان نێچیر بکرێن، دەکرێ کورتەچیرۆك، نەك بۆ نووسەر بەڵکو بۆ خوێنەر، باشترین ئامرازی نێچیرکردنی کورتەساتەکان بێت. لەوانەیە هێندێك کەس نەزانن، کە کورتەچیرۆکیش دەکرێ وەك ڕۆژنامە لە پاسدا، لە ژووری چاوەڕوانی پزیشکدا و لە شوێنەکانی دیکەدا هاودەمیان بێ.

- شوێنی کورتەچیرۆك لە گۆڤارەکاندایە. بۆچی هاوکارییەکی ئەوتۆت لەگەڵ گۆڤارەکاندا نییە؟

- من تا ئێستا چیرۆکم لە گۆڤارەکانی "کتاب جمعه" [ گۆ ڤا ر ە کە ی شا ملو و ]



"مفید" [گۆڤارەکەی گوڵشیری] و "کتاب سخن"دا بڵاوکردوونەتەوە. بەڵام ئەگەر ئەمەیان زۆر نییە و کەمە، دیارە هۆکاری خۆی هەیە. من چیرۆکی "دڵهەڵاتوو"م لە ساڵی ١٩٩٢دا بۆ گۆڤارێکی ئەدەبی نارد و تا ئەمڕۆیش کە ساڵی دووهەزارە، هێشتا بڵاویان نەکردۆتەوە. بە تەمام کورتەچیرۆکێك هەر بۆ ئەم گۆڤارە بنێرم و هیوادارم تا حەوت- هەشت ساڵی دیکە، بڵاو بکرێتەوە.

- لە "هەڵماتی شین"دا دوو ئەفسانەت بڵاو کردوونەتەوە. بە تەمایت دیسان ئەفسانە بنووسیتەوە؟

- نووسینەوەی دوو ئەفسانە لە کۆمەڵەچیرۆکی "هەڵماتی شین"دا، نیشانەی گۆڕانی شێوازی من نییە. من بە هەر شێوازێك کە بتوانم، دەنووسم. "پەرییەکان"م لە پۆلی دووی سەرەتاییدا بیستبوو. ئەو چیرۆکەم لە ساڵی هەشتاوسێدا و بۆ وانەی مەتەلۆکناسیی زانکۆ نووسی و دیتم خراپیش نییە. گێڕانەوەیەکی دیکەیشم لە سەرماوەزی ١٩٩٥دا بیست. نووسیمەوە و بوو بە چیرۆکی "درەختی یەکەم". بەڵام دیسان ئەفسانەم هەن: دوو ئەفسانەی دیکەم هەن، کە ڕیشەیان لە "شانامە"دایە، کە لەم کۆمەڵەچیرۆکەدا نەهاتوون و لە شوێنێکی دیکەدا بڵاو دەکرێنەوە.

- ئەفسانەکانی کۆمەڵەچیرۆکی "هەڵماتی شین" ڕیشەیان لە کوێیە؟

- لە فەرهەنگی باشووری ئێراندا، هەڵبەت من لە "خورموج"دا بیستوومن، نەك لە شوێنی دیکە.

- لە "پەرییەکان"دا، دێڕێك هەیە کە دەڵێ: وەك ئەوەی کەسێك خەون بە منداڵیی باوکییەوە ببینێ، یان باوکێك خەون بە پیریی کوڕەکەیەوە ببینێ. سەرچاوەی ئەم چەشنە دێڕە و هاوشێوەکانی چییە و لە کوێوە هاتوون؟

- سەرچاوەکەی لە ئەفسانەکاندا نییە، بەڵکو لە خەیاڵی مندا هاتوونەتە دی.

- مەبەستت لە نووسینی "درەختی یەکەم" چی بوو، کە گێڕانەوەیەکە لە جیهانی پەرییەکانەوە؟

- ژن و پیاوەکەی "درەختی یەکەم"



دوای یەکترناسین، هێندە قسە و کرداریان پاتەوپات دەبنەوە، کە پیاوەکە جاڕز دەبێ و سەرەنجام بۆ دامرکاندنەوەی کڵپەی نێو سەری، بڵێسەیەك لە سەری نزیك دەکاتەوە، ژنەکەیش هەروەتر و گڕ دەگرن.

- وەك ئاماژەت پێی دا، تۆ گەلێك دەربەستی زمانیت و هەمیشە زمانێکی قورست هەڵبژاردووە؛ بەتایبەت لە "درەختی یەکەم" و "دوو هەوێردە"دا. هۆی چییە؟

- هۆیەکەی ئەوەبوو هیچکەس لێیان تێ نەگا، تاکو بڵێن ئەم کابرایە نووسەرێکی گەورەیە(!).

- تۆ خۆت بە قەرا کەسایەتییەکانی چیرۆکەکانت، مرۆڤێکی تووڕەیت؟

- هێندەی خودا حەز بکا. هەڵبەت مرۆڤەکانی چیرۆکەکانم لە من تووڕەترن. هەر لەبەر ئەمەیشە کە زمانی چیرۆکەکانم، خۆت گوتەنی قورس و چەتوونە. ڕەگەکانیش هەروەها، لە زمانی چیرۆکدا چارەنووسسازن. من هەر لە منداڵییەوە خوویەکی جینگن و شەڕانیم هەبوو. هێشتایش هەر وام. بۆیە "گوڵەفروز"ی چیرۆکەکەیشم کەسایەتییەکی شەڕانی و جینگنە.

- دوای ئەم هەموو قسانە، بۆچوونت لە بارەی زمانەوە چییە؟

- زمان، یەکێك لە نرخێنەرانی ئەدەبی هەموو وڵاتێکە و پێم وایە دەبێ تا ئەو شوێنەی لە تواناماندایە، هەوڵی پاراستن و پاڵاوتن و فراژۆکردنی بدەین. جگە لەمەیش، زمان یەکێکە لە بنەماکانی پێکهێنانی شێوازی هەر نووسەرێك. مرۆڤەکان لە یەکدی جیاوزان، کەواتە شێواز و زمانەکانیش لە یەکدی جیاوازن. من پێم وایە زمانی چیرۆك، پێوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی خودی نووسەردا هەیە. وابزانم لە شوێنێکدا خوێندوومەتەوە، کە زمان پێوەندییەکی تەنگاوتەنگی لەگەڵ چالاکییەکانی لەشی مرۆڤدا هەیە، لەگەڵ دڵ و خوێندا. دەتوانین بڵێین:
زمانی تێپەڕینی
شتە کا ن



لەنێو لەش و دەمارەکاندا. بەڵام دەمارەکان لە نووسین و داهێنانی هونەریدا گەلێك کارسازن.
- چیرۆکی "هەڵماتی شین" هەر دەڵێیت تێڕوانینێکی دیکەیە بۆ چیرۆکی "کووچەی کەرمەشان" کە لە کۆمەڵەچیرۆکی "سیازەندووق"دا بڵاوکراوەتەوە.
- ئەو بەشەی دوو منداڵەکەی "کووچەی کەرمەشان"، "تووبا" بەڕێ دەکەن، لەگەڵ بەشێکی "هەڵماتی شین" هاوچەشنییەکیان هەیە. بەڵام کەسایەتییەکانی دیکە، جیاوازن.
- "تووبا" لە ژیانی تۆدا چ شوێنێکی هەیە؟
- ساڵیانی ساڵە دەیبینم. ئەم ژنە لە "کۆڵانی کەرمەشان"ی ساڵی ١٩٨١دا دەبینین و پاشان لە "هەڵماتی شین"ی ١٩٨٥دا دێتەوە. "تووبا" هێشتا لە زەینمدا ماوەتەوە. لەوانەیە لە چیرۆکێکی دیکەیشدا دەر بکەوێ. من هێشتا کۆڵانێکی تەنگەبەر دەبینم، کە ژنێکی ڕەشپۆش و باریکەڵانەی تێدا ڕاوەستاوە. ئەو ژنە تووبا بوو، ئەویش ژنێکی دیکەیە بە ناوی "گوڵەفرووز" و لە "دڵهەڵاتوودا" دەرکەوتووەتەوە. گوڵەفروز دەتوانێ خەڵکی دڵ بێ، هەرچەند لە چیرۆکەکەدا، نە بیانوویەکی بەدەستەوە دەبینی و نە کەرەسەیەکی بڕندە.
- من حەزێکی تایبەتیم لە "سەحەر"ە. لە چیرۆکی "چەتر و بارانی" و لەنێو پاسەکەدا، کە سەری لەسەر شانی وەگێڕ دادەنێ، بێپەنایی و تەنیاییەکەی چاك هەست دەکرێ. زۆرم حەز دەکرد بزانم سەحەر کێیە؟ "سین" لە چیرۆکی "دیدارخانە"دا کێیە؟ بێگومان سەحەر نییە، چونکە سەحەر لە شۆڕشدا مرد! حەز دەکەم بزانم ئەم کەسایەتییانە لە کوێوە هاتوون؟
- سەحەر، هەرچەند لە "چەتر و بارانی"دا دەمرێ، بەڵام دوور نییە سەرلەنوێ زیندوو ببێتەوە. بەڵام دڵنیابە "سین" سەحەر نییە. "سین" بەس کچێکە لە دیدارخانەدا. باشترین ناوێك، کە دەمتوانی



بۆی هەڵبژێرم و بیرخەرەوەی هیچ ناوێکی دیکە نەبێ، هەمان "سین"ـە.

- ژنێکی ئایدیاڵە، یان ئاسمانییە؟

- ئایدیال نازانم چییە. ئەگەر مەبەستت دەگمەن بێت، کە زۆریش دووپات بووەتەوە، دەبێ بڵێم نەخێر. لە "ئاسمانیی"ش هیچ نازانم. هەر نامەوێ بزانم.

- گوایە "دیدارخانە" جۆرە ئامرازێکە بۆ یادەوەری؟

- بەڵێ. لە چیرۆکەکەیشدا باسم کردووە. جۆرێك کایەی نسێ بوو، کە خۆمان دروستمان دەکرد و ئەمڕۆ ئیدی ناتوانین ئەو مرۆڤانە لە نێو بۆڕیدا ببینین.

- بۆچی "کەرمەشان" و "مەشهەد" و "ڕیگستان" و "بوناریس"ت تێکڕا لە دیدارخانە"دا تێکەڵ کردوون؟

- لە خەیاڵیشدا، شوێنەکان وەك وێنە و مرۆڤەکان هاوتەریبییەکیان هەیە. هەر وەك چۆن لە مۆتەکەدا مرۆڤەکان تێکەڵی یەکتر دەبن و دەردەکەونەوە. من نازانم بۆچی وای لێ دێ.

- دەتەوێ چی بڵێی؟

- هیچ! نامەوێ هیچ بڵێم.

- ژنێك لە "مەشهەد"ە، ژنێکیش لە بوناریس. کوڕێژگەیەك کە ئێستا گەورە بووە، سەرەتای دیدارخانە بە بیر خۆی دێنێتەوە. لە منداڵێتیدا جارێك "سین"ی لە بۆڕییەکدا بۆ خۆی وێنا کردووە و لە دەرەوەی بۆڕییەکەیش بیرەوەرییەکی لە کەسانی دیکە و لەمەڕ ئەوەوە بیستووە. "حوسێن سیمرخ"ێکیش هەیە کە حەزی لە "سین"ـە. بە لە تەك یەکدی دانانی ئەم هەموو لەتە بەربڵاوانە، بە تەمای چی بڵێی؟

- دەمەوێ بڵێم کۆمەڵە لەتێکی بەربڵاون لە زەینی وەگێڕی چیرۆکەکەدا.

- واتە زۆربوون و یەکگرتنەوە؟

- بە خوا من سەر لەم شتانە دەر ناکەم. جیهان لە



زەینی مرۆی چیرۆکەکەمدا تێکەڵوپێکەڵن. دیوتە کە تەپۆڵکە پشقلێك دەسووتێ، چی دەقەومێ؟ هاوکایە و کەسە ئاشنا و نائاشناکانت لە پشت ئەو دوکەڵ و بۆنە ناخۆشەدا، بینین؟ دەبینی شتایەك قەوماوە. مرۆڤەکان لە نێویدا دێن و دەچن و دەخەون.

- ئەم شاری "شیلگستان"ـە کە لە چیرۆکی "دوو هەویردە"دا ئاماژەت پێی کردووە، کوێیە؟

- ڕێك ئێرەیە. هەر شوێنێك کە مرۆڤێك زەندەقی لە بینینی سیمای مرۆڤێکی دی بچێت.

- تۆ ڕەشبین نیت؟

- دەتەوێ گەشبینبم؟ کەسێکم بیر کەوتەوە. جارێکیان یەکێك لەم چەنەبازانە لێی هەڵپێچابووم کە: بۆ چیرۆك نانووسی؟ مەبەستت لە نەنووسین چییە؟ وەك ئەوەی لە مردوویەك بپرسن: بۆچی مردوویت و ئیدی بەسەر زەویدا ناخولێیەوە؟

- "ڕیگستان" کوێیە؟

- وڵاتێکی خۆسازە لە باشووری ئێراندا.

- جگە لە بوناریس، کەرمەشان، مەشهەد و ڕیگستان و "سین"، پشکێکیش بۆ "جاك ستیڤارت" تەرخان کراوە. ئەم کەسە مرۆڤێکی ڕاستینەیە؟

- سیوحەوت یان هەشت ساڵ بەر لە ئێستا، لە ڕادیۆی "ئاندێریا"وە بیستم کە "جاك ستیڤارت" شوفێری نەترسی ئەمریکی، گیانی خۆی لە دەست دا.

- چ پێوەندییەکی بە کەسایەتییەکانی چیرۆکەکەوە هەیە؟

- من، محەمەدڕەزا سەفدەری، چ پێوەندییەکم بەم جیهانەوە هەیە. بەڵام هەرچۆنێك بێت، هەم. هەم. وەکو شارێکی سوتاو و وێران لە شەڕدا: کوتەئاسنێك، تاکەپێڵاوێك، قۆچی گایەك و پانتۆڵێکی جینی پرتووکاو لەژێر خۆرەتاودا، کە لە ئەژنۆ بەرەو خوار لە خاك



ڕۆچووە و مەمکەمژەیەك و گەلێك شتی دیکە و ئاسمانێك لە بان سەر و ڕابردوویەکی بەردەوام، کە سوڵتانی زەمەنە. ئەگەر ڕابردووی بەردەوام نەبا، هیچکەس نەیدەتوانی هیچێك بنووسێ. نازانم لەم ڕابردووی بەردەوامەدا چی هەیە، کە هەمووان بە دوای خۆیدا کێش دەکا.

- جگە لە زەینی خۆتان و کەسایەتییەکانی چیرۆکەکانت، دەبێ بڵێم: وەڵامەکانیشت گەلێك چەتوون و دژوارن. لە کۆتاییدا هەر نەتگوت ئەم "جاك ستیڤارت"ـە کێیە؟

- شوفێرێکی نەترسی ئەمریکییە و لەمەیش زیاترم لە ڕادیۆ نەبیست.

- چۆن هاتە نێو چیرۆکەکەتەوە؟ چ مەبەستێکت هەبوو؟

- مردنەکەی هاوکاتە لەگەڵ بەشێکی ژیانی وەگێڕی چیرۆکەکە. ئەوێ کە وەگێڕەکە، ئۆتۆمۆبیلە سوورەکەی برادەرەکەی دەدزێ و دەستبەجێ ونی دەکا. ڕێك نازانم، ساڵانێکی زۆرە لە بیری جاك ستیڤارت دام. ئەگەر بۆم لوابا، دەچووم و لە بارەی ئەم کەسەوە لە بنەماڵەکەیانم دەپرسی. بەلامەوە زۆر سەرنجڕاکیشە بزانم منداڵێتییەکەی چۆن بووە.

- باری گشتیی ئەدەبیاتی ئەمڕۆ چۆن هەڵدەسەنگێنی؟

- نە ئەهلی ئەم کارەم و نە تاقەتی ئەم کارانەم هەیە.

- دیارە ناتەوێ باسی گرفتەکانی نووسەریش بکەی؟

- نا، چونکە نووسەر هیچ گرفتێکی نییە!

- پێوەندیی نووسەر و خاوەنی دەزگای بڵاوکردنەوە چۆنە؟

- باشترە هەر باسی نەکەین، چونکە هەموو کەس دەزانێ چۆنە؛ تەنانەت تۆیش. بەس دەمەوێ شتێك بڵێم. کۆمەڵەچیرۆکی "هەڵماتی شین" بە زیاتر لە هەشتا- نەوەد هەڵەی چاپییەوە بڵاو کراوەتەوە. چونکە خاوەن دەزگا، کتێبەکەی



بۆ پێداچوونەوە دابووە دەست برادەرێك، نەك من. سەرەنجامیش بەم چەشنە چاپ كراوە. لەم نێوانەیشدا، نە دەكرێ قسەیەك بكرێ و نە كەسێك خۆی بە خەتابار دەزانێ.

* ڕۆژنامەی "بح امروز" تاران ١٩٩٩/٧/٦

بەرهەمە بڵاوكراوەكانی محەمەدڕەزا سەفدەری:

١- سیازەندووق- ١٩٨٩

٢- هەڵماتی شین- ١٩٩٨

٣- چل كەزی- ٢٠٠٢

٤- من بەور نیم، تێكئاڵاو بە باڵای خۆمدا؛ مێوم- ٢٠٠٢



چیرۆك:

# سیازەندووق

چەند ڕۆژی دی، مەیتی هەڵمساوی باوکت سەرئاو دەکەوێ و ماڵبەکۆڵی دەست پێ دەکا. «ئەلسینۆ»ی مامت دەچێتە ئابادان و ئیشێك لە شەریکەی نەوت پەیدا دەکا. تۆ و دایکیشت لەگەڵ خۆی دەبا. تۆ تازە پێت گرتووە و دایکیشت، شەوانە پاقلە دەکوڵێنێ و بەیانیان لە بازاڕ دەیفرۆشێ. ئەگەر لە بیرت نەچێ، نیگای دڕی شاگرد شوفێرەکان دەبینی، کە چۆن لە بەرۆکی دایکتەوە شۆڕ دەبنەوە. یان کە دەیانەوێ قرانێکی بدەنێ، دەستی دەگوشن و بە سرتە شتێکی پێ دەڵێن و دایکیشت ناچار، پێش چایخانەکە بە جێ دێڵێ و دەچێتە شوێنێکی دی. بەڵام کوێ؟ ڕوو لە هەر لایەك بکا، کەلاك خۆرەکان هەڵترووشکاون. ڕۆژ ڕۆژی چەقۆ و بۆکسئاسنە. ڕۆژگاری لاتولووت و هەرزەکار و فڕەنگییە بەدمەستەکانە.

لە باشووردا فڕەنگییەکان پاڵیان داوەتەوە و هەر کە دەعباکەیان ڕەپ بێ، دەکەونە سەر ژنەکان و هەڵدەکوتنە سەر ماڵی خەڵك و چییەکیان پێ خۆش بێ، دەیکەن. شار بێ ساحێبە و کەس بە کەس نییە. چەند فڕەنگییەکی بیچم حیز، مرخیان لە دایکت خۆش کردووە. چەند جارێکیش دێنە بەر دەرکە و بە مامت دەڵێن ژنێکیان دەوێ چێشتیان بۆ لێ بنێ. خۆیان نایڵێن، قولەفندەیەك وەپێش خۆیان دەدەن، تا لەگەڵ ئەلسینۆ بدوێ. کە مامت دەڵێ نا، ملی ڕێ دەگرن و دەڕۆن.

ئەمیانیش تێدەپەڕێ و دوای چەند شەوێك، فڕەنگییەکان هەر لە ناکاو هەڵدەکوتنە سەر کەپرەکان. چوار کەسن و هەر چواریشیان سەرخۆش. هەوا شێدارە و زەوی لە ژێر گەرمادا هەڵمساوە. بیابانیش، تا چاو بڕ دەکا هەر کەپرە و

خانووچکەی بە تەنەکە و مقەبا هەڵچنراو. هیچ دەنگێك نییە. خەڵك، کپ و ماندوو، لە پشت کەپرەکان دانیشتوون و خۆیان باوەشێن دەکەن. مامت سەرەتاتکێیەك دەکا و لە تاریکی دەڕوانێ. دەبینێ فرەنگییەکان لە پێش کەپرێك ڕادەوەستن. دەڵێی دەزانن کەپرەکە چۆڵە، چونکە بۆڵەیەك بە زمانی خۆیان دەکەن. پاشان دێنە پشت کەپرەکەتان. تا دایکت دێ و خۆی لە دەستیان ڕاپسکێنێ، گاپەفرەنگییەك، دەست هەڵدەبڕێ و مەچەکی دایکت دەگرێ و بای دەدا. ئەلسێنۆ دێتە پێشەوە تا دایکت لە دەستیان قوتار بکا، گاپەفرەنگییەکە، لاقی دەخاتە پشت لاقی ئەلسینۆ و هەردووکیان بەر دەبنەوە.

«بێناموس، بەری دە!»

ئەلسینۆ لە فڵچی فرەنگییەکە ڕادەکێشێ. ژن و پیاو لە پشت کەپرەکان هەڵدەستنە سەر پێ، بەڵام کەس ناوێرێ بەر سینگیان بگرێ. فرەنگییەکان چەقۆ دەکێشن و مامت دەدەنە بەر مست و شەق. تۆ لە سووچێك کەوتووی و دەزیقێنی. دەبینی پیاوێکی ڕان ئەستوور دایکتی بە کەپرەکەوە نووساندووە. دایکت، دەست و لاق دەوەشێنێ. سێ کەسەکەی دی، ئەلسێنۆیان خستۆتە سەر ئەرز و لە پڕێکدا ناخودا و خاڵەمین و ئاکۆڕەشە، بەرچیغ بەدەست دەگەنە سەریان.

«گەوادینە، غەریبتان کەوتۆتە بەر دەست؟»

«بۆ ئێمە پیاو نیین؟ هەیدێ هەیدێ!»



پیاو، کە دێن و بەرچیغ هەڵدێنن، گاپەی فرەنگی، کە دوولینگانەی کورتی لەبەرە و ڕانە سوورەکانی بە دەرەوەن، دەمانچەکەی هەڵدەکێشێ و چەند فیشەکێك بە هەواوە دەنێ. ژن دەقیژێنن، هەلهەلە لێ دەدەن، گاپەفرەنگییەکەیش جنێو دەدا و تەقەیەکی تر دەکا. ئەمجارەیان هەر بە ڕاست نیشانە لە پیاوەکان دەگرێ.

ژن و پیاو غار

دەدەنە لای کەپرەکان. ئەلسێنۆ لەم بگرەوبەردەیەدا، خۆی لە بن دەست و لاقیان قوتار دەکا و دەردەپەڕێ. هەر چواریان دەگەڕێنەوە، تا دایکت لەگەڵ خۆیان ببەن. پێیان وایە ئەلسێنۆ ڕۆیشتووە. لە ڕۆیشتن و نەڕۆیشتن دان، کە ئەلسینۆ دەگەڕێتەوە و ئاگردانی پر لە پشکۆ هەڵدەگرێ و بە پشت و ملیاندا هەڵدەڕێژێ. تۆیش دوور نییە هاواریانت بیستبێ. چونکە ئاکۆڕەشە، ڕێك لەو کاتەدا، بەرچیغەکەی با دەدا و پڕی زگیان پێلەقە و بەرچیغ دەکا.

هەوا گەرمە و ژن و پیاو لە پشت کەپرەکان ڕاوەستاون. قەلیانێك بۆ مامت دێنن. ژنێکیش ئاو بە دموچاوی دایکتدا دەکا. ئاکۆڕەشە هەناسەبڕکێیەتی و تۆ بێدەنگی. کەس ورتە ناکا. هەموویان کپ و بێ زمانن.

خاڵەمین، دەنگی دەلەرزێ:

«بارکە و لێرە بڕۆ! هەر ئەمشەو بڕۆ و لێرە مەمێنەوە.»

ئەلسینۆ دەڵێ: «بچمە کوێ خاڵۆ؟ ئیشم، کارم، ژیانم هەمووی لێرەیە.»

خاڵەمین دیسان دەڵێ: «پێم وایە دیسان دێنەوە.»

ترس لە چاویاندا دەبریسکێتەوە.

«ئاخر بۆ ئێمەیش باش نییە. بە خۆت نەتبینی تەقەیان کرد؟ ئێمەیش دەستمان بەتاڵە.»

«ڕاست دەکا، بڕۆ. ئەمانە هەروا سووك و سانا دەست هەڵناگرن.»

ترسیان کاتێك زۆرتر دەبێ، کە پاسەوانەکان دەگەنە سەریان:

«ئەو چوار کەسە لێرە بوون؟»

خاڵەمین دەڵێ: «ئەرێ وەڵڵا. باشە ئێوە لێرەن و ئەوانیش لە ڕۆژی ڕووندا،



هەڵدەکوتنە سەر ماڵ و حاڵی خەڵك!»
پاسەوانی دووهەم کە ڕەشتاڵەیەکە و سمێڵی هەیە، دەڵێ:
«قەڵەوەکەیان وەزعی خراپە، بردیانە نەخۆشخانە. سەروسینگی خراپ سووتاون. تا گەیشتە نەخۆشخانە هەر ناڵەناڵی بوو.»
کە پاسەوانە سمێڵ زلەکە قسە دەکا، ناخودا کەمێك دێتەوە سەرخۆ و دەزانێ ئەمیان خەڵکی ناوچەی خۆیانە. لە دوورەوە دیارە، کە زۆر سەختی ناگرێ. بەڵام دەنگی پاسەوانەکەی دی، کە درێژۆکەیەکی سپیلکەیە، مرۆ دەترسێنێ: «سەرئێشەمان بۆ دروست مەکەن. ئاخر ئەمشەو ئێمە پاسەوانی ئەم گەڕەکەین... دەی، نەتانگوت؟ کاری کێیە؟»
ژن هەڵدەستن و پیاو، بێ ئەوەی تەماشای یەکدی بکەن، سەر دادەخەن. تۆ لە باوەشی دایکتدا شیر دەخۆی، یان دایکت وای نیشان دەدا کە خەریکە شیرت دەداتێ. هێشتا دەستەکانی دایکت دەلەرزن.
دەنگی پاسەوانەکە دیسان بەرز دەبێتەوە: «گوتم کاری کێیە؟»
ئەلسینۆ هەڵدەستێتەوە: «قوربان چەقۆیان کێشا. ئەنگۆش ئەگەر کەسێك دەست بۆ ناموستان...»
«دەی واز بێنە. قسەکانت لە شارەوانی بکە.»
لە شارەوانیشدا، ئەفسەری ئێشکگر، پاش لێپرسینەوە دەڵێ: «چونکە تا ئێستا کەس شکایەتی لێ نەکردووی، جارێ بڕۆ تا سبەینێ.»
بەڵام پاسەوانەکە، حەز دەکا هەر چۆنێك بێت ئەو شەوە ئەلسینۆ ڕاگرێ:
«بەڵام قوربان... من بە چاوی خۆم دیتم...»
«ئاخر بۆ ڕایگرین؟ ئێمە هێشتا نازانین... نا... هەر ئەوەی گوتم: جارێ بڕۆ تا سبەینێ...»
ئەمەیش سبەینێ!
«زۆر زۆر لە



ئیش دەرم دەکەن. بە قەبری باوکیان!»
ئەلسینۆ بە ئاکۆڕەشە دەڵێ.
هەوا شێدارە و هەورەکان لە ئاسماندا چەقیون. کرێکارەکان لە خانووبەرەیەکی گەورەدا خەریکی ئیشی خۆیانن و ئەلسێنۆ لە تەنیشت بەرمیلی قیرەکە ڕاوەستاوە و دەیەوێ بە تەختەی شکاو و کوتەکاغەزەکان، ئاگر بکاتەوە. گەزێك زەوی هەڵدەکەنێ. پاشان ئەو و پیاوێکی دی، بەرمیلەکە ڕادەکێشنە سەر چاڵەکە و ئەلسینۆ شقارتەکە لێ دەدا:
«قیرەکە ئامادەیە؟... ئەدی کەنگێ حازر دەبێ؟»
دەنگی وەستایە، کە لە دەرکەی ژووری موهەندیسەکانەوە دێتە دەرێ و دوای ئەویش دەنگی ئەلسینۆ:
«سەعاتێکی دی. تا گوونییەکان بێنن، قیرەکە شل بۆتەوە.»
«دەی باشە، زووکە!»
ئەلسینۆ، نەوت ڕۆ دەکاتە سەر تەختەشکاوەکان. سەعاتێکی دی، گوونییەکانیش دەگەن. دەبێ قیر و گوونی بکەن. دەبێ خانوو بۆ فرەنگییەکان دروست بکەن. خانووی زۆریان دروست کردووە، بەڵام هێشتا کەمە. فرەنگییە سوور و سپییەکان، وەك کوڵلەی میسری بەسەر باشووریان داداوە. هەر کەشتییەك لەنگەر دەگرێ، یان فڕۆکەیەك دەنیشێتەوە، دەبینی خەریکن دادەبەزن، دوو بە دوو، مێگەل بە مێگەل، بە ژن و منداڵەوە. هەموویشیان باڵابەرزن و سوورکەڵە.
کە چاك لێیان دەڕوانی، لە قەلەموونێك دەچن پەڕوباڵەکانی هەڵوەریبن.
کامیرایان پێیە و وێنەی منداڵە
پێخاوس و ڕەشتاڵەکان
دەگرن و بە ورتە
شتێك



دەڵێن و پێدەکەنن. ئێستایش ئەلسینۆ خەریکە بۆ خانووەکانیان، قیر دەکوڵێنێ.
خانووەکان کارێکی ئەوتۆیان نەماوە و گەیشتوونەتە میچ، بەس قیر و گوونی و سپیکارییان ماوە.
لەو بیابانەدا، تا چاو بڕ دەکا بەس خانووی ناتەواوە و کیسەی چیمەنتۆ، کە لەسەر یەك هەڵچنراون.
کرێکارەکانیش خەریکی داگرتنی کیسەچیمەنتۆکانن. قرچەی گەرمایە و هەورەکان لە جووڵە کەوتوون. تەنانەت نەرمەبایەکیش نایێ. پیاو دێن و شان دەخەنە بن کیسەکان و دەیانبەنە پشت خانووبەرەکان.
«ئەلسینۆ، چاك دەرچووی ها!»
خاڵەمین، لە ئارەقەدا شین و مۆر هەڵگەڕاوە و تێدەپەڕێ. ئەلسینۆ تەماشای دەکا و دیسان تەختەشکاوەکان هەڵدەداتە نێو چاڵەکەوە. ئاگرەکە خۆش دەبێ. بەڵام هێشتا هێندە هار نەبووە، کە بەرمیلی پڕاوپڕ لە قیر بکوڵێنێ. وەستایش پەلەپەلیەتی، چونکە موهەندیسە فڕەنگییەکە، لە بەیانییەوە سەدجاری بەسەردا گوڕاندووە. پرێمز لە کار کەوتوون و ئەلسینۆ سەری چەند بەرمیلی هەڵداونەتەوە و چەند چاڵێکیشی هەڵکەندوون.
«هاتن!»
ئەلسێنۆ لە تەنیشت بەرمیلەکان هەڵدەستێ و ملی بەرەو ماشێنێکی پانوپۆڕ هەڵدێنێ، کە لە پشت کیسەچیمەنتۆکان ڕاگیراوە. دەبینێ: سێ فڕەنگی لە ئۆتۆمبێلەکە دادەبەزن و دەچنە نێو ژووری موهەندیسەکان.
خاڵەمین دەڵێی ترساوە. هێدی هێدی خۆی دەگەیەنێتە پشت بەرمیلەکان. دەنگی دەلەرزێ: «برۆ! ئێرە ئیدی جێی تۆ نییە. چاو! ئەو خوێڕییە ناحەزە پێیانی گوتووە لە کوێی.»
«کێ؟»
« پاسەوانە



لۆقنەکەی دوێنێ شەوێ. وابزانم شتێکیان داوەتێ.»
ئەلسینۆ سەری لێ شێواوە و نازانێ چی بکا. بڕوا، یا نەڕوا؟ دوور نییە بیگرن و لە زینداندا بەندی بکەن. ئەگەر وا بکەن، براژن و منداڵەکەی چییان لێ بەسەر دێ؟ نا. دەبێ ڕاوەستێ.
بە خاڵەمین دەڵێ: «چیم لێ دەکەن؟ خۆ کەسم نەکوشتووە. من دەبێ شکایەت بکەم. ئەوان هاتوونە سەر ماڵ و حاڵم... ئەوان دەیانویست دەست بۆ نامووسم درێژ بکەن.»
پرێمز پێکراون و بەرمیلەکان قوڵتەقوڵتیانە. ئەلسینۆ دارێکی درێژ لە قیری کوڵاودا دەگێڕێ و وا نیشان دەدا خەریکی کاری خۆیەتی. بەڵام لە ژێرەوە ئاگای لە ژووری موهەندیسەکانە. دەبینێ خەریکن بیرە دەخۆنەوە و قسە دەکەن و پاسەوانە لۆقنەکەیش لە بەر دەرکە پیاسە دەکا.
«هێشتا لێرەی؟»
ئاکۆڕەشە لە شانی دەدا و سەتڵە بەتاڵەکان دەخاتە بەر پێی.
«ئەگەر هەڵێم، خراپتر دەبێ. دەترسێم شتێکم بۆ هەڵببەستن.»
«دەڵێن فرەنگییەکە، سەروسینگی سووتاون و لە نەخۆشخانە کەوتووە.»
«نا، بابە، ئەوەندەیش نییە. بە خۆم دیتم: بەس ملی برێك سووتا.»
ئاکۆڕەشە، سەتڵە قیرەکان هەڵدەگرێ و دەڕوا. لاقی ڕاستی دەشەلێ. سەردەمایەك لە کەشتیدا، کاری کردووە و لاقیشی هەر لەوێ بە زایە داوە.
ئەلسینۆ ئاگای لە جیق و فیقی ئاکۆڕەشەیە. دەزانێ ئاکۆڕەشە هیچ کەسوکارێکی نییە و تەنانەت نازانێ دایك و باوك، گەڵای چ درەختێکن. لە ژێر دارخورما و پشت کەپرەکان، پێی گرتووە. بەس خۆیەتی و گونی و چەقۆیەك. ڕۆژگار بە گونیەتی و گونیشی بە ڕۆژگار.
ڕۆژانە کرێکاری دەکا
و ئێواران ئارەق
دەخواتەوە



و نیوەشەوانیش نەرم نەرم و لەبەر خۆیەوە، "فایز"(٢) دەڵێ تا دەگاتە لای کەپرەکان. ماڵی لەوێیە. هەمیشەیش بە یادی کچێکی ڕەنگپەڕیو، کە ساڵانی زوو، لە چوارچێوەی پەنجەرەیەکدا دیویەتی، گۆرانی "شەرقی"(٣) دەڵێ. کە مەستیش دەبێ و چاو لێك دەنێ، چەند دارخورمایەك دەبینێ و جۆگەلەیەك و کۆڵانێك و...

ئاکۆڕەشە، خۆی ئەمانەی گێڕاونەتەوە.

کە جارێکی دی دێت و سەتڵەکان پڕ دەکا، چەقۆکەی لە گیرفانی شەرواڵەکەی دەردێنێ و دەمە سپییەکەی بە پانتایی دەستیدا دەخشێنێ: «هەر دەستت بۆ ببەن، بەم چەقۆیە سەریان دەخەمە ئەو کونەوە کە لێی هاتوونە دەرێ...»

«خەریکە دەقەومێ، ها؟»

«بە قەبری دایکیان! وابزانم خەریکن گۆبەنێکت بۆ دەنێنەوە.»

ئاکۆڕەشە دەڵێ و تێدەپەڕێ. تا دەگەڕێتەوە، ئەلسینۆ دەڕوا و لەبەر سێبەری دیوارەکە، دادەنیشێ. تۆز بەری ئاسمانی گرتووە و کپ و مت لەوسەرەوە قورسایی دەکا. "ناخودا"(١) سەتڵە قیرەکان بە گوریس هەڵدەکێشێ و خاڵەمینیش گوونییەکان دەدرێنێ. گۆڕەپانی بەر خانووبەرەکە، چۆڵە و هیچ دەنگێك نییە، جگە لە تڕەتڕی مەکینەی چیمەنتۆ.

پاشان:

«ئەلسینۆ لە کوێیە؟»

هەمان پاسەوانە لۆقنەکەیە، کە بانگی ئەلسینۆ دەکا و بە ترسەوە لە پشت گوونییەکان دەڕوانێ و لەودیو بەرمیلەکانەوە خۆی دەگەیەنێتە ژووری کرێکارەکان و لەوێشەوە بەرەو ژووری موهەندیسەکان دەڕوا. ملحیزانە لە بەر دەرکە ڕادەوەستێ و دەڵێ:

«ئێوە هیچ



مشەوەش نەبوو. من بۆتان پەیدا کرد.»
خاڵەمین، کە ئەلسینۆی دیوە، دەڵێ:
«هەی گوو بە گۆڕی ئەو باوکە حیزەی قەت نەتبووە. کوێراییت داهاتووە؟»
پاسەوان گوێی گرانە. ئەلسینۆ لە پشت دیوار هاتۆتە دەرێ و بە دەنگی پاسەوان لە پەنا بەرمیلەکان ڕادەوەستێ.
«ئەوە لە کوێی؟ خەریکم کون بە کون بە دواتدا دەگەڕێم.»
«هەر لێرەم. بێم؟»
«نا، لەوێ بە، تا بانگت دەکەم.»
ئەلسینۆ سەتڵۆکەیەك قیری لە دەستە و دەیەوێ قیر لە بەرمیلەکەوە هەڵکێشێ و بە دیتنی فڕەنگییەکان، کە لە ژوورەکە دێنە دەرێ، دەکشێتە دواوە. ئاکۆ ڕەشەیش بەر لەوەی فڕەنگییەکان بگەنە گۆڕەپانەکە، هەنگاوی خاو دەکاتەوە و هەر لەوێ و لە پێش خانووبەرەکە ڕادەوەستێ.
چاوێکی لە ئەلسینۆیە و چاوەکەی دیکەی لە خاڵەمین و ناخودایە. کەس دەنگ ناکا. چوار زرتە بۆزەکەیش، دەستبەکار دەبن. یەکیان گوریسێك لە ماشێنەکە دەردێنێ و سێیەکەی دی، دەست و پێی ئەلسینۆ دەگرن و ڕایدەکێشنە لای بەرمیلەکان، کە لەسەر ئاگرەکەن و قوڵتەقوڵتیانە. دەستوپێی ئەلسینۆ دەبەستنەوە و سەری گوریسەکەیش چەندجارێك بە دەوری بەرمیلەکەدا دەپێچنەوە.
ئەلسینۆ، گەزێك لە بڵێسەی ئاگر و بەرمیلەکان دوورە و حەپەساو لە ئاکۆ ڕەشە دەڕوانێ. هەردوو دەستیان لە پشتەوە بەستۆتەوە. هەر کە دەیەوێ بیانجووڵێنێ، دەنگی پاسەوان بەرز دەبێتەوە:
«هەر بجووڵێیتەوە قیری
کوڵاوت بە سەردا
دەڕژێ.»



«قەحبەدایکینە!»
ئاکۆ ڕەشە دەڵێ و خۆی دەگەیەنێتە فڕەنگییەکان. ئاکۆ ڕەش ڕەشە. چاوی زەق زەقن و باسکە ئەستوورەکانی لە کراسەکەیەوە دەرپەڕیون:
«ئێوە بۆچی ئەم کارە کرد؟»
«ون بە، دەی!»
فڕەنگییە چاویلکە لە چاوەکە دەڵێ و دەستی لە هەوادا بادەدا.
دیسان دەنگی پاسەوان دێ:
«قالبت دەخورێ، ها؟ دە لاچۆ دەی، نابینی چەند قەڵس و تووڕەیە؟»
«بە لاگونی چەپم، کە قەڵس و تووڕەیە. من دەچم دەیکەمەوە.»
ئاکۆڕەشە دەلەرزێ و چەقۆکەی لە گیرفانی پشتەوەی شەرواڵەکەی دەردێنی و شرق، دەنگی کردنەوەی چەقۆ دێتە بەر گوێ.
«کوڕی باش، بگەڕێوە سەر ئیشەکەی خۆت!»
وەستا دەڵێ و موهەندیسی ئێرانی و موهەندیسە فڕەنگییەکە لە ڕاڕەوەکەی پێش خانووبەرەکەدا، ڕاوەستاون.
بەرمیلە پڕ لە قیرەکان، پشت و کەلەکەی ئەلسینۆ گەرم و گەرمتر دەکەنەوە. شێی هەوا و گەرمای بەرمیلەکان، ئارەقەی مەرگیان خستۆتە سەر تەوێڵی ئەلسینۆ. ئەم پێ و ئەو پێ دەکا. موهەندیسی ئێرانی بە ئاکۆ ڕەشە دەڵێ: «چی قەوماوە، ها؟»
«هیچ، دەتەوێ چی بقەومێ؟ ئەوە نییە بە چاوی خۆت دەبینی؟»
پاسەوانە لۆقنەکە ئارەقەی سەروسینگی بە دەسرەیەکی چڵکنی



سپییەوە دەسڕێ و خۆی تێهەڵدەقورتێنێ: «دوێنێ شەو شەڕیان کردووە. پیاوەکەی لای بەرمیلەکان، یەکێکیانی یەکیانی بریندار کردووە.»
پاشان، بە هێمایەك لە فرەنگییە چاویلکە لە چاوەکە دەگەیەنێ کە لایەنگری ئەوانە و خۆی دەگەیەنێتە بەر سێبەری دیوارەکە و دەڵێ: «فرەنگییەکە وەزعی زۆر شڕە، زەحمەتە بمێنێ.»
«درۆ دەکا، بەس ملی سووتاوە.»
ئەلسینۆ، خەریکە بەری پێی دەسووتێ، دەجووڵێتەوە و بەرمیلەکەی ناوەڕاست، لە پشت سەریەوە دەلەرێتەوە.
ئاکۆ ڕەشە، بە شەلەشەل و دەست لە کەمەر، بەرەو بەرمیلەکان دەڕوا، کە دیسان پاسەوان دەنگی نێر دەکاتەوە: «بیکەیەوە، بە هەرچواریان هەر چواریان پشتت دەشکێنن.»
«گوو دەخۆن. ئەگەر پیاون با دەستم لێبدەن.»
خاڵەمین، لە سەربانی خانووبەرەکەوە سەرەتاتکێیەك دەکا و میلەیەکی ڕەشی کورت لە دەست دەگرێ.
«حای حای! وەڵڵا کارمان تەواوە. دوو فرەنگیی خوێڕی، خەریکن لێمان ببنە چەتە.»
ئەمەش ناخودایە و خۆی لە پلیکانەکانەوە هەڵدەداتە خوارێ و دەنگی ئاکۆڕەشە بەرز دەبێتەوە: «هەرکەس بێتە پێشەوە، زگی هەڵدەدڕم.»
فرەنگییە ناحەزە چاویلکە لە چاوەکە بە زمانی خۆیان جنێو دەدا و دەنەڕێنێ.
ئاکۆ ڕەشە ڕاناوەستێ و تەقڵەکوت خۆی دەگەیەنێتە ئەلسینۆ و بە چەقۆ گوریسەکە دەبڕێتەوە. دەیەوێ دەستەکانیشی بکاتەوە، کە فرەنگییە چاویلکە
لە چاوەکە پێلەقەیەك لە نێوگەڵی
دەدا و ئاکۆ سەراوقوون
دەبێ. پاسەوانە
لۆ قنە کە



و موهەندیسە ئێرانییەکەیش پێشیان بە ناخودا و خاڵەمین گرتووە. خاڵەمین لە ژێر دەستیان دەردەپەڕێ و میلەکەی لە ملی یەکێك لە فڕەنگییەکان دەخەوێنێ.

«چما تالآنە؟ شەهیدی کەربەلاتان کەوتۆتە بەر دەست؟»

کابرای فڕەنگی، کە میلەکەی خاڵەمین بەری پێی ڕەش هەڵگەڕاندووە، ڕادەکاتە ژوورەکەی خۆیان و دووەکەی دی، ئاکۆڕەشەیان بە دیوارەوە نووساندووە. ئەوی دیکەیان گوریسەکەی خستۆتە ملی ئەلسینۆ و ڕایدەکیشێ. ئەلسینۆ هەردوو چاوی دەرپەڕیون و سپی سپی دەچنەوە.

تا ئەلسینۆ خۆی لە دەستیان ڕاپسکێنێ و تا کرێکارەکان لە خانووبەرەکەوە بڕژێنە نێو گۆڕەپان، ئاکۆڕەشە سینگ و باسکی کابرای چاویلکەلەچاو. سوور دەکا و ڕادەکا، تا ئەلسینۆ لە دەست ئەوی دیکەیان دەربێنێ، کە دەنگی گوللە بەرز دەبێتەوە. موهەندیسە ئێرانییەکە و پاسەوانە لۆقنەکە، خۆیان لە پشت دیوار دەشارنەوە. دیسان تەقەیەکی دی و هاتوهاواری کرێکارەکان و دەنگی ئاکۆ ڕەشە: «ئەلسینۆ، سەرت...»

تا ئەلسینۆ ملی وەرسوڕێنێ، فڕەنگییە چاویلکەلەچاوەکە سەتڵە قیرەکەی پێدا دەکا و هاواری ئەلسینۆ لە ژوور و هەیوان و گۆڕەپاندا، دەنگ دەداتەوە و بە هەردوو دەستی بەستراویەوە دەکەوێتە سەر زەوی و پەلەقاژە دەکا. تاوێکی دی، پێستی سەر و نێوچەوانی ئەلسینۆ بەسەر سینگیدا شۆڕ دەبنەوە. ئەلسینۆ ترساوە. گوللەیەکی شێتە. بە هەموو لایەکدا هەڵدێ. قیری کوڵاو شێتی کردووە. گڕی لە مێشك و سەری بەرداوە. فڕەنگییەکان هەڵاتوون و ئەلسینۆ هەر دەقیژێنێ و لەو ناوەدا لاقەفرتێ دەکا. کەس پێی ڕاناگیرێ. کەس وەك ئەو نییە، گوللەیەکی ئاگرینە. کرێکارەکان تێکڕا هاوار دەکەن: «ئاو!» ئاکۆڕە شەیش لە ناوەڕاستی گۆڕەپانداو دەستبەتاڵ، ڕاوەستاوە.



١. ناخودا: کەشتییەوان.
٢. فایز شاعیرێکی کلاسیك و بەناوبانگی باشووری ئێرانە. زۆربەی خەڵکی ئەو دەڤەرە، شیعرەکانی ئەم شاعیرەیان لەبەرە و بە گۆرانی دەیڵێنەوە.
٣. شەرڤێ مەقامێکە تایبەت بە دەڤەری باشووری ئێران و لە مایەی «دەشتیی»دا.

